

یەعقوب یوسف کوریە

# جولەکانی عیراق



وەرگێرانی :
شەرمین عەبدوڵڵا ڕواندزی

هەولێر ۲۰۱۲




حكومه‌تی هه‌رێمی كوردستان
وه‌زاره‌تی رۆشنبیری و لاوان
به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی گشتی راگه‌یاندن و چاپ و بڵاوكردنه‌وه
به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی چاپ و بڵاوكردنه‌وه‌ی هه‌ولێر

سەرپەرشتیاری گشتی
ماجید نووری

# جولەکەکانی عێراق
# مێژوویان و گوزەرانیان و کۆچکردنیان

نووسینی: یەعقوب یوسف کوریە
وەرگێڕانی لەعەرەبییەوە: شەرمین عەبدوڵڵا رواندزی
بابەت: مێژوو
پیتچنی و هەڵەچنی: وەرگێڕ
نەخشەسازی ناوەڕۆك: شاخەوان جەعفەر
نەخشەسازی بەرگ: ئامانج ئەمین
تیراژ: ٥٠٠ دانە
چاپ: بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی رۆشنبیری- هەولێر
نرخ: ٣٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارە سپاردنی (٨٦٤) ساڵی (٢٠١٣)ی پێدراوە

هەولێر- گەڕەکی راستی/ نزیك گەراجی بەغدا
بڵاوخانەی بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی رۆشنبیری
ژمارەی تەلەفۆن: ٠٦٦٢٥٨٥٤١٣
بەڕێوەبەرایەتی هەولێر
چاپ و بڵاوکردنەوەی

جووله‌كه‌كان بانگه‌شه‌ی ئه‌وه ده‌كه‌ن كه مێژوویه‌كه‌یان بۆ سه‌رده‌می ئیبراهیم خه‌لیل (س.خ) بۆ 400 ساڵ پ.ز. ده‌گه‌ڕێته‌وه، كاتێ ئه‌وان له وڵاتی رافیده‌ین بۆ فه‌له‌ستین كۆچیان كرد ژماره‌یان له‌م كۆچه كۆمه‌ڵییه له 400كه‌س تێنه‌ده‌په‌ڕی، زۆربه‌ی لێكۆڵه‌ران ده‌ركه‌وتنی یه‌كه‌م كۆمه‌ڵه‌ی جووله‌كه له عێراق بۆ كۆتایی ســـه‌ده‌ی شه‌شه‌م، یان سه‌ره‌تای سه‌ده‌ی حه‌وته‌مـــی پ.ز دیاری ده‌كه‌ن، ئه‌م مێژووه هاوچه‌شـــنه له‌گه‌ڵ مێژووی كۆچی، ســـوببی ئاشووری بۆ باكووری عێراق له ده‌وروبه‌ری 626پ.ز له چوارچێوه‌ی سیاســـه‌تی ئیمپراتۆرییه‌تی ئاشووری له په‌رته‌وازه‌كردنی ئه‌و دیلانه‌ی، كه له‌ژێر ده‌ستی ئه‌واندا بوون بۆ چه‌ندین ناوچه‌ی دوور له ئاوایی تاكو توانایان نه‌بێ هاوسۆزیی و گرووپ كاری له‌گه‌ڵ كۆمه‌ڵگایه‌كی دیكه‌دا بكه‌ن بۆ ئه‌وه‌ی نه‌توانن جارێكی دیكه بگه‌ڕێنه‌وه بۆ ئه‌و شوێنه‌ی كه لێی لادرابوون.

هه‌روه‌ها ئاشوورییه‌كان (سبایه‌كانیان) دوورخسته‌وه له جووله‌كه‌كان بۆ ناوچه شاخاوییه‌كان له كوردستانی گه‌وره، واته عێراق، ئێران، توركیا، له ده‌قی ته‌وراتدا ناوی ئه‌و ناوچانه هاتووه كه جووله‌كه‌كانی تێدا دابه‌ش بووه له‌وانه‌ش (صلح) (خابور) (هارا)و (شاری مادلی ئێرانی)، سه‌باره‌ت به‌خاپووریش ناوه‌كه‌ی (ئه‌كه‌دی)یه‌و به‌زاراوه‌ی جووله‌كه‌یی (بكار)ه‌یه. ئه‌ویش رووبارێكه له به‌شه به‌رزه‌كانی وڵاتی (میزوپۆتامیا)دا تێده‌په‌ڕێ و ده‌ڕژێتـــه ناو رووباری فوراته‌وه بۆ جیاكردنه‌وه‌ی له رووبارێكی دیكه‌ی ناوچه‌ی بابل له كتێبی (ته‌وراتدا) (خابوور رووباری جوزان) باسكراوه، بـــه‌ڵام (هارا) یان (حـــاران) بووه، زۆر له لێكۆڵه‌ران بانگه‌شـــه‌ی ئه‌وه ده‌كه‌ن كه شـــاری هه‌مـــه‌دان و ده‌وروبه‌ری له‌وكاته‌دا شـــوێنی هه‌ندێ جووله‌كه دیاریكراوه‌كان بووه.

جووله‌كـــه‌كان توانیان له شـــاخه‌كانی كوردســـتان گوندێكی تایبه‌ت بۆخۆیـــان پێكبێنن تا حاڵیان وه‌كو حاڵی ته‌واوی دانیشـــتووانی كوردی ئـــه‌و ناوچه‌یه بێت، به‌م جۆره له ته‌واوی جووله‌كه فه‌له‌ســـتینییه‌كان و جووله‌كه‌كانـــی دیكه‌ی كه له وڵاته عه‌ره‌بیـــه‌كان بڵاوببوونه‌وه دابڕان و

کاری کشــتوکاڵییان کردە پیشـــەی خۆیان و توانیان مەڕومالات ببەنە دەرەوەو بەخێویان بکەن، بەم شــێوەیە لە بەدەســتهێنانی پارەوپول و پێویستییەکانی خۆیان ســەرکەوتووبوون. ئەو شتەی کە جوولەکەکانی لــە ئەوانی دیکە جیادەکــردەوە پارێزگاریکردن بوو لــە زمانەکەیان کە دیالێکتێکــی (ئارامییە) هەمان دیالێکتەکە حەزرەتی مەســیح (س.خ) قسەی پێدەکرد، کە بە (تەرجوم) دەناسرێت.

ئەمە چەند دێڕێکی کەمە لە ســەرەتاکانی بوونی جوولەکە لە عێراق، کە بۆ ســەدەی هەشــتەمی پێش زایینی دەگەڕێتەوە. زاناکان سەرچاوە سەرەکییەکانی هەبوونی جوولەکەکانیان لە عێراق دووپات کردۆتەوە وێڕای ســەرەتاکان لە کوردستانی ئێران کە پاشماوەکانیان تا ساڵی 1950دا مابــوون، کە لە بنەڕەتــدا بۆ کۆیلەیی بابیلییــەکان دەگەڕێتەوە. دواتر بەتێروتەســەلی باســی لێوە دەکەین تاکو خوێنەر لاپەڕە لوولدراوەکانی مێژووی جوولەکە لە عێراق کۆبکاتەوە.

## جوولەکەکان لە کۆتی دیلێتی بابیلییەکان

رووخانی شاری مووسڵ پایتەختی ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری (دوردت فلول ئاشووری) بۆ ناوچەی حران دەگەڕێتەوە. پاشماوەی ئاشووریی لە ساڵی 610 یان 609پ.ز. لەناوچوو.

دوای ئـــەوە فەرمانڕەوایی کلدانی، بابلی دامـــەزرا کۆیلەیی یەکەم و دووەمی یەهوودی بینیوە، کە لەســـەنتەری شـــاری بابل کۆکرانەوەو لە رۆژی 604/9/23پ.ز (نەبوخزنەســـر) بەپاشای بابل هەڵبژێردرا ئەو ماوەیەش سەردەمێکی جیاوازو بەرچاوە لە مێژووی عێراقی کۆندا.

## شانشینی دەسەلاتداری یەهوداو کۆیلەی بابیلییەکان

کاتێ پادشای (یەهود باکیم) فەرمانڕەوایی فیرعەونی میسری (نیخو) ی دووەم ئەو ســـەرکەوتنانەی (نەبوخز نەســـر)ی لە وڵاتی شـــام بینی ملکەچیبوو و سەرانەی دەدایێ، کەچی بەهاندانی پاشای میسر سەرەڕای ئامۆژگاری (ئارمیا) دوای ماوەیەک پەیمانەکەی شـــکاندو ســـەرانەکەی جێبەجێ نەکرد لە ساڵی 597 نەبوخزنەسر هێرشێکی کتوپڕی کردە سەر (ئورشەلیم)و گەمارۆی دا، ئەوانیش خۆیان بەدەستەوەدا، لەم گەمارۆیەدا پاشا (یەهود باکیم)ی لەناوبردو 3000هەزار جوولەکەش بەدیل گیران و (نەبوخزنەسر)ی لەسەر وڵاتی (صدقیا) جێگیرکرد، پادشای یەهوداش (صدقیا) فەرمانڕەواییەکەی بۆ پادشـــای بابلی جێهێشـــت و چووە پاڵ فیرعەونی میسری، پاشای بابل لێی تووڕەبوو ئەنجامەکەشی بەسەپاندنی ئابلووقە بوو لەســـەر (ئورشەلیم) ئەوکاتە (صدیقا) نەیتوانی درێژە بەم گەمارۆیە بدات و خۆی رزگار بکات، بڕیاری دا خۆی بەدەســـتەوە بدات. بەم شـــێوەیە دوای تێپەڕبوونی بیست مانگ، یان کەمتر (نەبوخزنەسر) چنگی خۆی لەسەر (ئورشەلیم) قایمکرد، (صدیقا) بۆ دەربازبوونی خۆی هەوڵی راکردنی دا، بەلام هەوڵەکەی سەری نەگرت و لە شاری (ئەریحا) دەستگیرکراو خۆی و ئەندامانی خێزانەکەی رەوانەی سەربازگەی سوپای

بابلی کران. پادشـــا بڕیاری دا ئەندامانـــی خێزانەکەی لەبەرچاوی خۆی ســـەرببڕدرێن و دوایی خۆیشـــی بەدەست بەســـتراوەیی لەگەڵ هەموو جوولەکە بەدیلگیراوەکان بۆ بابل بردران، کە ژمارەیان زیاتر لە چل هەزار دیل مەزەندە دەکرا، ئەمەش کۆیلایەتی بابلی دووەم بوو. (ئورشـــەلیم) ی یەکخست، شـــوێنەوارەکانی پەکەری سلێمانی وێرانکرد (سفر الملوک الثانی 25: 7-6 وســـفر الایام الثانی 36، 20-13) جولەکەکان هەر لەشـــاری بابل مانەوە کاتێ فەرمانڕەوایی فارسە ئەخمینییەکان ئەوەبوو هەندێکیان گەڕانەوە فەلەســـتین، خەیاڵی ئەوەیان لە سەردابوو دووبارە پەیکەری ســـلێمان بنیاد بنێنەوە، ئـــەم گەڕاوانەش لە جۆری دەمارگیرو بەپەرۆشـــەکان بوون، بەڵام جۆرەکەی دیکـــە لە دەمارگیرەکان نەبوون، بۆیـــە کۆچیانکرد لەبـــەر نەگونجانیان لەگەڵ خێڵەکانی دیکە لەســـەر هەندێ کاروباری رۆژانەیان جا چ لەبارەی کشـــتوکاڵی، یان پیشەسازی یـــان بازرگانی بێـــت، چونکە هیچ دەســـتکەوتێکی داراییان نەبوو، بۆیە هەستیان بەوە دەکرد کە جوولەکەکان لە ریزی دووەم، یان کەمترن بەم شـــێوەیە بەڵگەیەک بۆ گەڕانەوەیان رێڕەوی رووباری فوراتیان گرتەبەرو کۆچیانکردو لە شاری ئەنباری ئێستا کە دەکەوێتە سەر کەناری رووباری فوراتی چەپ کۆبوونەوە.

## عەرەبە خێڵەکییە تۆبەکارەکان

سەرچاوەی سێیەم بەدوای ســـبی ئاشووری و سبی بابلی بەهەردوو لقییـــەوە لە بوونی جوولەکەی عێراق هاتنە ژوورەوەی کۆمەڵێک خێڵەکی عەرەبـــی تۆبـــەکار بوو، کە لە ســـەردەمی خەلیفە عومـــەر (س.خ) لە دوورگـــەی عەرەبییـــەوە هێنرابوون. ئەوانە لە نەتەوەو قســـەکردنیان و هەموو نەزعەیەکاندا شـــوێنی نیشتەجێیان لە بنەڕەتدا لە ئەعراب بوون. لەگەڵ گەیشـــتنیان بە وڵاتی رافدەین هاوســـۆزیان لەگەڵ دانیشـــتوانی عێراق پەیداکردو شانبەشانی یەکدی کاریان دەکرد لەبواری کشتوکاڵیدا. لەبەرئـــەوەی عەرەبی عێراق پەیوەندییـــان بەعەرەبی دوورگەوە هەبووە

لــە لایەن نەتەوەو خوێنیان، بۆیە بەگەیشــتنیان بۆ ئەو شــوێنە نوێیە دڵنیابــوون و هاوســۆزیان زێت بوو و لە عێــراق جێگیربوون و ناوچەی فراتی ناوەڕاســتیان کردە نیشــتمانی خۆیان و هەندێکی دیکەش بەرەو سووریا ڕۆیشتن، ئەوەش لە سەردەمی حەوتی زایینی بوو.

## بارودۆخی جوولەکەکانی عێراق دوای رووخانی بابل

لە ساڵی 539پ.ز. کورش چووە ناو بابل و ئازادییەکی بەرفراوانی بۆ ئەو جوولەکانەی لەناو بابل بوون دەستەبەرکرد، هەرخۆی سەرکردایەتی ســوپاکەی دەکرد و ئەوانیش پێشــوازییەکی زۆر گەرمیان لێکرد، لەژێر فەرمانڕەوایی فارســدا ســەربەخۆییەکی زۆریان هەبــوو. ئەو ماوەیەش بەبڵاوکردنەوەی بەشێکی زۆر لە ئەدەبی جوولەکەو دامەزراوە ڕۆشنبیرییە گەورەکان ناسرا.

لە سەدەی ســێیەمی زایینی شاری بابل بووە سەنتەری سەرەکی بۆ لێکۆڵینەوەکانــی (تلمود). ئەکادیمی (نهرعــە)و ئەکادیمی (صورا) لە کۆتایی سەدەی ناوبراو دامەزران.

وەک زانراویشــە جوولەکەکانی عێراق دوو زانکــۆی (جوولەکەیان) هەبوو لە کاتی فەتحی یەکەمداو مامۆستاکانی هەردوو زانکۆکان بەکۆمەڵ ڕۆیشتن بۆ چاوپێکەوتنی ئەمیری باوەڕداران (عەلی کوڕی تالیب س.خ) ئەوکاتــەی رووی کردە عێراق بەڵێنی پێــدان ئازادی بیروباوەڕیان هەبێ و رەفتــاری چاکیان لەگەڵ بکرێ، ژمارەیان ئەوکات واتە ســاڵ 655ز 90هەزار کەس دەبوو.

هەر لەگەڵ ســەرهەڵدانی جێنشینی عەباســییەکان تا کۆچی دوایی هاروونە رەشید جوولەکەکانی عێراق زۆر ئاسوودەبوون، بەڵام دوای ئەوە بارودۆخیان جێگیر نەبوو (مەئموون) لەگەڵیان باش و ســانا بوو، بەڵام لە سەردەمی (متەوەکل) بارودۆخیان بەرەو خراپی چوو، چالاکییەکانیان لە هەموو رووبەکەوە بەرەو کزی چوو.

لە ساڵی 1258 لە سەردەمی مەغۆل و تەتەر، لە کاتی هاتنە ناوەوەی هۆلاکۆ بۆ بەغدا جوولەکەکان حاڵیان خراپ بوو، ئەم بارە بەردەوام بوو تاکو لە ساڵی 1284 پزیشکێکی جوولەکە بوو بەوەزیری دارایی، بارودۆخەکەیان بەرەو باشتر چوو و هەروەها براکەی بووە بەچاودێری گشتی لە کێڵگەکانی وڵات و برای سێیەمی بووە باوەڕپێکراوی وڵات و فەرمانڕەوای مووسڵ.

## جوولەکەکانی عێراق
## لە سەردەمی عوسمانییەکاندا

دوای هاتنەناوەوەی سوڵتان سلێمانی یەکەم لە ساڵی (941ک / 1534ز)و لە سەردەمی ئەودا هیچ زیانێکیان پێنەگەیشت و لە ساڵی 1047ک / 1637ز)و لە سەردەمی سوڵتان (مورادی) چوارەم کە بەغدای لەژێر دەستی فارسەکان گەڕاندەوە. رواڵەتەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی جوولەکەی عێراق لە سەرخانی رووداوەکانی کۆمەڵگەی تورکی نوێدا دەرکەوت. لەم ماوەیەشدا جوولەکەکان دەستیان بەجموجۆڵ کرد بۆ دووبارە بەهێزکردنەوەی بنەماکانی ژیانیان، دوای ئەوەی رەشەبای فارسەکان هەڵیتەکاندن. بەگشتی سوڵتان موڕادی چوارەم لەگەڵیان باش بوو زۆربەی داواکارییەکانیانی جێبەجێکرد. لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەمی زایینی باری ئاسایشی جوولەکەکانی عێراق جێگیربوو. لە هەموو شوێنەکانی عێراق کەوتنە جموجۆڵ بۆ دۆزینەوەی شوێنێک بۆ نیشتەجێبوونیان دەبینین لە مووسڵ و کەرکووک و سلێمانی و هەولێر بوونیان هەیە تا گەیشتنە دوورترین ناوچە لە پارچەکانی باکوور لە سنووری عێراق. لەوێ ئاشنایەتیان لەگەڵ هەندێ کەس پەیداکرد، کە خۆیان بەپاشماوەی (کۆیلەیی ئاشووری یەکەم) دەزانی.

لە هەمان کاتدا دەستیان کرد بەدووبارە نۆژەنکردنەوەو چاککردنەوەی زیارەتگاکان کە تایبەت بەخۆیان بوو لەو ناوچانە، بەتایبەتیش (زیارەتگای پێغەمبەر ناحوم) لەناوچەی (ئەلقوش)، کە 50کم لەشاری مووسڵەوە

دووره، دەستیان بەڕێکخستنی سەردانەکانیان کرد بۆ زیارەتگاکان دوای ئەوەی بایەخی پێدرا، بەهەمان شێوەی باکوور جوولەکەکان لە ناوەڕاست و باکووری عێراق دەستیان بەجموجۆڵ کرد. یەکەم شت کە دەستیانپێکرد چاککردنەوەی مەزارگاکانیان بوو، بەتایبەتیش (الکفل والنبی یوشـــع). بەڵگـــەش بۆ ئەوە جوولەکەکانی عێراق لەماوەی ناوەڕاســـتی ســـەدەی حەڤدەهەم بەرەو ســـەرەوە بەخۆشـــی دەژیان. لە ساڵی (1190ک/ 1776ز) یەکێک لە دەوڵەمەندەکانیان ناوی خەواجە یەعقوب بوو یارمەتی سەربازە عوسمانییەکانی داو پارەیەکی زۆری پێدان. کاتێ لەو شەڕەی کە لەگەڵ فارسدا هەڵگیرسابوو (شا کەریمخان) شەڕی هەڵگیرساند، بەڵام لە سەردەمی (مەمالیک)دا کاروباری ژیانی جوولەکەکان بەشێوەیەکی باش بەڕێوە دەچوو، بەتایبەتی لە کاتی فەرمانڕەوایی (داود پاشا) سەرەڕای روودانی هەندێ کێشەی دارایی لە گەورە بازرگانەکانیان لەوانەش خەواجە (داود ساسون).

لە سەرەتای ســـەدەی هەژدەهەمی زایینی جوولەکەکانی دانیشتووی بەغدا تووشی شەپۆلێک لە شەپۆلەکانی نەخۆشی کۆلێرا بوون ئیتر مردن دروێنـــەی دەکردن و هیچ جیاوازییەکـــی لەنێوان گەنج و پیردا نەدەکرد. لە رۆژی 27 مانگی نیســـان بەشـــێک لە دیواری شـــار لە لای باکووری رۆژئـــاوا رووخا ئاوێکی زۆر هاتە ناوەوەو گەڕەکی جوولەکەکانی گرتەوەو نزیکەی دووســـەد خانووی تێکدا. باری جوولەکان هەر لەنێوان هەڵکشان و داکشـــاندابوو، بەهەرحاڵ بارودۆخیان جێگیربوو لە زۆربەی ماوەکانی دیکەدا تاکو فەرمانڕەوا (عەبدولمەجید) هات لە ساڵی 1856ی زایینی بەیاننامەیەکـــی دەرکرد کە لە هەندێ خاڵیدا باســـی لە مافەکانی هۆزە نامسوڵمانەکان دەکرد. لەپێش هەموویانەوە جوولەکەو نەسارییەکان. بۆ زانیاری لە کاتی فەرمانڕەوایی عوســـمانی ژمارەی جوولەکەکانی عێراقی زۆر زیاتربوو لە ژمارەی نەسارییەکانی عێراقی بەتایبەتی لە شاری بەغداو لەکاتی فەرمانڕەوا (عەبدولمەجید) خۆی راســـتەوخۆ زانست و زانیاری و رۆشـــنبیری لەنێوان پۆلەکانی نەوەی جوولەکەکاندا بڵاوکردەوە ئەویش

بەدامەزراندنی قوتابخانەی یەکگرتــن، کە بەناوبانگترین خانەی یەکەمی بڵاوبوونەوەی قوتابخانەی جوولەکەکان لە عێراق دەژمێردرێت. لە سەردەمی (مەدحەت پاشا) جوولەکەکانی عێراق ژیانێکی خۆشگوزەران دەژیان لە ساڵی 1868دا لەنێوان هاووڵاتیان بەگشتی گیانی یەکسانی و دادپەروەری و ســەربەخۆیی بڵاوبۆوە، بەمەش کاری بازرگانی لە ئەوان فرەوانتربوو. کاروباری کۆمەڵایەتیشــیان باش بوو، دادگا رۆحانییەکان پەرەیانسەندو دەستکرا بەهەڵبژاردنی لێژنەکانی سەرپەرشتی لەسەر کاروباری ئایینی و نائایینی و رۆشنبیری و تەندروستی، بەتایبەتی لێژنەیەک بۆ دامەزراندنی نەخۆشخانەکان لەپێش هەموویانەوە (نەخۆشخانەی میر ئەلیاس)،

لە ساڵی 1876 ئەنجوومەنی نێردراوان لە بەغدا کرایەوە، نوێنەرێکی بەناوی (مناحیم دانیال) وەک ئەندامێکی تایەفەی جوولەکەکان هەڵبژێردرا، کەچی هیچ ئەندامێکی مەسیحی بۆ هەمان مەبەست هەڵنەبژێردرا، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە چڕی دانیشتوانی جوولەکەکان لە بەغدا زۆرتر بووە لە هەموو تایەفەیەکی دیکە. لەو فەرمانڕەوایە عوســمانییانەی کە جوولەکە بەشێوەیەکی باش ناوی بردوون.

(رەجەب پاشا) کە لەبنەڕەتدا سەرکردەی سوپابوو، کە لە سەردەمی ئــەودا ئازادی بڵاوبۆوەو کارئاســانی لە بەڕێوەبردنــی کاروباری وڵات و هەموو دانیشــتوانەکانی پیشانداو پاڵپشتی و بێ لایەنی خۆی نیشاندا لە فەرمانەکان و هەڵسوکەوتی لە بەڕێوەبردنیدا.

لەوانەیە (نازم پاشا) کە والی فەرمانڕەوای وڵاتی عوسمانییەکان بوو لە بەغدا لە هەموویان زیاتر سۆزی بۆ جوولەکە هەبووبێ. خۆشیدەویستن و کارەکانیانی بۆ رێک و ئاســان دەکردن کاتێک گەیشــتە بەغدا لەسەر کارەکەی لایانبرد، لەبەرئەوە تایفەی جوولەکەکان زۆر پێیان ناخۆش بوو بەلابردنی.

دوای هەڵگیرساندنی یەکەم شەڕی جیهانی لە سەردەمی فەرمانڕەوای (نامیق پاشــا) جوولەکەکانی عێراق زوڵمێکــی گەورەیان دەرحەق کرا تووشــی رووداوی ناخۆشی یەک لەدوای یەک هاتن. کێشەکان روویان دا

زیادبوون کردو تا دەهات توندتر دەبوون، لە کۆتایی مانگەکانی شەڕ جێگیری فەرمانڕەوا (فائیق بەگ) و بەڕێوەبەری پۆلیس (سەعدەدین بەگ) تەنگیان پێ هەڵدەچنین و تاوانیان دەخستە پاڵ و داموودەزگاکانی نیمچە داخراوبوون. گوێیان بەداواکاری و سکاڵاکانیان نەدەدا، هەرچەندە هەوڵی پێدانی بەرتیلیشیاندا، بەڵام بێ هودەبوو، هەر لەسەر ئەم بارە ناخۆش و نیگەرانییە مانەوە تا کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی و رووخانی بەغدا بەدەستی ئینگلیزەکان لە ساڵی 1917 کاتێ ژەنەراڵ (مۆر) هاتە ناوەوەو لەژێر سێبەری داگیرکەردا درێژەیان بەژیاندا، لەماوەی دەسەڵاتداری پادشایی لە عێراق و لەدوای ئەویشداو لە سەردەمی کۆماری و تاکو ئێستاش لەگەڵ نووسینی ئەم دێڕانە بەشێکی کەم لە نەوەکانی تایفەی جوولەکەی عێراق کە ژمارەیان ناگاتە 500 کەس لەو وڵاتانەی نیشتەجێن کە پێش هەزاران ساڵ باب و باپیرانیان تێیدابوونە.

---

پەراوێز:

ئیبراهیم خەلیل ماناکەی (ابو الجماعات)ـە ئەویش جوولەکەیە لە (أب) وەرگیراوە (رهیم) کۆکراوەی عەرەبی (رهم)ـە،

لە 2366 پێش مەسیح لەدایکبووە کوڕی (تارح)ـە و لە نەوەیەکی پێغەمبەر (ترح)ـە لە دەوروبەری 2296 باوکی و براکانی شاری خۆیان جێهێشت بۆ (حران).

لە (حران)ـەوە چوو بۆ خاکی (کەنعان).لە تەمەنی 75 ساڵیدا بەفەرمانی خودا گەیشت

سەرچاوەکان:

طه باقر/ مقدمه في تاريخ الحضارات القديمه

د. احمد سوسه. نصف قرن من حياتي

د. خلدون ناجي معروف/ الاقليه اليهوديه في العراق

يوسف غنيمه/ نزهه المشتاق في تاريخ يهود العراق

لەگەڵ بەســـەرچوونی کات و سەردەمدا، لەوکاتەی جوولەکەکان لەم وڵاتەدا نیشتەجێبوون، بەردەوام جموجۆڵیان هەبووەو بەرەو ئەو ناوچانەی نزیــک بابل دەخزان بۆ ئــەوەی پارچەیەک زەوییان بۆ نیشـــتەجێبوون دەســـتکەوێت، هەوڵیان داوە ســـەرچاوەی بژێوی خۆیان پەیدا بکەن و یەکەمجـــار ئـــەوَ ناوچانەی لە دوای جموجۆڵیان لـــە بابل روویان تێکرد ناوچەی باشـــووری عێراق بوو وەک مونتەفک و بەســـرەو عەمارە. دواتر خزانە نێو بەغدا و ناوچەکانی دیکەی ناوەڕاستی عێراق، هەندێکیان شاری کەربەلاو کوت و نەجەف و دیوانیەیان وەکو شوێنی نیشتەجێ و سەنتەری بازرگانـــی بۆ خۆیان هەڵبژارد، بەمەش نەوەســـتان روویان کردە رۆژئاوا و باکوور، زۆربەیان نازناوی ئەو شـــارو شـــارۆچکانەیان هەڵگرتبوو کە تێیـــدا پەروەردە دەبوون. لەم نازناوانە (ئەلعانی، ئەلراوی، ئەلبەغدادی، ئەلسامەڕائی، ئەلشەهربلی، ئەلعەمادی) پێیانەوە لکاو هەر بەم نازناوەش دەناســـرانەو،ە دەرئەنجام لە شـــوێنێکی تایبەت بەخۆیان کۆدەبوونەوە هەر بەناوی هۆزەکەشیان ناونرابوون وەک بازاڕی جوولەکەکان و کۆڵانی جوولەکەکان.

بۆ نموونە لە بیســـتەکانی ئەم ســـەدەیە لە ســـامەڕا بازاڕێک هەبوو بەناوی بازاڕی جوولەکەکان، بەڵام گەورەترین کۆبوونەوەی دانیشـــتوانی جوولەکـــەکان لە شـــاری بەغدا بوو. هۆزی جوولەکـــەکان لە باکوورەوە تا باشـــوور بڵاوبوونـــەوە، واتە لە (تەلاری شەعشـــوع لە ئەعزەمیە) تا بەربەســـتی خزوری لە کەڕادە، بەڵام چینە میللییەکانیش لە بازاڕەکانی (حەنـــون عەکد جـــام و عەکد جنائز و گەڕەکی تەوراِت کۆری ســـەعید شـــۆریجە) و شەقامی غازی و گۆڕەپانی ئەمین کۆدەبوونەوە. ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە لە ساڵی 1929 (ئەلیاهو سەلمان شەمعون) موختاری گەڕەکی بوشبل و ژێر تەکیە بوو.

هەورەها لە ساڵی 1933 (حەســـقیل ئەسڵان) موختاری گەڕەکی (قەمبەرعەلی) بوو، هەروەها خاوەن کاروبارەکان بەرەو باشووری بەغدا بەڕێکەوتـــن و لە ناوچەی (ئەلســـەنک) یەکەم شـــت بارەگایەکیان بۆ

هەندێ کۆمەڵگەی نیشـــتەجێبوون وەرگرت. لەوانە خانەوادەی (مناحیم دانیـــاڵ) و خانـــەوادەی (ئیبراهیم حییم) کە بۆ چەنـــد خولێک ئەندام بوو لە ئەنجوومەنی نوێنـــەران. هەندێک لە گەورە بازرگانەکانیش لەوانە (ئیبراهیم عەدەس) دواتر روویان لە (باب شـــرقی) و کەڕادە و سەعدون کرد، لەوێ لەســـەر چەند پارچە زەوییەک کۆشکی گەورەیان دروستکرد رەنگە کۆشـــکی (حزوری لاوی) گەورەترین کۆشـــک بووبێ کە ئێســـتا کەوتۆتە دووریانی (کەڕادەی رۆژهەڵات) و باڵیۆزخانەی فەرەنســـای کرد بـــە بارەگای خۆی، لە هەموویش ســـەیرتر ئەوەبوو کـــە زۆر لە خێزانە جوولەکەکان لە شوێنە ئیسلامییە پیرۆزەکان دەژیان وەک کەربەلای شاری حوســـێن (س.خ) ئەمەش بەڵگەیەکی ســـەلمێنراوە کە جوولەکەکانی ئێراق لە خۆشەویســـتی موسڵمانە نیشتەجێبووەکان بێبەش نەبوون، جا ئەگـــەر عێراقی یان جۆرەکانی دیکەی ئیســـلامی وەک ئێران و ئەفغان و هیندییـــەکان بووبن. لە ئاکرێ و ئامێدی و دهۆک جوولەکەکان بەتەواوی شـــان بەشانی میللەتی عێراق دەژیان لە هەردوو رەگەزی کورد و عەرەبە موسڵمان و مەســـیحییەکان. لە جلوبەرگیشدا هەمان شێوەی جلوبەرگی ئـــەو ناوچانەیان لەبەر دەەکـــرد هیچ جیاوازییەک لەگـــەڵ دەوروبەریان نەبوو، تەنانەت شـــارەزاییان لە قســـەکردن بەزمانی کـــوردی بەهەموو دیالێکتەکانەوە هەبوو، کەســـیش دەســـتی لە پەرســـتگاکانیان نەدەدا، پەیوەندییـــان پتەوبوو لەگەڵ زۆر لـــە خێزانە کوردە بەناوبانگەکانی ئەو ناوچەیە تەنها خەملاندنێک لەم لاو ئەولا هەبوو بۆ ســـەرژمێری کردنیان، ئەویش بەپێی هەندێ لەو کەسانەی لەسەریان نووسیبوون.

لە ســـاڵی 1816-1836 لەوکاتەی والی داود پاشا فەرمانڕەوایی بەغدای دەکرد گەڕۆکی ئینگلیـــز (J.R.Wlested) ئاماژە بەبوونی نزیکەی حەوت هەزار جوولەکە دەدات لە بەغدا، کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا پێوانەی ژمارەیان لە بەغدا گەیشتە 2500 خێزانی جوولەکە، بەڵام لە شاری سلێمانی (300) خێزان بوو کاتی خۆی لە شاری (عانە) ش رێـــژەی جیاجیای لێبوو، لـــە کفریش جالیە و پەرســـتگایان هەبوو

کەچی لە موسڵ لە ســـنووری هەزار کەس دەبوون. لە ساڵی 1924دا و لە ئامارێکی لیژنەی نەتەوە یەکگرتووەکان سەبارەت بەکێشەی موسڵ دەرکەوت 3579 جوولەکە هەبووە.

بوسف غەنیمە دەڵێ: حکوومەتی داگیرکەر ئامارێکی بۆ دانیشتوانی عێراق کرد، ژمارەی جوولەکان 87448 کەس بوون و دابەشـــکرابوون بەسەر پانزە شاری عێراقی، گەورەترینیان شاری بەغدا بوو کە 50000 جوولەکەی لێنیشتەجێبوو، کەمترینیشیان لە شاری کەربەلا بوو کە تەنها 160 کەسی تێدابوو.

لەکاتـــی داگیرکردنی بەریتانیا بۆ ســـەر ئێـــراق چەندەها ناوی ئەو هۆزانەی لە شاری کەربەلادا هەبوون دۆزرانەوە، ئەوانیش:

1- شـــەمعون ئەلیاهو. 2- نەعیم عەزراعانی. 3- ئیســـحاق طریق. 4- عبودی یوسفان.

5- یوســـف ئیبراهیم شـــالوم. 6- داود لاوی. 7- رەحمین حەکاک. 8- یەعقوب شەعشوع.

9- یوسف شاوول جوری. 10- عەزرا بلبول. 11- یوسف ئەلکەبیر. 12- ساسون عەرەب.

13- میـــرداد و ئەلیاهو. 14- ئیســـحاق عـــەزرا. 15- داود حای ئەلساعەجی کەچی لە سەرژمێری ساڵی 1947دا ژمارەی جوولەکەکان لە عیراق گەیشـــتە 117877، هەروەها لە ســـاڵی 1917 تا ساڵی 1947 بەغدا زۆرترین ژمارەی لێبوو، کە نزیکەی 77524 کەس بووە، بەڵام لە کەربەلاو نەجەفی پیرۆز تەنها 39 کەس زیاتر نەبوو. لەســـەر ژمێری ســـاڵی 1957دا ژمارەی هۆزی جوولەکەکان تەنها چەند هەزار کەسێک دەبوو، زۆربەی ئەوانیش لە بەغدا بوون. لە دوای ساڵی 1967 ژمارەیـــان گەیشـــتە نێوان 2500 تا 3000 کـــەس، ژمارەیەکی زۆر لەوانـــە جوولەکەکانی عێراق لە 500 کەس زیاتر نەدەبوو. جوولەکەکان گۆڕستانێکی تایبەت بەخۆیان هەبوو کە دەکەوێتە شەقامی شێخ عومەر. دەربـــارەی چیرۆکی ئەم گۆڕســـتانە و چۆنیەتی دروستبوونیشـــی بەم

شـــێوەیە بوو، لەوکاتەی ســـوڵتان موورادی چوارەم لە شاری بەغدا بوو ڕۆژێکیان شـــێوەی تر خۆی گۆڕی چووە ماڵـــی یەکێک لە جوولەکەکان و بـــووە میوانیان و خـــاوەن ماڵ زۆر ڕێزی لێگرت. کاتێ ویســـتی بڕوا پرســـیاری لە خـــاوەن ماڵ کـــرد و وتی چیتان پێویســـتە بۆ خۆتان و نەتەوەکەتان تا بتوانم یارمەتیتان بدەم. ئەویش وتی تەنها پێویستیمان بە پارچە زەوییەک هەیە بۆ ئەوەی بیکەینە گۆڕستان. داواکەی جێبەجێ کـــرد و پارچە زەوییەکەی پێـــدان لەکاتی فەرمانڕەوایـــی عەبدولکەریم قاســـم بڕیاردرا تاوەرێک لەسەر زەوی گۆڕستانەکە دابنرێ، دەستکرا بە تەختکردنـــی زەوییەکە بۆ ئەوەی پرۆژەکەی جێبەجێ بکەن. بەڵام چەند مانگێکی نەخایاند شۆڕشـــی 14ی ڕەمەزانی پیرۆز هەڵگیرســـا ئەوەبوو عەبدولکەریم قاسم خوا لێی خۆشبێ بەخۆشی بێ گۆڕ مایەوە.. لەجیاتی گۆڕســـتانەکەش حکوومەت پارچە زەوییەکی بچووکی پێدان لە ناوچەی (حەبیبییە) بۆ ئەوەی بیکەن بە گۆڕستانی خۆیان.

---

سەرچاوە:
-1 د. كمال السامرائي- حديث الثمانين ج1.
-2 جيمس ولستيد- ترجمه سليم التكريتي ص95.
-3د. عبدالعزيز نوار: داود پاشا والي بغداد. ص138-137.
-4يوسف رزق الله غنيمه: نزهه المشتاق في تأريخ يهود العراق.
-5جريده العرب- العدد الصادر في 14 حزيران 1918 ص4 .
-6يهود الاقطار العربيه- مركز الدراسات الفلسطينيه 1987 خلدون ناجي معروف.
-7 عبدالعزيز القصاب من ذكرياتي.
-8 مختار بغداد - محسن الجابري.

هـــەر لە کۆنەوە و لە ســـەدەی ســـیانزهەمی پ. ز لەگەڵ دەرکەوتنی پێغەمبەر موسا (د.خ) ئایینی (الموسومیە) لەسەر زەوی عەرەبی بڵاوبۆوە کـــە لەوێ تەنها خودای تاک و تەنیا و دروســـتکاری زەوی و ئاســـمانیان دەپەرســـت لەگـــەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی بابلی کلدانی لە ســـاڵی (٦١٢) پ. ز کە (٧٣) ســـاڵ فەرمانڕەواییان کرد، لەم ماوەیەدا جوولەکان بۆ بابل راگوێزران، ئەم هەڵمەتەش لەســـەردەمی نەبوخز نەسری دووەم) جێبەجێ کرا کە گەورەترین پاشـــای وڵات بوو. بۆ ماوەی (٤٣) ساڵ فەرمانڕەوایی وڵاتی کرد. لە دوو هەڵمەتدا یەکەمیان لە ساڵی (٥٨٦) پ.ز، دووەمین لە ساڵی (٥٩٧) پ. ز. بوو.

هـــۆی پێشـــکەوتنی ئایینەکەیان مانـــەوەی جوولەکـــەکان و کۆیلەی بابلییەکان بوو لە بابل، هەروەها هۆیەک بوو بۆ پەرەسەندنی بنەمای بیری تەنهایی گشتگیری و هەڵچوونی گیانی، لە کاتێکدا ئەوە روویدا جوولەکەکان دەچەوســـانەوە. ئایینی جوولەکەکان کە ئەمڕۆ ناسراوە لەماوەی (الاسر) یـــەکان لە وڵاتی بابل لـــە دایکبوو لەکاتی کۆیلەیـــی (٥٣٨-٥٨٦) پ.زدا زۆربەی ئەســـفارەکانی کتێبـــی تەوراتی یەکەم تۆمارکـــرا. تەورات روکنی بنەڕەتی ئایینی جوولەکەکان بوو، هەروەها بە ســـەردەمی کۆن دەناسرێ و کتێبێکی پیـــرۆزە لەلایان جیاکراوەتەوە لەگـــەڵ (ئینجیل) کە ئەوەیان بەســـەردەمی تازە دەناسرێ، بەڵام ســـەرچاوەی دووەم (تەلموودە) واتە رێنمایی و راڤەکردن و لێکدانەوە.

کە زانا جوولەکەکانی (ئەحبار و حاخامون)ی دوای مەسیح دایانناوە. کە برتییە لە باسکردنی کۆمەڵێک جوولەکە و لێکدانەوە و وتار لەمەڕ تەورات و تێپەڕبوونی ساڵ رێبازو پەروەردەکردنیان لەسەر دادەڕشت، هەڵسوکەتیان لە لێکدانەوە و فێربوون وەرگرتبوو ببووە پیرۆزترین شـــت لەلایان. کتێبی (الیوبیلات) کتێبێکی جوولەکەکانە باس لەلایەنێکی مێژوویی بابو باپیرانی ســـەردەمی کۆن دەکات، هەروەها باس لـــەو هەوڵانە دەکات کە لە کتێبی (التکوین والخروج، دروستبوون و دەرچوون)دا هاتووە. وشەی (یوبیل) واتە ساڵی گەڕاندنەوەی زەوی بۆ خاوەنەکەی ساڵی بەپیت و فەڕ. جوولەکە دوو

بەشـــن (سفرادو اســـكانياج) نوێنەری ئەوانە یەکەم ئەوانەن کە لە وڵاتانی عەرەبی و فەرەنسا و ئیسپانیا نیشتەجێبوون، دووەمیان دانیشتوانی وڵاتانی ئەورووپا و ئەمەریکای باکـــوور دەگرێتەوە. دەرکەوتووە کە پیاوانی ئایینی (اسکانیاج) توندتر لە هاوڕێکانیان دەستیان بەم ئایینەوە گرتووە. ئایینی جوولەکەکان بریتییە لە ئایینێکی کەهنووتی قەشـــەکان خۆیان تەوراتیان لێکداوەتـــەوە. هەروەها کۆمەڵەیەکی تریان هەیە، کە بە (ئەلســـنهدرین) ناودەبرێن کە لە دوای کۆیلەی بابلی سەرەتای رێکخستنەکەیان دەرکەوت، بەشـــێکی دیکەی کەمی جوولەکەکانیش پێیان دەوترا (ســـامرییین)، واتە خەڵکی شـــاری سامرە لە نابلس. ســـامرییەکان بانگەشە دەکەن کە ئەوان میراتگری (بەنی ئیســـرائیلی) و پارێزەری تەوراتن کار بۆ فێربوون و هەر (دە) وەســـیەتەکان دەکەن، خوا هەر بۆ ئەوە هەڵیبژاردوون و هەر تەنها ئەوانیشن پاشماوەی نەوەکانی (یەعقوب. س.خ) دوای بڵاوبوونەوەی زمانی ئارامییـــە لە هەموو وڵاتانی رۆژهەڵاتدا جوولەکەکانیش لە بابل بەردەوام لە نێو خۆیاندا هەر بەو زمانە قســـەیان دەکرد دوای گەڕانەوەی هەندێکیشیان بۆ فەلەســـتین (نـــور)، جوولەکەکانیش هەر لە بابل مانـــەوە و پابەندی ســـرووتی ئایینی خۆیان بوون. ئەگەرچی ئێمە ناوی پەرســـتراوێکی کۆنی جوولەکەکەمـــان نەدۆزییـــەوە لەم ناوچەیەدا دەبوایە زۆر پەرســـتگا لەوێ هەبوایە، ئەنجوومەنی تایبەت بەسەرپەشـــتیکردنی کاروباری جوولەکەکان پێکهات، بریتی بوون لە ســـێ کەســـی گەورە کە درێژییـــان بە فەرمان و دەســـەڵات دەدا و پێیـــان دەوتن (جانحیم)، (الـــراب، پایەبەرز-یەعقوب کوڕی یوســـف) لەگەڵ پایەبـــەرز (یاهو عوبیدا) و پایەبـــەرز (عەبدوڵڵا) ئەمانە ســـەرۆکایەتی ئەم دادگایەیان دەکرد. ئـــەم دادگایە مافی ئەوەیان نەبـــوو هیچ ســـزایەک دابەزێنن بۆ جوولەکەکان چونکـــە ئەوە تەنها مافی سەرۆکی حاخامین (حاخام باشین) بوو کە لە کەسێکی ئەو بەرزترەو ئەم پلەوپایەیان پێدرابوو ئەوان نوێنەری کۆمەڵێک بوون بەرامبەر بەحکوومەت هەڵدەســـتان بەکۆکردنەوەی باج لە گەلەکەی. بـــۆ بەڕێوەبردنی کاروباری هۆزەکان چەند ئەندامێک یارمەتی (سەرۆکی حاخامین)یان دەدا.

(رابی رافائیل مکاســیس الحلی) ئەم ئەنجوومەنەی هەڵدەســوڕاند و ڕێزێکی تایبەتی لەلای فەرمانڕەوا هەبوو ڕێگای پێدابوو کە هەرکاتێ بیەوێ بچێتە دەرەوە چوار پاسەوانی تایبەت بۆ خۆی بەکاربهێنێ و پاسەوانەکانیش بەسواری ئەسپ پێشڕەوی بکەن. لە ساڵی (١٨٥٠) ژمارەی پەرستگاکانی جوولەکە لە بەغدا تەنها نۆ بوو سەرەڕای هەبوونی چەند ژمارەیەکی دیکەی لــە پارێزگاکان و قوتابخانــەی ئایینی تایبەت بە خۆیانیــان دامەزراند و لەکاتی دەرچوونی ئایینناســەکان لەو قوتابخانانە وەک رابەری ئایینی بۆ هۆزەکانیان کاریان دەکرد.

پێکهاتەکانی تایفەی ئیسرائیلی

* سەرۆکی باڵا: سەرۆک تایفە.

* ئەنجوومەنی رۆحانی: بریتین لە:

١- سەرۆکی حاخامییەکان.

٢- سەرۆکی دادگای پێداچوونەوەی یاسایی.

٣- ئەندامانی دادگای ئایینی.

٤- ئەندامانی دادگای پێداچوونەوەی یاسایی.

٥- ئەندامانی یەدەگ.

* ئەنجوومەنی جەستەیی: بریتین لە:

١- سەرۆک.

٢- جێگری سەرۆک.

٣- ئەندامان.

لیژنەیەک لە ئەنجوومەنی جەستەیی (الجسمانی) دەبێتەوە کە ئەمانەن:

١- لیژنەی قوتابخانەکان.

٢- کۆمەڵەکانی خێرخوازی.

٣- لیژنەی نەخۆشخانەکان.

٤- لیژنەی موڵکداریەتی.

وێڕای بەشی کارگێڕی کە سەرپەرشتی نەدارەکان و مردووەکابەجێماوەکان دەکات.

## ناکۆکییەکانی نێوان سەرۆک هۆزەکان

زۆربەی ئەو ناکۆکیانەی کە روویداوە سەبارەت بەچۆنیەتی وەرگرتنی پلەوپایەی (حاخام باشی) بووە کە وەک سەرۆک هۆزی باڵا هەڵبژێردراوە. بۆ نموونە لە ساڵی ١٩٢٣ سـەرۆک حاخامین (عزرا دنکور) بەوەکالەت سـەرۆکایەتی و بەڕێوەبردنی کاروباری هۆزەکەی دەکرد. بەڵام هۆزەکە ئەمەیان پێ خۆش نەبوو لەلایەک، لەلایەکی دیکەوە هەندێک دەیانویست بەڕاسـتی ببێت بەسـەرۆک نەک بەوەکالەت. بەشی سـێهەمیش بەبێ لایەنی مانەوە هەتا ١٩٢٣/١٠/٦ فەرمانی کارگێڕی پاشـایەتی دەرچوو بەلابردنی بەڕێز (دنکور) لە پلەوپایەکەی و هیچ دەسـەڵاتێکی قورسی سەرۆکایەتی حاخامینی بەوەکالەت بۆ نەمایەوە، شایانی باسە ئەو کاتەی بریکاری ناوبراو لەکاتی ماوەی ناکۆکییەکەدا کە ئەو پلەوپایەی وەرگرت سکاڵانامەیەکی لە ١٨/٦/ ١٩٢٦ پێشکەش بەسەرۆک وەزیران کرد تیایدا کە لە ئەنجوومەنێکی تێکەڵ دادگایی بکرێ.

پشووە فەرمییەکانی جوولەکەکانی عێراق

یەک رۆژ: سەری ساڵی موسایی.

یەک رۆژ: جەژنی کەفارەت.

چوار رۆژ: جەژنی عەرازیل (المضله).

بەمجـۆرە فەرمانبەری جوولەکـە دەتوانێ بۆ مـاوەی دە رۆژ چێژ لە مۆڵەتی سـاڵانە وەربگرێ، ئەمەش دوو ئەوەندەی پشـووی هاوکارە موسڵمانەکەیەتی، ئەو بۆنە ئایینیانەی کە فەرمانگەکەی وڵات دادەخات ئەوکات بریتی بوو لە ١٠ رۆژ:

٣ رۆژ جەژنی رەمەزانی پیرۆز

٤ رۆژ جەژنی قوربان.

١ رۆژی جەژنی لە دایکبوونی پێغەمبەر

١ رۆژی جەژنی سەری ساڵی کۆچی

١ رۆژ دەیەم رۆژی مەحەڕەم

- جەژنەکانی ئایینی لای جوولەکەکان لەگەڵ رۆژانی بەرۆژبوون:

| **جەژنەکان** | **رۆژووەکان** |
| --- | --- |
| جەژنی یادی کۆچی دوایی پێغەمبەر موسا رۆژووی | ٩ی ئاب |
| جەژنی فەتیر | رۆژووی دالیا |
| جەژنی سەربڕینی مەڕ | رۆژووی تۆبەکردن |
| جەژنی زیارە | |
| جەژنی عەرازیل | رۆژووی طشباط |
| جەژنی خسوکە | |

ئەوەش خشتەیەک بەناوی هەندێ حاخامینی جوولەکەکان لە سەردەمی عوسمانی دواکەوتوو تا ناوەڕاســـتی سەدەی بیستەم کە سەرپەرشتیان لە خزمەتکردنی هۆزە جوولەکەکان دەکرد.

١- حاخام باشی عودیا
٢- یوسف جیم ئەلیاهو
٣- حاخام باشی عبدالله ابراهیم سوحیە
٤- الیاهو سحوقە الصائغ
٥- حاخام باشی اللیشاع
٦- حاخام عزرا دنکور
٧- حاخام ساسونا خضوری حاخام باشی
٨- حاخام باشی بنیامین حاخام موسکی
٩- حاخام سلمان حوکی عبودی
١٠- اسرائیل رائیل اسحق جیم
١١- شوع موشی
١٢- شلومو موشی
١٣- ساسون عزرا ئیسحاق
١٤- الیاهو شوع
١٥- داود عزرا معضی
١٦- الحاخام عزرا الیاهو ربیع
١٧- عزرا مرد خاوی

١٨- موشی ابراهیم
١٩- سلمان مولی
٢٠- بامین عبود اصلان

## مێژووی دامەزراندنی کڵێسەی جوولەکەکان

| ناوی کڵێسە | مێژووی دامەزراندن |
|---|---|
| ١- مدارس تلمود تورا | ١٨٣٣ز |
| ٢- منشی زبیده | ١٨٣٤ز |
| ٣- زعه | ١٨٣٩ز |
| ٤- یعقوب صبیح (غاوی) | ١٨٥٠ ز |
| ٥- شاؤول | ١٨٥٥ز |
| ٦- روبین اسحق | ١٨٥٧ز |
| ٧- روبین یهودا | ١٨٥٩ز |
| ٨- عبدالله باود ساسون | ١٨٧٤ز |
| ٩- موشی موشی ابراهیام دهان | ١٨٦٧ز |
| ١٠- اسحق شالوم | ١٨٨٠ز |
| ١١- فرحه عزرا | ١٨٨٤ز |
| ١٢- دینه | ١٨٨٤ز |
| ١٣- ریمه | ١٨٨٤ز |
| ١٤- لفه | ١٨٨٥ز |
| ١٥- شێخ اسحق | ١٨٩٠ز |
| ١٦- باروخ حسقیل | ١٨٩٠ز |
| ١٧- فرحه سلیمان | ١٨٩٢ز |
| ١٨- اسحق حییم منیر یعقوب زعرور | ١٨٩٨ز |
| ١٩- حیم الیاهو مصری | ١٩٠٦ز |
| ٢٠- حاخام حسقیل | ١٩٠٨ز |

| | |
|---|---|
| ٢١- مندالی | ١٩١٠ز |
| ٢٢- حجله عزرا | ١٩١٠ز |
| ٢٣- مئیر رفائیل | ١٩١٠ز |
| ٢٤- خزام | ١٩١٢ز |
| ٢٥- مئیر الیاهو | ١٩١٣ ز |
| ٢٦- منشی کرجی | ١٩١٣ز |
| ٢٧- حاخام شمعون | ١٩١٥ ز |
| ٢٨- اسحق فرحه | ١٩٢٥ز |
| ٢٩- رشایل شمعون | ٥١٩٢ز |
| ٣٠- شماس | ١٩٢٦ز |
| ٣١- دینه الیاهو | ٦١٩٢ز |
| ٣٢- مسعوده الیاهو روببیت | ١٩٢٩ز |
| ٣٣- فرحه عابد | ١٩٢٩ز |
| ٣٤- موشی یعوذا اسحق | ١٩٣٩ز |
| ٣٥- مسعوده سلمان | ١٩٣٤ز |
| ٣٦- عزرا داود | ١٩٣٤ز |
| ٣٧- منشی صالح | ١٩٣٥ز |
| ٣٨- مسعوده شمطوب | ١٩٣٥ز |
| ٣٩- سوفیر | بێ مێژووه. |

## ليستێک بۆ ناوی هەندێ لە ناودارەکانی حاخامین لە عێراق:

**حاخام** **تێبینییەکان**

١- یعقوب مراد نوح وەک سەرۆکی هۆزی جوولەکەکان لە بەسرە کاری کردووە.

٢- ساسون خضوري حسقيل وەک سەرۆکی هۆزی جوولەکەکان لە بەسرە/ عێراق.

٣- عبداله ابراهام سوميخ- وەک سەرۆکی هۆزی جوولەکەکان لە عێراق لە سەردەمی عوسمانییەکان لە ساڵی ١٨٨٩ کۆچی دوایی کرد.

٤- افرايم حسقيل افرايم- وەک سەرۆکی هۆزی جوولەکەکان لە بەسرە.

٥- یعقوب بن یوسف یعقوب وەک سەرۆکی هۆزی جوولەکەکان لە بەسرە لە سەردەمی عوسمانییەکان. لە ساڵی (١٨٨٩) کۆچی دوایی کردووە.

٦- الیاهو عوبید- لە ساڵی (١٨٧٥) کۆچی دوایی کردووە.

٧- رفائیل کاسین الحلي- وەک سەرۆکی ئەنجوومەنی دادگای باڵا بۆ هۆزی جوولەکە کاری کردووە لە سەردەمی عوسمانییەکان.

٨- الحاخام عزرا دنکور — وەک سەرۆکی هۆز بەوەکالەت لە ساڵی ١٩٢٠ کاری کردووە لە ساڵی ١٩٢٣ دەستی لە کار هەڵگرتووە.

٩- الحاخام یامین عبودی اصلان- لە سەرەتای سییەکان وەک سەرۆک هۆز کاری کردووە.

١٠- حاخام باشی — لە ساڵی ١٩٠٩ وەک سەرۆک هۆز کاری کردووە.

١١- الیاهو سموحە الصائغ — لە ساڵی ١٨٨٩ مێژووی کارکردنییەتی.

١٢- حاخام باشی الیشاع — لە ساڵی ١٨٨٩ مێژووی کارکردنییەتی.

١٣- بنيامين حاخام موشى.
١٤- سلمان حوكى عبودى
١٥- يوشيع موشى
١٦- شلومو موشى تيادور
١٧- ساسون عزرا اسحق
١٨- الياهو شوع
١٩- داود عزرا مصفى
٢٠- يوسف الياهو ربيع
٢١- عزرا مردخاى
٢٢- الحاخام مردخاى — بەرپرسی هۆزەكان لە شاری حلله.
٢٣- موشى ابراهيم.
٢٤-سلمان حوكى
٢٥- روفائيل اسحق حيم

---

**سەرچاوە:**
**مختصر تاريخ الحضارات - طه باقر**
**نصف قرن فى حياتى. د. احمد سوسه**
**الدليل العراقى لعام ١٩٣٥- ١٩٣٦**
**تاريخ العراق بين احتلالين. عباس العزاوى**
**جريده الوقائع العراقيه ٣٤-٣٥**

دوای ئــەوەی (میر فەیســەڵی کوڕی ئەلحوســێن) وەکو پاشــای دەستووری بۆ عیراق هەڵبژێردرا، بۆ ئەم مەبەستە گەلی عیراق بەهەموو چیــن و توێژەکانیــەوە ئاهەنگیان گێــڕا. لەم ئاهەنگــەدا قوتابخانەی جەعفەری ئەهلی لە بەغدا و هۆزە مەسیحییە کاسۆلیکییەکان و (ئەرمەن و ئەرتۆزکس)ەکان بۆ ڕێزلێنان لە پاشــای عێراق بەشــداریان تێدا کرد، هەروەها لەم ئاهەنگەدا قوتابخانەی شــەرافەتی ئێرانیش بەشداریان تێدا هەبوو، بەڵام جوولەکەکان بەشــێوەیەکی جیاواز ئاهەنگیان بۆ بەڕێزیان گێڕاو، ئاهەنگەکەیان گەورەتر کرد و میریش خۆشــحاڵی خۆی! دەربڕی، بۆ وەسفکردنی ئەو ئاهەنگە لە دوو شوێن باسمان لێوەکردووە، یەکەمیان کتێبی (فیصل بن الحسین) کە لە ساڵی (١٩٤٥) بەڕێوەبەرایەتی پەخش و بڵاوکردنەوە دەریکردووە، وەســفکردنی دووەمیــش لە کتێبی (نزهه المشتاق فی تاریخ یهود العراق)دا هاتووە، لە نووسینی (یوسف غنیمه) یە، لە هەردوو شــوێنەکان وەسفکردنەکان جیاوازیان نەبووە، تەنیا ئەوە نەبێ کە (غنیمه) باسی ئەوەی کردووە کە گەورەی حاخامییەکان کاتێ کتێبی (تەوڕات)ی بۆ جەنابی پاشای بردووە پاشا ماچی کردووە، بەڵام لە کتێبی (فیصل بن الحسین) هیچ ئاماژەیەک بەماچکردنی کتێبی تەوڕات نــەدراوە لە لایەن پاشــاوە، هەرچۆنێک بێت پەیوەنــدی نێوان جەنابی مەلیک فەیسەڵ و جوولەکەکانی عێراق پتەو بووە، جێی وەبیرهێنانەوەیە کە خاوەنشکۆ وەک شوێنی نیشتەجێبوونی لە بەغدا هەریەک لە کۆشکی شەعشوع و کۆشــکی مناحیم دانیالی بۆ ماوەیەکی جیاواز بەکارهێناوە. ســەبارەت بەسەردانەکانیشــی بۆ ئینگلتــەرا بە درێژایــی مانەوەی لە کۆشــکی (الیعازر خضوري) دەمایەوە کە بەردەوام لەژێر هەڵســوکەوتی پادشــاو داروودەســتەکەی بووە، لێرەدا بۆ خوێنەرانی بەڕێزیش هەردوو وەسفکردنەکەی کە لە ئاهەنگەکەدا باسی لێوەکراوە و لەگەڵ ئەو وتارەی کە خاوەنشــکۆ بەبۆنەی یۆبیلی ئەلماسی لە ساڵی ١٩٢١ پێشکەشکراوە دەخەینەڕوو.

## وەسفکردنی ئاهەنگی هۆزی جوولەکەکان کە لە کتێبی (نزهه المشتاق فی تاریخ یهود العراق)دا هاتووە.

جوانتریـــن ڕووداو کـــە نووســـەر بۆ مێـــژووی جوولەکـــەی عێراقی نووســـیویەتییەوە، ئەو ئاهەنگە بەجۆشەی جوولەکەکان بوو کە لە بەغدا لە ١٩٢١/٧/١٨ وەک پێشـــوازییەک لە ئەمیر فەیســـەڵ بەبۆنەی بوونی بە پادشـــای عێراق سازکرا. هەر لەم ئاهەنگەدا پیاو ماقوڵان و زانایان و نووســـەرەکانی عێراق ئامادەی ببـــوون. تیایدا وتاری بەخێرهاتنی ئەمیر فەیسەڵی یەکەم خوێندرایە کە دەڵێ: (من المبادیء والدیمقراطیه المساواة ماکان اندی من زلال الماء علی الافئدة و من روح التســـاهل مارقصوا له القوم وطربوا) پاشـــان جوولەکەکان کتێبی تەوراتیان بۆ پادشـــا هێنا کە بەچوارچێوەیەکی ئاڵتونی نەخشێنرابوو.

### - وەسفکردنی ئەو ئاهەنگەی جوولەکەکان بۆ ڕێزلێگرتن

لە ئەمیر فەیســـەڵ سازیان کردبوو، لە کتێبی (فیصل بن الحسین)دا باسی لێوەکراوە.

لـــە ڕۆژی ١٩٢١/٧/١٨ جوولەکـــەکان لە خانـــەی حاخامییەکان لە بەغدا وەک ڕێزلێنان لە ئەمیر فەیســـەڵ ئاهەنگێکی گەورەیان ســـازکرد، هـــەر لەم ئاهەنگـــە جەماوەرێکی زۆر لە پیاو ماقوڵانـــی وڵات و گەورە فەرمانبەرانـــی حکومەتـــی بەریتانی ئامادەی ببوون، ئەو شوێنەشـــیان بەخشڵ ڕازاندبۆوە و لەسەر ئەو قەنەفەیەی کە لە پێشەوەی هۆڵەکە بۆ مەلیک فەیسەڵ دانرابوو ئاڵایەکی عەرەبییان لەسەر دانابوو، لە پەراوێزی ئاڵایەکە ئایەتێکی پیرۆزی تەوراتی لەسەر نووسرابوو، هەر لەم ئاهەنگەدا بەپێی دابونەریتی جوولەکەکان ڕێوڕەسمی گفت پێدان بۆ ئەمیر فەیسەڵ ڕێکخرا، ســـەرەڕای خوێندنەوەی چەندین وتار، گـــەورەی حاخامییەکان دانەیەک لەکتێبی تەوراتی بۆ مەلیک فەیســـەڵ هێنا کە لەنێو تابلۆیەکی برۆنزی دابوو ئایەتێکی تەوراتی لەســـەر نوســـرابوو (بارک یارب قوله، وارتضی بعمل یدیه، وحطم متون مقاومیه ومبغضیه حتی لایقوموا). ئەمە

وەکو پێشـــەکییەکی گفت پێدانی میللەت بوو بۆ پادشاکەیان، هەرچەندە ئەمـــە نەریتێکی خۆیانە کە جوولەکەکان ئەم ئایەتە لەســـەر تابلۆیەکی بەنرخ پێشەکەش بکەن، ئینجا گەورەی حاخامییەکانیش بەرێورەسمێکی ئایینی و بەپێی یاساو رێساکان تەوراتەکەیان بۆ پادشا دەرهێنا..

- وتاری ئەمیر فەیسەڵ لەم ئاهەنگەدا

زۆر سوپاســـی هاولاتیانـــی جوولەکـــە لە عیراقدا دەکـــەم کە وەک ئەندامێکی کارا دڵسۆزی خۆتان بەسازدانی ئەم ئاهەنگە نیشاندا، منیش داواکارم لـــە خودا کە لەم نیشـــتیمانەدا هەردەم لەجێی باوەڕو متمانەی ئێوەدابـــم، نەمدەویســـت کە گوێم لـــەوە بێت کە لەم ولاتـــەدا رەگەزی موســـڵمان و مەسیحی و ئیسرائیلی هەیە، لەبەرئەوەی ئەم ولاتە، ولاتی هەموو نەتەوەیە ولاتی عەرەب و ســـامییەکانە، هیـــچ جیاوازیەک لەنێو نەتەوەکاندا نیە، ئەوەی هەیە تەنیا دەبێت بگوترێت عیراق، ئەم جیاوازی ئایینیانە تەنها بۆ رەوشـــتی نەتەوەیی و بەرژەوەندی ئایینی و کاوباری ماددی بەکاردێت، خودای گەورەش هانی هیچ شـــتێکی نەداوە بەقەدەر ئەوەی پشتگیری لە پەیوەندی خۆشەویستی نێوان خەڵکیدا دەکات منیش داواکارم لـــە نەتەوەکەم کە تەنها عێراقـــی بن لەبەرئەوەی ئێمە بۆ یەک بنەچە دەگەڕێینەوە ئەویش رەگەزی ســـامییە و هیچ جیاوازیش لەنێوان موســـڵمان و مەسیحی و جوولەکەدا نییە، ئەم جیاوازییە کاری نەکردۆتە سەر ئایینەکان، بەڵکو گشتگیری کردۆتەوە، ئەگەر ئێمە وشەی مەسیحی و یەهودیمـــان دووبارەکـــردەوەو هەروەکو ئەوە وایـــە کە یەکێک بیەوێ پێش بکەوێ، بەلام هەر بەرەو دواوە بگەڕێتەوە، پێویســـت ناکات ئەوەی وتارخوێنـــەکان لەبارەی یەکگرتوویی وتویانە ئێمەش دیســـان دووبارەی بکەینـــەوە، چونکە خۆمان هەر لە سروشـــتەوە یەکگرتوین، یەک جۆرە خوێـــن لە رەگوڕیشـــەماندا هاتوچۆ دەکات، دەتوانیـــن بۆ بنیاتنانەوەی ولات و بەشارســـتانیکردنی هەموو دەست لەناو دەستی یەکتر بنێین. لە مێژووییەکی کۆندا وتارخوێن (یعقوب افندی) باس لەو یارمەتییانە دەکات،

که عەرەب بۆ جوولەکەکانی کردووە کاتێک رۆڵەکانی ئورشـــەلیم بەرەو بابـــل کۆچیانکرد، دەڵێم تەنها ئەم کارە نییە کە عەرەبەکان کردبێتیان، بەڵکو هـــەردوولا یارمەتیدەری یەکتر بوونە لە هەموو ئەو کارەســـات و رووداوە گەورانەی بەســـەر جوولەکەدا هاتووە، لە مێژووشدا رووداوی لەم جۆرانـــە زۆرن دەبـــێ ئەو وڵاتەی کە بەدەســـتی رۆژگار تێکدراوە، ئێمە بنیاتی بنێینەوە، چونکە لەم ســـەردەمە زێڕینەدا شـــەرمەزارییە کە بەم جۆرە جێی بهێڵن.

بۆ ئـــەوەی وڵاتەکەمـــان یەک ریزو یـــەک نەتەوە بێت و شـــارێکی یەکگرتوومـــان هەبێت دەبێت واز لە هەموو شـــتێک بهێنین، تاکو هەموو جیهان شانازیمان پێوە بکات وەک چۆن دوێنێ شانازییان پێوە دەکردین، لەم کاتەدا وتاری یەکێک لە گەورەترین پیاوی جیهان کە (مســـتر لوید جورج)ی ســـەرۆک وەزیرانـــی بەریتانیام وەبیرهاتـــەوە کە دەڵێ (ئێمە هاتوینەتە عێراق دەمانەوێ بیکەین بە (جنه عدن) هەرچەند لە رابردووش هەروابووە، بریقەی ئەم شـــارەش کە پێش هەزاران ساڵ هەیبوو دووبارە دەیگەڕێنینەوە بەپێی ئەم رێسایەش کارەکان دەکەین (کل من سار علی الدرب وصل) یەزدانی گەورەش بۆ تێکۆشان و سەربەرزی پیشتیوانمانە، هیوایەکی بەهێزمان هەیە بەســـەرکەوتنمان بەرامبەر بەگەورەترین وڵات کە ئینگلیزە، خۆشـــحاڵ دەبین ئەگەر گەنجەکانیشـــمان بە رێنماییەکان پابەند بن و لە داهاتوودا پشتگیری وڵات بکەن، هەروەکو چۆن پێشتریش نەوەکان پشـــتگیرییان لە وڵات کردووە، بێگومان جێگای شـــانازییە کە ئەم ســـەرکەوتنە بە چاوی خۆم ببینم، ئەگەر نەشیبینم ئەوا رۆڵەکانمان دەیبینن و بەشانازی دەژین و دەڵێن کە باوکەکانمان بناغەیەکی پتەویان بۆ داناویـــن. داواکارم لە خـــودا هەموو لایەکمان ســـەرکەوتوو بکات و هیواکانمان بهێنێتە دی.

مـــن بیر لە رێبازو ئایین ناکەمـــەوە تەنها یەک بیرۆکەم هەیە ئەویش سەرکەوتنی میللەتەو رێز لەوانە دەگرم کە کاروباری وڵات بەرز رادەگرن. هیواداریشم جوولەکەکان چالاکانە و راستگۆیانە بەکەڵکی ئەم وڵاتە بێن

و ولاتەکە بگەیەننە لوتکەی ئاشتی و سەربەرزی.

باسەکەمان هەموو لەسەر هاوسۆزی جوولەکە لەگەڵ مەلیک فەیسەڵ بوو دەبێ ئاماژە بەوەش بدەین کە لەگەڵ مەلیک غازی کوڕی مەلیک فەیسەڵ هاوسۆز بوونە، ئەوەبوو لە رۆژی دەستنیشانکردنی هاوسەری ژیانی شاندێکی هۆزی جوولەکە سەردانیان کردووەو بەم بۆنەیەوە پیرۆزبایی خۆیان ئاراستەکرد، هەواڵی هاوسەرگیرییەکەش لە لاپەڕە (١٧)ی رێبەری عێراقی ساڵی ١٩٣٥ بڵاوبۆتەوە.

## یادەوەرییەک دەربارەی هاوسەرگیری مەلیک غازی

بۆ پیرۆزباییکردنی مەلیک غازی شاندێک لە هۆزی جوولەکەکان سەردانی بەڕێزیان کرد و لەم سەردانەدا دیارییەکیان پێشکەشکرد، کە قتویەکی جگەرە بوو لە ئاڵتون دروستکرابوو. لە ناوەڕاستی قتوەکە ناوی جەنابیان تێدا نەخشێنرابوو، لە سەرەوەشی تاجێکی میری بە دوو گەڵاوە دەوردرابوو کە لە ئەڵماس دروستکرابوو، لە هەردوو لایەکەیدا دەقی ئەو درووده نووسرابوو کە خودای گەورە و مەزن بۆ بەڕێز (یعقوب) سەلامی خوای لێ بێ پیرۆزی کردبوو.

---

سەرچاوەکان:

- فیصل بن الحسین- مدیریه الدعایه والنشر ١٩٤٥
- نزهه المشتاق فی تاریخ الیهود- یوسف غنیمه.
- الدلیل العراقی لعام (١٩٣٥-١٩٣٦).

جووله‌كه‌كان له‌ سروشـــتدا شه‌یدای مادده‌ بوونه‌و، هه‌ر جۆرێک بوایه‌ كاریان له‌ســـه‌ر ئه‌وه‌ كردووه‌ كه‌ به‌ده‌ستی بهێنن له‌گه‌ڵ خه‌ڵكانی دیكه‌ی ناوچـــه‌كان جیاوازیان هه‌بووه‌، ئه‌ویـــش خۆپاگربووینه‌ و به‌كه‌میش رازی بوونه‌ و هاوســـۆزیان له‌گه‌ڵ نه‌ته‌وه‌كانی دیكه‌ هه‌بووه‌، هه‌روه‌ها له‌ پێناو به‌رزكردنه‌وه‌ی ئاستی بژێوی ژیانی هۆزه‌كانیان، جووله‌كه‌كان له‌ كاروباری بازرگانیدا درێژه‌ به‌كاره‌كانیان ده‌ده‌ن و له‌به‌ر زیره‌كی و هه‌ناسه‌ درێژیان له‌م بواره‌دا به‌ ئامانج و مه‌به‌سته‌كانیان ده‌گه‌ن.

له‌و كاتـــه‌ی كه‌ پێیان نایه‌ نێو خاكی عێراق خه‌می یه‌كه‌م و دواییان ده‌ست به‌ســـه‌ر داگرتنی بازرگانی ناوچه‌ ستراتیژییه‌كانی ئه‌و وڵاته‌ بوو، بـــۆ ئـــه‌وه‌ی هه‌رچی خێرو به‌ره‌كه‌تـــی هه‌بێ بـــۆ داهاتوویه‌كی نادیاری خۆیان هه‌ڵیمژن. بۆ ده‌ســـت پێكردن به‌ كاره‌كانیان خانه‌ی بزووتنه‌وه‌ی ره‌نجده‌رانیان دامه‌زراند و یه‌كه‌م نه‌خشه‌ بۆ كاروباری وڵات له‌ رێگه‌ی بانک و ژمێریاری بوو، شاره‌زایی خۆیان به‌رامبه‌ر به‌ فه‌رمانڕه‌واو ده‌سه‌ڵاتدران خسته‌ڕوو.

هه‌ندێ له‌و بانكانه‌ی كه‌ ناویان هاتووه‌ له‌وانه‌ بانكی (اولاد مراشوع) له‌ (تفر) (٤٠٠-٤٦٠ پ.ز) كه‌ زۆربه‌ی خاوه‌نه‌كانیان له‌ خێزانه‌ جووله‌كه‌كان بـــوو. هه‌روه‌ها خێزانێكی دیكه‌ی ناســـراو به‌نـــاوی (Eiqibi – ایكیبی) ناوبانگیـــان ده‌رچووبوو. ئه‌م نازناوه‌ش عێراقییه‌ و به‌مانای (له‌لای منه‌) دێت و سه‌نته‌ره‌كه‌شـــی له‌ شاری بابله‌و هه‌روه‌ها (ئیمام عه‌لی) (س.خ) دراو گۆڕێكی تایبه‌ت بۆ خۆی له‌ شێخ ئیسحاق قارونی داواكرد. له‌ ساڵی ١٥٣٤ كاتێ سوڵتان ســـلێمانی یه‌كه‌م به‌غدای داگیركرد له‌و سه‌رده‌مه‌دا كاروبـــاری جوله‌كه‌كان زۆر خراپ بوو و ژماره‌یان چڕ ببۆوه‌و باری دارایی و ئایینییان تێكچووبوو و هیـــچ كارێكیان له‌و وڵاته‌دا نه‌مابوو، به‌ڵگه‌ش ئه‌و باره‌ داراییه‌بوو كه‌ تێی كه‌وتبوون، هه‌ر بۆ ئه‌و مه‌به‌ســـته‌ (رۆســـۆ) له‌ ســـه‌ره‌تای سه‌ده‌ی نۆزده‌دا نووسیویه‌تی و ده‌ڵێ: له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی باری سیاســـی و ئاوه‌دانی جووله‌كه‌كان زۆر داڕوخا بوو، كه‌چی ده‌چوونه‌ نێو كۆشک و گومرگ و ماڵی پیاو ماقوڵان، بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌و كه‌سوكارانه‌یان كه‌

لە شـــاری بەسرەو و لە جۆرەها بازرگانی شارەزاییان هەیە بیاندۆزنەوە. لە ســـاڵی ١٨١٧ کۆچبەری ئینگلیزی (رجمنت) لەسەر هەندێ کاروباری بازرگانـــی و ئابـــووری جولەکەکانی نووســـیوە ئەوە دەســـەلمێنن کە بازرگانیەکانیان و زۆربەی ئەو ســـامانەی دەستیان دەکەوێ بۆ گیرفانی فەرمانڕەوا عوســـمانییەکان و گەورە فەرمانبەرانی وڵات دەڕوات، کەچی ئێمەش دەبینین کە دەسەڵاتدارەکانی عوسمانی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات جولەکەکانی کردووە بە راوێژکار و زۆربەشـــیان پلەی ژمێریارییان پێدراوە. لە (١٨١٧/٢/٢٢) دابوو. یەکێ لە دیارترین ئەو فەرمانڕەوایانە (داود پاشا) بوو کە هاتۆتە نێو بەغدا و (ئیسحاق یەهودی) کە سەرۆکی ژمێریاران بوو بۆ کاروبارەکانی خۆی بەکاریهێناوە هەر لەسەردەمی (داود پاشـــا) رووداوێک رووبەڕووی کۆمەڵێک بازرگان هات لەوانەش (خواجە داود ساســـاون) بوو کە بەکەشـــتیەکی چارۆگەدار بـــەرەو بەغدا رایکرد پاشـــان بەرەو بەســـرەو لەوێشـــەوە بەرێگەی دەریاوە بەرەو هیندستان رۆیشـــت تاگەیشـــتە ئەوروپا. کاری بازرگانی کرد و ئێجگار دەوڵەمەند بوو. تا سەرەتای سەدەی بیستەمیش نەوەکانی کاری بازرگانیان دەکرد و کۆمپانیایەکیـــان لە لەندەن بەناوی کۆمپانیای (ساســـون) دامەزراند، لە نەوەکانیشـــی (حســـقیل ناجی- پارێزەر)، (انور شاؤول- پارێزەر) گرێبەســـتەکانی بازرگانیـــان لە بەغدا فراوان بـــوو و هەروەها کاروباری دارایشیان رووی لە گەشەسەندن کرد.

ئەوەی زیاتر پشتیان پێ دەبەست ئەو پەیوەندییەی کە لەسەردەمی عوســـمانی لەگەڵ فەرمانڕەوا هەیان بوو، بەڵام ئەو زوڵمەشمان دەبینی کە لە ئەنجامی خۆبەدەستەوە نەدانیان بۆ دەسەڵاتی عوسمانی تووشیان هاتبوو، کاتێ بە رێگەی ناشەرعی هەوڵی سەرانەکردنی پارەو پولەکانیان دەدان.

لە ســـاڵی ١٩١٣ ســـوپای عوســـمانی نوشســـتی هێنا و لە جەنگی یەکەمـــی جیهانـــی حکوومەت بڕیـــاری دەرکردنی دراوێکـــی دەرکرد و بازرگانەکانی ناچارکرد کە هەرچـــی لیرەو زێڕیان هەیە بە لیرەی کاغەز

بیگۆڕنەوە و هەموو مانگێکیش پێوانەیەکی بۆ بازرگانەکان دەخستە کار.
هەروەها حکوومەت کۆمەڵێک لە بازرگانە جولەکەکانی دەستگیرکرد و فەرمانڕەوا (حسین جلال بگ) بڕیاری بەندکردنیانیدا کە دوای ئەوەی ناچاری کردن کە دراوەکانیان بگۆڕنەوە و تۆمەتی بۆ دروستکردن و بەنهێنی پەنگی پێدان و کۆمەڵێک لەوانەشی خستە ژێر ئەشکەنجەیەکی توندو تەرمەکانیانی خستە نێو تورەکەیەک و فڕێیدانە نێو رووباری دیجلە. (یوسف غنیمە) دەڵێ: هەرچەندە لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا عوسمانییەکان ستەمێکی زۆریان لە جولەکەکان دەکرد. بەڵام ئەوان لە بازرگانیدا خۆیان سەرکاربوون و قازانجێکی زۆریان لەم بوارەدا دەست دەکەوت و زۆربەشیان دەوڵەمەند بوون لەبەرئەوەی کەلوپەلێکی زۆریان لە کۆگاکانیان هەڵگرتبوو و نرخەکانیشیان لە بەرزبوونەوە دابوو.

لە ساڵی ۱۹۱۰ لە کۆتایی سەردەمی عوسمانییەکان ژووری بازرگانی بەغدایان دامەزراند، سەرپەرشتیارەکانیشیان بریتی بوون لە بەڕێز (مدکوریان) کە بەڕێوەبەری بانکی عوسمانی بوو وەکو سەرۆک دانرا و بەڕێز (شائول معلم حسقیل) وەکو جێگر و ئەندامەکانیش لە بەڕێزان (یاسین الخضیری و شائول شعشوع و یهوذا زلوف محمود الاطرقضی و عبدالحمید حمودی و ابراهیم حییم معلم پێکهاتبوون و شەش لەم ئەندامانە جوولەکە بوون.

لەساڵی ۱۹۱۵ بڕیاری دوورخستنەوەی ٦٥ کەس کە لە جۆرەها ئایین بوون بەرەو (دەرسیم) درا، بەڵام پاشان بڕیاری لێبوردنیان بۆ دەرکرا زۆربەشیان جوولەکەبوون لە نێوانیاندا (حسقیل طویق و ابراهیم حییم و سلمان عنبر وئیسحاق و براکانی و چەندانی دیکە بوون).

دوای کۆتایی هێنان بە جەنگی یەکەمی جیهانی و لە ماوەی داگیرکاری بەریتانیا بۆ سەر عێراق جوولەکەکان هەناسەیەکیان هەڵکێشا و باری دەروونیان جێگیربوو. هەر لە نێو داگیرکەرانی بەریتانیا کەسێکی یارمەتیدەریان دۆزییەوە کە بۆ بەجێهێنانی خزمەتگوزاری لەگەڵیدا پێشبڕکێیان دەکرد وا هەستیان دەکرد کە ئەوە ئەرکێکی نیشتمانییە و

له زۆربەی بۆنەکان پاڵپشـــتی پرۆژەکانی دەســـەڵاتیان دەکرد. لێرەدا و له خشـــتیەک ناوی ئەو کەسانە هێنراوه که بۆ کۆمەڵەی خاچی سووری بەریتانی بەخشینیان داوه.

١- الیاهو بیرص ٢٥٠ روپیە.
٢- داود دبی ٢٥٠ روپیە
٣- لەنووسینگەی هەرەوەزی ١٨٤ روپیە
٤- یوسف داود - ١٥٠ روپیە
٥- روبین و سلمان ایلیا شائول: ١٥٠ روپیە
٦- عزیز بیخور ١٠٠ روپیە
٧- نسیم یهوذا ١٠٠ روپیە
٨- ساسون جمال ١٠٠ روپیە
٩- سلمان زلوف ١٠٠ وپیە
١٠- ابراهیم خزوم ٥٠ روپیە
١١- عبودی شمطوب ٥٠ روپیە

لەگەڵ هاتنی شا فەیسەڵ بۆ عێراق هۆزی جوولەکەکانیش بەشداریان لەو ئاهەنگە کرد کە بۆ رێزلێنانی شا سازکرابوو تیایدا دانەیەک تەوراتیان پێشکەشـــکرد کە لە نێو بەرگێکی ئاڵتونی دانرابوو و بەرێزیشیان ماچی کرد.

پـــاش دامەزرانـــدن و جێگیربوونی میرنشـــینی عێراق ســـەرلەنوێ جولەکـــەکان چالاکی بازرگانی یان دەســـتپێکردەوە و توانیان بێنە نێو زۆربەی فەرمانگەکانی دەوڵەت و زۆربەشـــیان لە کاروباری ژمێریاری و گۆڕینـــەوەی دراو لە بانکەکان کاریان دەکـــرد لە رۆژی ١٩٢٦/٩/١٨ لە سەردەمی مەلیکدا دەست بە هەڵبژاردنی یەکەم ژووری بازرگانی لە بەغدا کرا و ئەنجامی هەڵبژاردنەکەش بەم جۆرە بوو:

| ناو | رەگەز | دەنگەکان |
|---|---|---|
| ١- الحاج محمود الاطرقچي | ئێرانی - موسڵمان | ٤٥ دەنگ |
| ٢- المستر رایف | ئینگلیزی | ٤٣ دەنگ |
| ٣- قاسم الخضیری | عێراقی - موسڵمان | ٤٠ دەنگ |
| ٤- المستر باشی | ئینگلیزی | ٣٧ دەنگ |
| ٥- یعقوب یوسف عانی | عێراقی - جوولەکە | ٣٢ دەنگ |
| ٦- یهوذا زلوف | عێراقی- جوولەکە | ٣٠ دەنگ |
| ٧- نوری فتاح | عێراقی - موسڵمان | ٢٩ دەنگ |
| ٨- عبدالمجید حمودی | عێراقی - موسڵمان | ٢٩ دەنگ |
| ٩- میرزا فرج | عێراقی - موسڵمان | ٢٨ دەنگ |
| ١٠- خضوري شماش | عێراقی - جوولەکە | ٢٨ جولەکە |
| ١١- المستر تیل داود سلمان | ئینگلیزی - جوولەکە | ٢٧ دەنگ |
| ١٢- صیون عبادی | عێراق - جوولەکە | ٢٦ دەنگ |
| ١٣- کرجی عبود مکمل | عێراق - جوولەکە | ٢٥ دەنگ |
| ١٤- الیاهو عانی | عێراقی - جوولەکە | ٢٤ دەنگ |

**لە ٤/١٠ و لەگەڵ بەستنی یەکەم کۆبوونەوە لە دیوانی وەزارەتدا دەست بە هەڵبژاردنی ئەندامەکان کرا. بەڕێز (مستر وایت) بەڕێوەبەری بانکی شاهی بە (١٣) دەنگ وەک سەرۆک هەڵبژێردرا و دووەم (قاسم باشا الخضیری) (١٢) دەنگ و (الکتوم الخواجە الیاهو) ١٢ دەنگ هەرچەندە رێژەی ئەندامەکانی جوولەکە لە یەکەم پێکهاتەی ژووری بازرگانی لە بەغدا (٥٠٪) بوو، بەڵام ئەو رێژەیە لە خولی شەشەمی ٩٣٥-٩٤٥ بەرزبووەوە لە نێو (٢٠) ئەندام (١٢) یان جوولەکە بوون ئەوانیش (حسقیل داود شمعون - خضور مراد شکر - خضوري میرشلاوی - رحمن نسیم مصری - شانول منشی میرشعشوع - صالح الیشع ساسون - صیون شلوموعبودی - عزرا الیاهو العانی - یامین موشی شاشا - یوسف کاسیر - (سکرتیر) سعید یعرب.**

پاشان روویان لە هەموو جۆرە بازرگانیەک و مامەڵە پێکردنی جۆرەها دراو کرد دەسـتکرا بە دامەزراندنی ئـەو کۆمپانیانەی کە پەیوەندییەکی بەهێزیان لەگـەڵ کۆمپانیاکانی دەرەوە هەبوو یەکێک لەو کۆمپیانیانەی کە باسـکراوە کۆمپانیای (ابراهیم وشـفیق عدس) بوو کە بریکاری چل کۆمپانیای جیهانی بوو. لە دەسـتپێکی هەموویانەوە کۆمپانیای (فۆرد) ی ئۆتۆمبیـل و هەروەها لـۆری و تراکتۆرو فرۆکە بوو، تا دەگەیشـتە کۆمپانیـای (AczdbofA ) کـە بەرهەمهێنەری ماکینەی کشـتوکاڵی و دەراسـە و هەوجار بوو کۆتایی پێدەهات، جوولەکەکان هیچ جۆرێک لە جۆرەکانـی کەلوپەلی ناوخۆیی و هاوردەیان نەهێشـتبوو مامەڵەیان پێ نەکردبـێ بگرە لـە دارو تەختە داودەرمان تا دەگاتـە چەک و بۆیاخ و قوماش کە بەشێوەیەکی سەرنج راکێشانە کاریان تێداکردووە.

دەبینیـن لە کـۆی (٦٣) بازرگانی هاوردەی قومـاش کە ناویان لە رێبەری عێراقی سـاڵی ١٩٣٦دا هاتووە (٥٥) یان جوولەکە بوون و هەر بەم شـێوەیە بازرگانەکانی بۆڕی و پاشـکۆکانی (١٣) بازرگان ناویان هاتـووە (١٠) بازرگانیان جوولەکەن. بەم جـۆرە بازاڕەکانی عێراقیان کۆنتـرۆڵ کردبوو، بەو شـێوەیەی کە بیانویسـتبایە ئابووری عێراقیان بەڕێوە دەبرد، بەڵام لە ساڵی ١٩٤١ بزووتنەوەی (رەشید عالی گەیلانی) یەکەم تێکشـکانی جوولەکەکانی تۆمارکرد، ئەویش کە لە هەردوو رۆژی (١-٢/٦/١٩٤١) هەرچـی بازرگانیەتی و ماڵ و پـارەو دراوی بە نرخ و زێڕیان هەبوو تووشـی تاڵانکـردن هاتن. لەو کاتەوە بـارو زروفیان لە کۆمەڵگـەی عێراقی بـەرەو چڕبوونە چوو و ناچارکران کە دەسـت بە کۆچکـردن بکەن و بەشـێکیان بۆ وڵاتانی دەرەوە رۆیشـتن و هەرگیز نەگەڕانەوە.

هەر لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم زۆربەی جولەکەکان بۆ کارکردن روویان لە فەرمانگەکانی دەوڵەت کرد و پشـکی شـێریان لە وەزارەتی دارایی بەرکەوت. ئەوەبوو کە (ساسـون حسـقیل) بۆ پێنج جار پلەی وەزیری دارایـی وەرگرت و لە گەورە فەرمانبەرانـی وەزارەتی داراییش

(خضوري عزره) بەڕێوەبەری دارایی و بودجە و (عزیز سامی- بەڕێوەبەری پەڕاو) (موشـــی سوفیر- بەڕێوەبەری باجی دەرامەت) و (داود خضوري - یاریـــدەدەری بەڕێوەبەری گومرگەکان لە وەزارەتەکانی دیکە، هەروەها زۆربـــەی بەڕێوەبەری فەرمانگەکان ئـــەوەی پەیوەندییان بە ژمێریاری و کاروباری دارایی هەبوو دەســـتیان بەســـەر داگرتبوو لەوانەش (نەقیب ســـیماقە شالوم- ژمێریاری سوپا) (داود منشی- بەڕێوەبەری ژمێریاری پۆلیـــس) (ابراهیم الکبیر) وەکو بەڕێوەبـــەری ژمێریاری بەڕێوەبەرایەتی هێڵـــی ئاســـنینی عێراقی بەوەکالەت کاری دەکرد و (موشـــی شوحیط) ژمێریاری خەرجیەکان بوو.

لە دوای جەنگی فەلەســـتین لە فەرمانگەکانی دەوڵەت ژمارەیان چڕ ببۆوە. هەندێکیان خانەشـــین کران و ڕەزامەندیش لەســـەر دامەزراندنی تـــازە لە فەرمانگەکانی دەوڵەت نەدرا. بەم شـــێوەیە ئەو لاپەڕەیەش لە لاپەڕەکانی جوولەکەکانی عێراق کۆتایی پێهات کە بەهەســـتیار ترینیان دەژمێردرێت.

---


سەرچاوە:

- جریده العرب ١٩١٨
- مجله لغه العرب مشنورات الاب انستاس الکرملی
- فیصل بن الحسین مدیریة الرعایة و النشر
- الدلیل العراقیه الرسمی ١٩٣٦.
- تاریخ الوزارات العراقیة السید عبدالرزاق الحسنی
- نزهه المشتاق فی تاریخ یهود العراق یوسف غنیمه
- تاریخ العراق بین احتلالین عباس العزاوی

بۆ ئـــەوەی بتوانین زیاتر لـــەم لێکۆڵینەوەیەدا ســـوودمەند بین، وا پێویســـت دەکات کە باس لە شـــوێنە پیرۆزەکانی جوولەکە لە عێراقدا بکەین، بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیەش هیچ کەســـێک پێش نووســـەر (یوسف غنیمە) نەکەوتووە لە میانەی کتێبە بەناوبانگەکەی (نزهە المشـــتاق فی تاریـــخ یهود العراق) کە لە ســـاڵی ١٩٢٤ دەریکردووە. ئەویش کتێبێکی دەگمەنە و تەنها چەند دانەیەکـــی هەیە، یەکێکیان لەلای خانەوادەکەی نووســـەر خۆیەتی. بەبێ هیچ دەستکارییەک و بەپێی ئەسپاردەی مێژوو هەرچی دەربارەی ژیانی ئەو هۆزە هەیە لەم کتێبەدا نووسراوەتەوە. بەو هیوایەین کە ئەو زانیاریانەی لەو کتێبەدا هاتووە سوود بە لێکۆڵینەران و توێژەران بگەیەنێت ســـەبارەت بەو خەڵکانەی کە پێش هەزاران ساڵ لەو وڵاتەی ئێمەدا ژیاون. لە عێراقدا جوولەکەکان شـــوێنی پیرۆزی دێرینیان هەیە کە خەڵکەکانیان لە دەوروبەری عێراق و کوردستان و وڵاتی فارس وەک نەریتێـــک بۆ پیرۆزکردنی و پاڕانەوە لە پێغەمبەران و پیاوچاکانیان ســـەردانیان دەکـــەن. بەناوبانگترین مەزارگەکانـــی جوولەکە لە عێراقدا ئەمانەن:

١- گۆڕی (عزرا الکاهن).
٢- حزقیال النبی او الکفل.
٣- خەوگەی (مرقد) یوشع کوهین کاوول
٤- خەوگەی (شێخ اسحاق القاوونی).
٥- گۆڕی (ناحوم الألقوشی).

**١- گۆڕی (عزرا الکاتب او العزیر):**

پەیمانگەیەکی ئایینی جوولەکەکانە دەکەوێتە سەر لای راستی رووباری دیجلەنێـــوان قرنە و عەممـــارە، بە نزیکایی (٢٢) میل بۆ گەیشـــتن بە رافیدەین، شوێنێکی دوورە جەنجاڵی خەڵکە، زۆنگاوی زۆرە و قامیش و زەلیشی لێ دەستدەکەوێت، رووباری دیجلەش بەشێوەیەکی پێچاوپێچی و

لوولداری دەڕوات هەرچی یادگاری مێژوو هەیە لەگەڵ خۆی هەڵیدەگرێ. رای مێژوونووسان لەسەر مردن و شوێنی ناشتنی ئەو پیاوچاکە جیاوازە، هەندێک دەڵێن لە کارەکانی نابلس لە (عورتا) نێژراوە، هەندێکیشـــیان دەڵێن لەو کاتەی بۆ وڵاتی فارس سەفەری کردووە گۆڕەکەی لە (زمزومو) لە خوارووی دیجلەیە، و هەندێکیش دەڵێن لە ئورشەلیم نێژراوە، لەوانەیە ئەو روونکردنەوەیە لەڕاستییەوە نزیک بێت، بەڵام نەریتەکانی جوولەکەو ســـەردانیکردنیان بۆ ئەو گۆڕە ئاماژە بەوە دەکەن گۆڕەکەی لە عێراقە، ئێمـــە هیچ بەڵگەیەک بۆ ئـــەو مێژووە کۆنە ناچەســـپێنین، بەڵکو ئەو بایەخە بۆ شوێنەوارناســـە تایبەتەکان و توێژەرەکان جێدەهێڵێن، رەنگە یەکێکیان بگەنە راســـتییەکەی. مەبەســـتمان لە نووســـینی ئەو بەشە ئەوەیـــە کە باس لە کۆنترین مەزارگەکانـــی جوولەکە لە عێراقدا بگەین. (یاقـــوت) لە فەرهەنگی وڵاتـــان باس لە کارەکانی نابلس و بەســـرەی عێراق لە هەردوو ماددەی (میســـان و رووباری سمرە)دا دەکات، لێرەدا باس لە هەردووکیان دەکەین، لە بابەتی (میســـان) داهاتووە کە لە ناوی هەرێمێکـــی فراوانی گەورەیە گوند و دارخورمـــای زۆری لێیە، دەکەوێتە نێوان بەســـرەو ناوەڕاستی میســـان ئەم هەرێمە گوندێکی لێیە کە گۆڕی (عزراس. خ) لێیە و لە ماددەی رووباری (سمرە)دا گوندی گۆڕی (العزیز النبی- س.خ) لە زەوی میســـاندا ناوی هاتووەو (القزوین) کە پیاوێکی سەدەی سێزدەهەم بوو دیمەنێکی (النبی) بۆ مەسیح باس دەکات کاتێ کە (النبی) قسەکانی یاقوت کە لە کتێبی (شوێنەواری وڵاتدا) نووسراوە پیـــت بەپیت دووبارەی دەکاتەوە و لە ســـەدەی یازدەهەم کۆچەر یاخود گەشتیار (بنیامین النطیلی) سەردانی ئەو شوێنەی کردووە، بەڵام ئەوەی جێگای داخ بوو لەکاتی بڵاوبوونەوەی هەواڵی گەشـــتەکەی ناوی شوێنی مەزارگەکە پەڕیبوو بەم شـــێوە نووســـراوبوو، کە دەڵێ: (گۆڕی (عزرا) ی نهێنی زان و نووسەر کەوتۆتە...). جوولەکەکان لە رۆژانی جەژندا بۆ نوێژکردن دەچنە ســـەر گۆڕەکەی، لە ســـاڵی، ١٣١٧ز واتە لە سەرەتای سەدەی ســـیانزەهەم (یهوذا الحزیری) ســـەردانی ئەو گۆڕەی کردووە،

لە گەشـــتەکەیدا باســـی لێوەدەکات کە وڵاتی ئیسپانیای جێهێشتووە و بەرێگای رووبارەوە بەرەو وڵاتی کلدان نزیک شیرین رۆیشتووە و لەوانەیە لەو شـــوێنەوە نزیک بووە کە پێی دەڵێن (سمرا)و رەنگە راستییەکەشی (رووباری ســـمرە) بێت. بە زمانی جوولەکەیی واتە (اهوا). دوورییەکەی نزیکەی سێ (فەرسەخە) واتە (٩ میل)، ئەو گۆڕی (عزرا)یە لە سەردەمی یەکەمـــەوە، واتە لەگـــەڵ دامەزراندنی هەیکەلـــی دووەم هەیە. لە پێش (١٦٠) ســـاڵدا لە خەڵکانێکی زۆر زانیمان کە یەکێک لە شوانەکان باسی ئـــەو گۆڕەی کردووە کە چەند جارێـــک هاتۆتە خەونی، هەر لە خەونیدا توانیویەتی چارەسەری بۆ چاوەکانی بکات و رووناکی بۆ بگەڕێنێتەوە، بەم شـــێوەیە شوانەکە خەڵکی ناوچەکەی کۆکردۆتەوەو باسی چاکبوونەوەی چاوەکانی خۆی بۆ کردوون و داوای لێکردوون کە شوێنەکە هەڵبکەنن و باوەڕ بە قسەکانی بکەن، زەوییەکەیان هەڵکەنی و سندووقێکی ئاسنیان دۆزییەوە کە لە ناو تابووتێکی دیکە دانرابوو لەسەریشـــی نووســـراوێک هەبوو، کەســـیان نەیانتوانی بیخوێننەوە، بـــەڵام دوایی یەک لە زانایانی جوولەکە هات و دوای تۆز لەســـەر لادانی توانـــی بیخوێنێتەوە کە ناوی (عزرا و باب و باپیرانی) لەســـەر نووسرابوو تا دەگاتە ناوی (هارون)ی نهێنی زان. زۆرجار لەســـەر گۆڕەکـــەی ئاگر دەبینرا کە گۆڕی حەوت لە پیاوچاکانیشـــی لە دەوروبەر بوو، زۆر لە زانا و بلیمەتەکان هەوڵیانداوە کە ئەمە سەرســـوڕهێنەرە و لەوانەیە رووداوێکی ســـەیری رووداوەکانی زەویناســـی بێت یان تەقینەوەیەکی زەوییە لە ئاگردانێکەوە دەردەپەڕی، یان کانییەکە لە شەڕدا ئاگرەکەی بەهێز دەبێت، من ئەم رووداوە سەیرەم بەچاوی خۆم بینی و لەلای خۆمدا تۆمارم کرد. لەســـەرەتای ســـەدەیی نۆزدەهەم (ریچ – Rich) باس لەو گۆڕە دەکات کە وەکو مزگەوتێک وایەو دەکەوێتە ســـەر رووباری دیجلە، لە دەوروبەری ئەو شوێنەی دانیشتوانی عەرەبی لێیە کە خانووەکانیان لە قامیش دروستکراوە. بەرەو لای گۆڕەکە رۆیشتین، دەورووبەری بە خشتی سەوز دەوردرابوو شێوەیەکی بریقەداری هەبوو دوای ئەوەی دەرگامان کردەوە گۆڕەپانێکی بچووکمان بینی، پاشان

گەیشتینە هۆڵێکی فراوانی تاریکی دووقات کە بەستوونی چوارگۆشەیی کە لە خشتی سوور دروستکرابوو وەستێنرابوو، هەمووشی رازاندرابۆوە، هەر لەوێ دەرگایەکی نزم هەبوو کردمانەوە و بەرەو ژوورێکی دیکە چووین کە شوێنی رێزگرتنی ئایینی جوولەکەکان بوو، لە بنمیچی ژوورەکە پەنجەرەی بچووک بچووک هەبوو کە بە ئاسن تۆردرابوو، و ژوورەکەش بەخشتی سپی و سەوز خشترێژ کرابوو لە سووچێکیش چرایەکی داگیرساو هەبوو. (ئەو گۆڕە لە ناوەڕاستی ژووەرەکە دانرابوو شێوەکەی لاکێشەییە و سەرەوەی لارە، لە دار دروســتکراوەو بە قوماشــێکی مەخمەلی سەوز داپۆشرابوو درێژییەکەی (٨ پێیە) و پانییەکەی (٤ پێیە) و بەرزییەکەی (٦ پێیە) لەنێوان ئەوو هەر لایەکی ژوورەکە (٣ پێیە). بەرزی سوچەکانی بە تۆپی مســی زەردی ئاوزێڕ رازاندرابۆوە. (العرابی) پێی راگەیاندین کە ئەوەی ئەو بینایەی دروســتکردووە پێش ٣٠ ســاڵ پێش ئێســتا ئەوە (خۆی یعقوب Kwop Yacoub) بووە، لەوانەیە نووســەر مەبەســتی ئەوەبوو بڵــێ کە (خوجە یعقوب یان خلفە یعقوب) بووە. گەشــتیار (بنیامینی دووەم) بەشــێوەیەک وەسفی ئەو شوێنە دەکات دەڵێ: دەکەوێتە کەنار رووباری دیجلە لە خانوویەکی چوارگۆشە پێکهاتووە لەناوەڕاستیدا گۆڕی (العزین) هەیەو لە چواردەوری خانووەکە چەندین خانووی بچووک هەیەو نووســەریش خانووەکەی وا وەســف کردووە کە لە دوو ژووری گەورەی بەهێز پێکهاتبوو، یەکەمیان تایبەت بوو بە موســڵمانەکان ئەوی دیکەش گۆڕی جوولەکە بوو لە دەرگاکەوەش تیشکی رووناکییەک دەهاتە ژوورەوە کە هەورێکی رەشــی دەبڕی، هەروەها ســەکۆیەکی هەبوو بە درێژی ٩ پــێ و بەرزییەکەی ١٠ پــێ و پانییەکەی ٦ پێ. لە چواردەورەکەشــی چەنــد کتێبێک دانراون کە بەقوماشــی بەنرخ و بەزێڕ رازاوەتەوە. گۆڕی عــزرا بابەتــی لێکۆڵینەوەکەی من بوو بەڵام کتێبەکــە باس لە مردن و شوێنی ناشتنی ناکات، بۆیە کەوتمە گومان لەڕاستی ئەو رووداوە، لەگەڵ ئەوەشــدا بەخوێندنەوەی کتێبی (سدر هدروت) و چەندین کتێبی دیکەی مێژوویی دڵنیابووم کە ئاماژە بە شــوێنی ناشــتنەکەی نەدراوە و منیش

پابەند بووم بە نەریتەکەی و تا لێکۆڵینەوەیەکی باش نەکەم نەوەستم. کۆمەڵێک لە جوولەکەی بەغدا و بەسرە بۆ جەژنی هەفتەکان (شبیعوت) لەسەر گۆڕی عزرا ئاهەنگ دەگێڕن، وا ناسراوە کە عەرەبەکان ئەو جۆرە سەردانانەیان لا خۆشە و هیچ کۆسپێک دروست ناکرن. نووسەری ئەم بابەتە دەڵێ: لە ساڵی ١٨٩٣ سەردانی ئەو گۆڕەم کردووە و بینیومە کە لە هەموو لایەکی عێراق بۆ جەژنی هەفتەکان (عید الاسابیع) جوولەکەکان سەردانی گۆڕی ئەو پیاوچاکە دەکەن و بۆ پیرۆزی شوێنەکە بەپێی پەتی دەچنە ژوورەوە و بۆ رێزگرتن لە مردووەکە چرا دادەگیرسێنن و بەدەوری گۆڕەکە دەسوڕێنەوە و شیرینی دەبەخشن، بەشەکانی ئەو بینایە چەندین ژووری تێدایە، ئەویش بۆ ئەو میوانانەی کە سەردانی ئەو شوێنە دەکەن و لەوێ دەمێننەوە، بەڵام دوایی چەند ساڵێک بۆ سەردانیکردنم بۆ ئەو گۆڕە هەواڵی ئەوەم زانی کە بەهۆی دارمانی ئەو شوێنە چەندین میوان گیانیان لەدەستداوە و کارەساتەکە خەڵکەکەی خەمبار کردووە، بەڵام کۆمەڵێک لە جوولەکەکان سەرلەنوێ نۆژەنیان کردۆتەوە. لە بەهاری ساڵی ١٩١٥ شەڕێک لەنێوان بەریتانییەکان و تورکەکان پەیدابوو، بەڵام هیچ زیانێک بەم شوێنە نەکەوتەوە تەنها ئەوە نەبێت لە ماوەی شەڕەکەدا جوولەکەکان نەیانتوانییوە سەردانی ئەو گۆڕە بکەن. ساڵ بەدوایی ساڵ گەشتیارو کۆچەرەکان لەسەر پێشکەوتنی ئەو شوێنە نووسیویانە، دوا نووسراو کە بۆ خوێنەر بەر دەست کەوتووە ئەو وەسفکردنەیە کە لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٧ لە گۆڤارێکی ئینگلیزی بڵاوکراوەتەوە، تیایدا نووسەر دەڵێ: (١) رووبەری ژوورەکە دەگاتە (٣٠) پێ و چوارگۆشەیە، دیوارەکانی سپییە و بە نووسین و نەخشی عەرەبی رازاوەتەوە. (٢) بە بۆیەی شینی کاڵ و زەرد و سوور رەنگکراوە و سەرنجڕاکێشە، زەوییەکەشی بە مەرمەری رەنگاوڕەنگ دروستکراوە و لە سووچەکانیدا چوارگۆشەی بچووک کە لە بەردی رەش یان مەرمەڕ دانراوە. (٣) لە ناوەڕاستی ژوورەکەش گۆڕەکەی لێیە کە رووبەرەکەی ٥ فی٧ فی ١٥ پێیە.

٢- گــۆڕی پێغەمبەر (حســقیال- یان- الکفل) لە شــاری (حللە) بەدووریــی (٢٠ میــل) گونــدی (الکفل) دەبینین کە گــۆڕی پێغەمبەر (حســقیال)ی لێیە. ناوەکەی لە لای عەرەبەکان (الکفل)ـە ئەم ناوە لە (الفرقان) هاتووە کە دەڵێ (واذکر اســماعیل والیســع وذالکفل وکل من الإخبار)ســورەتی (ص) ئەو ئایەتەش کە دەڵێ: (واسمعیل وادریس وذا الکفل وکل من الصابرین) لە سورەتی (الأنبیاء) بۆیە پێی دەڵێن (کەفل) واتە دەســتەبەر، لەبەرئەوەی دەســتەبەری میللەتی ئیسرایلییەکان بوو لــە رزگاربوون لە بەدیل گیــرە بابلییەکان. بەڵام دەڵێن گوندی (کەفل)ی ئێســتا دەکەوێتە شــاری بلاشــکر (Volog asies) لە ساڵی (٦٠)ی دوای مەســیح یــەک لە میرەکانی (الفرثیــن)ە ئاوەدانی کردووەو بۆ هێنانی بەهارات و کەلوپەل لەدەوروبەری هیندو شــام و ئاسیای بچووک. خواپەرســت (ابیقانوس) دەڵێ: کوشــتنی (حزقیال) لەســەر دەستی ســەرۆکی نەتەوەی جولەکەکان بوو (گوایە رقی لە پێغەمبەر هەڵساوە چونکە گاڵتەی پێکردووە، دواتر لەو ئەشــکەوتەی ناشــتووە کە (سام) و (ارفخشــاد)ی باپیرانی ئیبراهیمی تێیدا نێژراون. زانایان و گەڕۆکەکان ئامــاژە بۆ ئەو گۆڕە دەدەن کە لەنێوان فورات و خاپورە. لە ســەدەی دوانزەدا (بنیامین التطبلی) ســەردانی کردووە دەڵێ: گۆڕەکەی لە نزیک ئاوی فوراتە، لە پێشەوەی کەنیسەکەدا شەست تاوەر هەیە لەنێوان هەر تاوەرێکــدا ژوورێک هەیە کە کەنیســەکانی لە خۆ گرتووە، لە حەوشــە فراوانەکــەدا کە یەکێکیــان لەوانە (الناووس)ە تێیــدا جێگیرە ئەویش گۆڕی (حزقیال بن موسی الکوهیتی)یە ئەو شوێنەوارە بە پاشماوەیەکی گــەورە بنمیچ کراوە و بەشــێوەیەکی ئێجگار جوان دروســتکراوە (ایل مردوخ) میــری جوولەکەکان، (یهو باکیم)ی لەگــەڵ ٣٥٠٠٠ جوولەکەی دیکە کە یاوەریان دەکرد ئازادی کردن. شوێنەکەشــی لەنێوان رووباری خاپــور و رووبارێکی دیکەبوو، ئەو ناوانەی لەگەڵی دابوون لەســەرووی هەموویانــەوە ناوی میر (یهو باکیم)ە ولە کۆتایشــیدا ناوی (حزقیال)ە. هەتا ئیمرۆ ئەم شــوێنە بە پیرۆزی ناودەبرێت خەڵک لەوپەڕی وڵات

دێن بۆ ســـەردانی کردن نوێژو پاڕانەوەی لێدەکرێ بەتایبەتی لەســـەری ساڵ و جەژنی کەفارەتدا. هەر لەو ڕۆژانەشدا ئاهەنگ گێڕان ساز دەکرێ بۆ ئەو شـــوێنەش گەڕیدەکان و سەرۆکی قوتابخانەکانی بەغدا سەردانی دەکەن ژمارەی ئەو کۆمەڵانە زۆرن بەشێوەیەکی کاتی ماڵیان لەو شوێنە داناوە هەر لەوێش بازاڕێکیشـــیان داناوە. لە ڕۆژی کەفارەدا بەشـــەکانی هەر پێج کتێبەکەی مووسا دەخوێنرێتەوە کە (حزقیال) بەدەستی خۆی بەخەتێکی گەورە نووسیویەتیەوە، لەسەر گۆڕی پێغەمبەر بەشەو و بەڕۆژ چرا پێدەکرێ لەو کاتەی یەکەم جار ئەو چرایە داگیرساوە تاکو ئێستاش هـــەر ئەم چرایە دادەگیرســـێت تەنها بەپێی پێویســـت پلیتەو ڕۆنەکەی دەگۆڕدرێت، خانوویەک کە تایبەتە بەو پەرستگایە کە لەناوەوەیدا چەند کۆمەڵە کتێبێکی کۆنی لێیە بۆ سەردەمی (هەیکەلی دووەم) دەگەڕێتەوە. هەندێکیشـــیان دەگەڕێتـــەوە بۆ (هەیکەلی یەکەم) هیچ کەســـێکیش لە جوولەکە و موســـڵمان زاتـــی ئەوەی نییە کە گۆڕەکـــەی حزقیال تاڵان بکەن یاخود پیســـی بکەن تەنانەت لە ڕۆژانی جەنگیشدا. ئەو مەزارگەیە لـــە فەرهەنگی وڵاتان باس کراوە لە بەندی (برملاحە). (یاقوت) دەڵێ: (شوێنێک لە زەوی بابل نزیک حلله لە گوندەکەدا گۆڕی (باروخ حزقیل) و گۆڕی (یوسف الربان)ی لێیە. نەوەکو گۆڕی یوشع بن خوون و گۆڕی عـــزرا، هەروەها گۆڕی (حزقیل) کە ناســـراوە بـــە (ذا الکفل)ی تێدایە جوولەکەکان لە وڵاتە بەرفرەوانەکان ســـەردانی دەکەن. دیسان جارێکی دیکە لە بەندەی (شوشـــە) باس کراوە. لە گوندێکی خوار حیلله گۆڕی (القاسم بن موسی الکاظم بن جعفر الصادق)ی لێیە لە نزیک ئەویش گۆڕی (ذی الکفل). ئەوکاتە شـــاعیری جولەکـــەی بەناوبانگ (یهوذا الحویزی) ســـەردانی کردووەو هۆنراوەیەکی بۆ پیاهەڵدانی نووسیوە. و باسی ئەو مەزارگەیە لە گەشـــتی (بتاجناص) ١٧٩دا هاتووە، کە دەڵێ جولەکەکان لە جەژنی ســـەری ســـاڵ تا ڕۆژی (غەفران- الکیور) لەوێ کۆدەبنەوە، (بدروتکسبرا)ی گەشتیار دەڵێ: ئەوە دروستکراوێکی گەورەیە و تاوەرێکی بەرزی تێدایە و لەوێش ئێسکوپروســـکی پێغەمبەری پیرۆز (حزقیال)ی

لێیە کە هەموویان زۆر ڕێزی لێدەگرن. لە ساڵی ١٧٦٦ کۆچەر (ینبهر- Yenbeher) سەردانی ئەو شوێنەی کردووە ئەمەش پیاهەڵدانێک بۆ ئەو گەشتەی کە کردوویەتی، دەڵێ (لە ڕۆژی بیست و پێنجی مانگی کانوونی یەکەم سەفەرم کرد لە (مشهد علی)یەوە بەچوار میل و نیو بۆ باکوور لە (الکفل) دابەزیم، گەشـــتیارەکانیش هەر بەهەمان ماوە لەحللەوە دەگەنە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە، هەر بۆیە ماوەی نێوان هەردوو شـــارەکە نۆ میلە یان حەوت میلە، ئەو گۆڕە (ســـاڵانە بە هەزاران جولەکە تاکو ئێمڕۆش ســـەردانی دەکەن. مەزارگەکەی ئەو پێغەمبـــەرە هیچ خەزێنەو زێڕو زیو یـــا هیچ بەردێکـــی بەنرخی لێنیە، ئەگەر جولەکەکان بیانویســـتایە ئەم دیارییانەیان وەرگرتایە بۆ ڕەوەندەکانیان جێنەدەهێشـــت. لە پەرستگای پێغەمبەر لەژێر تـــاوەر گۆڕێک دەبینرێ بەدیوار دەوری گیراوە، خاوەنی ئەو شـــوێنە یاخود پاسەوانەکەی یا سەرپەرشتیاری پەرستگاکە ماڵێکی عەرەبە مزگەوتێکی جوان و منارەیەکیشی هەیە، ئەو ماڵە عەرەبە شتێکی زۆر قازانج دەکەن لەو میوانانەی کە سەردانی ئەو شوێنە دەکەن. گۆڕی (حزقیال) و مزگەوت و کەمێک لە ماڵەکانی عەرەب کە دیوارەکەیان بەقوڕ دەور گیراوە بەرزییەکەی ٣٠پێیە و پانتایی ١٢٠٠ پێیە، یەکەم جار یەک لە جوولەکەکانی کوفە ناوی سلێمان بووە ئەو هەڵساوە بەدروستکردنی. لە ساڵی ١٨٥٣ (لوفتس) (Loftus) ئەو گۆڕەی وەسف کردووە، کە دوو لە خانووەکان ســـەریان گیراوە خانووەکەی دەرەوە بە ستونێکی گەورە وەســـتێنراوە. بەڵام مەزارگەکە وەکو سندوقێکی گەورەو کۆنە درێژەکەی (١٠) پێیە و بەرزییەکەی چوار پێیە بە نووســـینی ئینگلیزی ڕازاوەتەوە لەگەڵ هەندێ ئاڵای ســـوورو ســـەوز، بنمیچەکەش بەخشڵ و زێڕ و زیو ڕازاوەتەوە. لە یەکێک لە ســـوچەکانی هەر پێنج کتێبەکەی موسا کە بە جولەکەیی نووســـراوە دانراوە گوایە کە (پێغەمبەر- حزقیال) بەدەستی خۆی نووســـیویەتی لەوێ چرایەکی لێیە بەشەو بەڕۆژ داگیرساوە دەڵێن حزقیال لەکاتی خۆیدا ئەو چرایەی داگیرســـاندووە تاکو ئێســـتاش بەم جـــۆرە ماوەتەوە ئەگەر پێویســـت بـــوو ڕۆن و پلیتەکـــەی دەگۆڕدرێ.

بنیامینی دووەم ئەو مەزارگەیەی وا وەســف کردووە کە بەکورتی دەڵێ: لــە ناوچەی (الکفل) خانوویەک هەیە دەورەکەی بەدیوار گیراوە لەناویدا گــۆڕی پێغەمبەر (حزقیال)ی لێیە کە بە مافورێکی بەنرخ داپۆشــراوە و دەرزی بۆ بەکارهاتووە بە شــێوەیەکی جوان نەخشــێنراوە، سەرەتا بەم دەستپێشــخەرییە خۆشــحاڵ نەبوو، میر (یا هوباکیم) ئەو دیوارەی دروســتکردووەو هەزاران کەس لە جولەکەکان یارمەتیان داوەو هەروەکو قەڵا تاوەری بۆ دروســتکردووە لەسەر بەرزایی تاوەرەکە هەیوانێک هەیە شــوێنەکە لە بنەڕەتدا بۆ دروستکردنی شــێوەی مزگەوتێک دانراوە، لە ژوورەوەش قادرمەیەکی تێک ئاڵاوەی بەرزی لێیە بۆ بەسەرکەوتن بەرەو تاوەرەکــە، لەوێوە خەڵکی بەچاوی خۆیانــەوە تاوەری بابل لە دوورەوە دەبینن، وەکو دیوارێک دروستکراوە.

لــە تــاوەری (الکفل)یــش داهێنانێکــی ســەیر هەیــە خەڵکی وا هەســتدەکات کە لەو شوێنە سەر ســوڕهێنەرێکی لە سروشت بەدەری لێیە، بەرزکەرەوەکە دارە یا ســتوونی ئاســنە لە تاوەرەکە لە لایەکەوە بۆ لایەکی دیکە تێدەپەڕێت. هەر ســەرێکی بەهەیوانەکەوە گەیشــتووە ئەگەر ئەو ســتوونە بەتوند بجووڵێ هەســت بە لەرینەوەیەک لە بەشی سەرەوەی تاوەرەکە دەکرێ و بەبیروباوەڕی خەڵکەکە دەڵێن دەبێ مرۆڤ ئەم وتانە بڵێ لەوکاتەدا (یثم ملکاء شــالوم وءنراثو) بەواتای (بەناوی میر ســلێمان و تاجەکەی) ئەگەر ئەو قســانەی لە بیرچوو ئەوە تووشی کارەسات دەبێ. و هەوڵم داوە باوەڕ بەبرایانم بهێنم کە ئەمە هیچ شتێکی سەرسوڕهێنەر نییە. کە ئەوان وا خەیاڵ دەکەن، بەڵکو تەنها لەرینەوەکە لە بورغویەک پەیدابووە کە لەناو خانووەکە یان لە پارچەیەکی میکانیکیدا شــاردراوەتەوە، بەڵام نەمتوانی ئــەو باوەڕە پڕوپووچە لە مێشــکیان دەربهێنــم. لەو گــۆڕەدا گۆڕی پێغەمبەر (حزقیــال)ی لێیە و بەردێکی گەورەی لەســەرە کە بە تەباشیرە شــکێنراوەکانی بەشەکانی خانووەکە رووپۆشــکراوە واتە بە (بورق) داپۆشراوە. لە تەنشتییەوە کەنیسەیەکی گەورە هەیە و پێشەوەکەی بەرۆنێکی جوان چەور کراوە بەرەنگی توێکڵی

کیسـەڵ دەچێ، لە لایەکی خانووەکە دوو وێنە بەقەد گەورەیی مرۆڤێکی ئاسایی هەیە، ئەم وێنانە هی کاتی رابردووە. لای جوولەکەکان وا ناسراوە کـە ئەو دوو وێنەیە، وێنەی (حزقیال) و میـر (یهوباکیم)ن، بەڵام زۆر زەحمەتە بۆ ئەوانەی کە سـەیری دەکەن شوێنەوارەکەی ببینن، چونکە سـڕاوەتەوە و لە ناو چووە رووخسارەکەی لە نیمچە مرۆڤ دەچێ، بەڵام نەرەنگی و نەجلەکای ناسـراو نییە، دیواری دەرگاکان لە شوێنی جیاواز بە کۆمەڵێک وێنەی نیمچە نووسـراو و نەخشێنراوی میسری داپۆشراوە ئەمەش وەکو نەمرییەک بۆ هەموو میللەت و میرەکەی کە لە دروستکردنی ئەم خانووە بەشـداربوون. لەنێو شـوێنی پیرۆزی ئەو کەنیسەیە چەند نووسـراوێک لەوێ هەیە کە لەنێوانیدا دانەیەکی زۆر گەورەی لێیە پێشتر شـتی وامان نەدیوە کە لەسەر جۆری کۆیلە عیسا (کویل) نووسراوە بە باوەڕی جولەکەی عێراق گوایە (حزقیال) خۆی نووسـیویەتی. بەباوەڕی من واتـە (بەباوەڕی بنیامینی دووەم) کە نووسـینەوەی ئەم کتێبە بۆ سەردەمی (عنان) ساڵی ٤٤٩٠ی پێش گەردوون ئەو کتێبە تەنها لە رۆژی (الغفران- الکیور) دەخوێنرێتەوە. دەمویسـت ئەو نووسـراوە بپشکنم، بـەڵام رێگایان پێنـەدام لەبەر ئەوەی ئـەو رۆژە رۆژی (الکیور) نەبوو کە کتێبەکەی تێدا دەخوێنرێتەوە. لەناوەوەی کەنیسـەکە ژوورێک هەیە کە گەنجینەیە واتە (الکیتیزا) نووسـراوی کۆنی تێـدا پارێزراوە کە لە شـوێنە جیاوازەکان هاتووە. لە لای کەنیسـەکەش کۆمەڵەی (الربانین) پیاوە گەورەکان یان (جیشـیا) بەردەوام نزیکەی بیسـت پیاوی گەورە لـەوێ کۆدەبنەوە و کتێبی (تلمۆد)ەو چەند کتێبێکی دیکەی یاسـایی دەخوێنینـەوە ئەوانە تاکـە جوولەکەن کەماڵیان لـە (الکفل) هەیە.

جوولەکەکانـی بەغدا دیـاری و خەڵاتی گەورە هەر پێویسـتییەکی ئەو شوێنە بوایە دەیانبەخشی، نموونەی ئەوانەش بەرلەوەی کە دابەزمە ئەو ماڵە بەچەند سـاڵێک (یعقوب سیماح) کە جوولەکەیەکی دەوڵەمەندبوو بێ ئەوەی باسـی بکرێ، هەرچی پاشـماوەو سـامانەکەی خۆی بوو بۆ جوولەکەکانی جێهێشـت لەگەڵ ١٥٠٠٠٠ (قران) بـۆ یارمەتیدانی گەورە

پیاوان- جیشـــییا) لە (الکفل) جوولەکە و عەرەبەکانی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە باوەڕیان بەکاریگەری هەندێ کار هەیە کە لەسەر گۆڕی پێغەمبەر دەکەن بەتایبەتی بۆ چاککردنەوەی ئەو نەخۆشانەی کە تووشی شێرپەنجە بووینـــە، پیاوە گەورەکان هەموو هەینییەک دوای نیوەڕۆ دەچنە ســـەر گۆڕەکە بۆ ئەوەی ســـروود و لاواندنەوە بڵێن و پەردەی گۆڕەکە بگۆڕن هەموو ســـاڵێک لە بەرۆژبوونی هەفتەدا جوولەکەکانی بەغداو بەسرە و وڵاتی فارس و شـــوێنەکانی دیکە دێن بۆ ســـەردانی مەزارگە بۆ ئەوەی ئاهەنـــگ و جەژنی جیاواز بگێڕن. ئێـــوارەی رۆژی پێش جەژن گەورە پیاوان دەچنە کەنیســـە کتێبی (حزقیال) دەخوێننـــەوەو بەیانی پێش دەرکەوتنی خۆر بە ســـەعاتێک بۆ دەستکەوتنی جۆری گۆڕینی پەردەی گۆڕەکـــە زیادکردنێک دەکەن هەر کەســـێک زۆرترین پـــارە بدات دەبێ بەدەنگێکی بەرز کتێبی پێغەمبەر (خضورا) بخوێنێتەوە، لەگەڵ سروودو لاواندنەوەکەدا پەردەکە دەگۆڕن. خەڵکی ئەوێ دەڵێن بەهەزاران شـــتی سەرسوڕهێنەر کە لەسەر گۆڕی (حزقیال) روودەدات ئەوانە پڕوپوچن و تیرەی رەوەندەکانیش بۆ سەردانی پێغەمبەر (حزقیال) دێن و بەرێزەوە پێشـــوازی لە گۆڕەکـــە دەکەن و باوەڕێکی راســـتیان پێ هەیەو خەڵات دەبەخشـــنە پیاوە گەورەکان، بەیارمەتی پێغەمبـــەر خێرو چاکەکانیان دەستدەکەوێ. دەڵێن (مناحیم افندی دانیال) یارمەتی نەتەوەکەی داوە لە کاروباری ئەو پەرستگایە.

### ٣- یوشع کوهین کاوول:

لە لایەکی شـــاری سەلام گۆڕی پیاوچاکێکی جولەکەی لێیە خەڵکی ســـەردانی دەکەن بۆ نزا کردن بەناوی پێغەمبەر (یوشع اورین یان یوشع کوهین کاوول) کە لە نزیک گۆڕی (شـــێخ مەعروف الکرخی) موسڵمانە و لە تەنیشـــتی گۆڕی (خاتوو زبیدە)یە و لە لایەکی دیکەشدا گەڕەکێکە و دەرکەوتـــووە لەو ناوچەیە کڵێســـەیەکی (نصـــاری- گاور) هەیە کە بەکڵێسەی (الیشـــع) ناسراوە، هەندێکیشـــیان ناوی دەبەن بەکڵێسەی (البقال) لە تەنیشت گۆڕستانی (معروف)ە.

١- (ابــو محفوظ معروف بن فيروز) يا (الفيروزان)ی پێ دەڵێن یان (علی الكرخی) لە فەرمانڕەوایی (علی بن موسی الرضا)یە، هێشتا گەنج بــوو دایک و باوکی موســڵمانیان کردووە ئەویش رایکــردووەو ئیدانەی ئیســلامی کردووە، لە پێش سەدەی سێی کۆچی لە بەغدا کۆچی دوایی کرد. گۆڕەکەشی بە (یزار) ناسراوە.

٢- لای (الباغدە) وا دەگێڕنەوە کە لە ناو ئەو گۆڕە ئێسکوپڕوسکی زبیدەی خێزانی (هارون الرشید)ی تێدایە، توێژەرەکان باس لەوە دەکەن و دەچنە ئەو شــوێنە کە ئافرەتێکی (بویهیە) یا (سلجوقیە) ئایا ناوی زبیدەیە، گۆڕی مێردەکەشی (الرشید) لەگۆڕستانی (قریش)ـە لە تەنیشت (باب التین)ە. کە گۆڕی (موســی الکاضم بن جعفر الصادق)یشــی لێیە واتە (الکاضمیە)ی ئێستا. لە ساڵی (٤٤٣)ی کۆچی کە لە مێژووی (ابن الاثیر) دایە پشتگیری ئەو رایە دەکەن. دکتۆر (هرتسفیلد) ساڵی رابردوو ئەوکاتەی لە بەغدا بوو ســەردانی کردم گفتوگۆیەکی درێژمان دەربارەی ئــەو بابەتە کرد، بەڵام لەگەڵ ئەو رایەدانەبــوو دەڵێ ئەو دەقەی (ابن الاثیــر) هیچ بەڵگەیەکی راســت ناگەینێ کە گۆڕی (ام الامین) لە (باب التین)ـەو نەریتی (البغادە) پەســند دەکەن. بۆ دروســتکردنی شێوەی خانووەکە دەڵێن دوایی سوتانی سەرلەنوێ تازەو رێکخراوەتەوە.

٣- بگەڕێوە بۆ گەشتەکەی (ابن بطوطە)

١٣٥-١ لە چاپکراوەی (وادی النیل) لاپەڕەی (٤).

٤- بە وتەی هەموویــان بەندێک لە فەرهەنگی وڵاتان کە پەیوەندی بەگۆڕێ پێغەمبەر (یوشــع بن نون)ە هەیە لێکراوەتــەوە. جولەکەکان خۆیان لەسەر ئەو رێبازە ناڕۆن، هیچ بەڵگەیەکی مێژوویش بە دامەزراندنی ئــەو مەزارگەیە و ئەوانــەی تێدا نێژراون نییە. هــەر بۆیە زەحمەتە بۆ مێژوونووســان دەربــارەی ئــەم کارە رای خۆیان بدەن. ئــەو ئامانج و مەبەســتەی کە میللەتــی جوولەکەش لە خۆیانــەوە وتویانە کە دەڵێن لەوێ گۆڕی یەکێک لە پیاوچاکان یان ســەرۆکەکانی نهێنی زانی لێیە و هیچ شــتێکیش دەربارەی نازانن. نامۆیە گەر باس لەو یادە بکەم کە لەو

مەزارگەیە لە گەشـــتیارێکی تورکی روویداوە کە ســـەرۆک (سید علی)یە کاتێ ســـەردانی ئەو گۆڕەی کردووە لە ســـاڵی (٩٦١)ی کۆچی ١٥٥٤ز- بگەڕێوە بۆ کتێبی (مرات الممالک) لاپەڕە ١٥. ســـەبارەت بەگەشتەکەی (بدرو تکســـیرا) کە لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەم کردوویەتی دەڵێ: (گەشتەکەمان لەنزیک بەغداوە بووە خانوویەکی بچووک هەبوو لە ناوەوە گۆڕێکـــی تێدابوو کە عـــەرەب و جوولەکە خزمەتیـــان دەکرد کە گوایە لاشـــەی نهێنی زانی گەورەی جوولەکەی لێیە، کە لە ســـندوقێکی گەورە دروســـتکراوە و لەسەر گۆڕەکە لاپەڕەیەک لە کانزا دروستکراوە بەخەتی جوولەکەیی ناوی (یوشع کوهین کاوول)ی لەسەر نووسراوە. دانیشتوانی ماڵەکانـــی نزیک ئەو شـــوێنە دووپاتی دەکەنەوە کـــە پیاوێکی گەورە و خواپەرست بووە ئەو کارانەی خودا پێی خۆشبووە کردوویەتی:

١- گەشـــتیاری دانیمارکی (لیبهر) لە ســـەدەی (١٨) سەردانی ئەو شوێنەی کردووە، دەڵێ: خانوویەکی بچووک گۆڕی پیاوێکی لێیە بەناوی (یوشع) کە جوولەکەکان لە سەردانەکانانیدا باسی دەکەن.

٢- (بنیامینی دووەم) قسە لەسەر ئەو پەرستگایە دەکات دەڵێ: بە دووری کاتژمێرێک لە بەغداوە خانوویەکی بچووکی لێیە کە هەشت داری خورمای گەورەی لێیە هەموویان سێبەریان دروستکردووە. دەبێتە دووبەش یەکێکیـــان گۆڕی نهێنیزانی گەورە (یوشـــع)ـە زۆر بەجوانی رازاوەتەوە زەکەریا (٣-١) باسی کردووە و لە ژێر تابووتەکە نووسراوێکی زۆری لێیە چەند پارچەیەکیـــان دەخوێنرێتەوە هەروەها چیرۆکی مێژووەکەی کە لە کتێبەکانی زەکەریا هاتووە.

٣- روناکی لە پەنجەرەیەکی تەسکەوە بۆ ناو گۆڕەکە دێت جوولەکەکان هەمـــوو مانگێـــک دەچنە ئـــەوێ بۆ ئـــەوەی گوێیان لـــە خوێندنەوەی کتێبەکانی نهێنـــی زانی گەورە بێـــت. دوای تەواوبوونی خوێندنەوە کە هەموویان بەیەکەوە سروود دەڵێن و لە شوێنێکی کەمێک دوور لە گۆڕەکە کۆدەبنـــەوە و بەیەکـــەوە وەک برا خواردن دەخـــۆن. دەڵێن: (مناحیم افندی دانیال) یارمەتی میللەتەکەی داوە بۆ کاروباری ئەو پەرســـتگایە.

لــه لاپەڕەی ١٧٩١ لە كتێبی (نزهه المشـتاق فی تاريخ يهود العراق)دا لە سـالّی ١٨٨٩ باسی ئەو ناكۆكییەی نێوان موسڵمانان و جوولەكەكان دەكات كە لەسـەر ئەو مەزراگەیە روویداوە لەسـەر ئەو مەزارگەیە بووە ئەو رووداوەش یەكێتی گشـتی ئیسـرائیلی بڵاویكردۆتەوە كە لە پاريس دەردەچوو، بینیمان وا باشترە كە ئاماژەی پێبدەین و هەندێكی لێ باس بكەیـن. لێرەدا دەڵێین كە حكوومەتی توركیـا بایەخی بەو ناكۆكییەدا لـە پێناو موڵكییەتی ئـەو مەزارە، دواتر گەڕانـدراوە بۆ جوولەكەكان، ئەو پەرستگایە هیچ شـوێنەوارێكی وای لێنییە كە توێژەر باسی لەسەر بـكات، لە لای جوولەكەكان بایەخی خۆی هەیە بەڵام سـاڵ بە سـاڵ سەردانەكانیان كەمتر دەبێ.

### ٤-شێخ ئیسحاق غاووتی:

لـە گەڕەكی (رەسافە)ی ئێستا لە شاری بەغدا بەشێكی تایبەت هەیە بە جوولەكەكان كە گەڕەكی (شـێخ ئیسحاق)ی پێدەڵێن، گۆڕی یەك لە پیاو گەورانی لێیە بەناوی (شـێخ اسـحاق الغاووتی)، و كەنیسەكەشی دەرگایەكی دیكەی هەیە كە تازە دروستكراوە و دەكەوێتە سەر شەقامی (حنون) بە كۆڵانەكانی جوولەكە ناسـراوە، مێژووی ئەوگۆڕە بۆ سەدەی حەوتی زایینی دەگەڕێتەوە لە ١٩٢٠/٢/١٠ بەیاوەری رێبەرێكی جوولەكەی ناسـراو پێمان خۆشبوو و ئارەزوومان كرد كە سەردانی ئەو مەزارە كۆنە بكەین، هەر لەو دەرگایەی كەوتۆتە سـەر شـەقامی (ئیسحاق) چووینە نێو كەنیسـەكە، دوای ئەوەی چەند هەنگاوێك بەلای چەپدا رۆیشـتین گومبەتێكمان بینی كە لاشەی رەبەنێكی تێدابوو، و بەرامبەرمان دەرگایەك هەبوو بەرەو شوێنی نوێژكردن دەچوو، سەرپەرشتیاری ئەو شوێنە هات و دەرگاكەی كردەوە و چووینە ژوورەوە و چاوەكانمان كەوتنە پرسـیار بۆ بینینی پاشماوەی ئەو مێژووەی كە بوونی ئەو نەتەوەیە دەسەلمێنێت و ئەو خانووانە هەموویان تەمەنیان ناگاتە بیسـت سـاڵ، دەڵێن دوای كاولبوونـی میللەتەكە خۆیان نوێیان كردۆتەوە، ئەو ژوورە لە شـێوەی

چوارگۆشەدایە و بنمیچەکەی بەخشتی کوورە دروستکراوەو زەوییەکەش بە (قاشانی) سپی و شین کاشی کراوە، لە ناوەڕاستەکەیدا قەنەفەیەکی لە دار دروستکراو هەیە، شێوەکەی هەروەک گۆڕەکانی عێراقی لە زەوییەوە بەرزترە، و بە قوماشـــێکی ناسک و ئاورێزی داپۆشراوە و شوێنەکەی زیاتر شکۆدارتر کردووە، و لەژێر قەنەفەکەش گۆڕی (اسحاق)ی لێیە و لەسەر گۆڕەکەش چرایەک هەیە کە بەشــــە و بەرۆژ داگیرساوە و لەسەر نەریتی میللەتانی ســـامیی کۆنەوە جێبەجـــێ دەکرێت، توێژەر خۆی ئەوانەی لە ژووری مردووەکەدا بینووە، کاتێ لە ژوورەکە دەرچووین لەسەر دەرگاکە بەردێکی مەرمەڕی لێبوو کە بە زمانی عیبری هەڵکەنرابوو باسی مێژووی کۆچـــی دوایی پیاوچاک (اســـحاق الغاووتی) دەکات لە ســـاڵی (٦٢٠) دا بووە، پاشـــان مەزارگەکەمان جێهێشـــت و چووینە ژووری نوێژکردن، بینیمان کە بە شـــێوەیەکی قایم و نوێکار دروســـتکراوە، لە ناوەڕاستی ژوورەکە کورســـییەکی بەرز هەیە لەوێ ڕەبەن لەســـەری دادەنیشـــێ و کتێبێک یان وتارێک بۆ میللەتەکەی دەخوێنێتەوە و نوێژی بەکۆمەڵی تێدا دەکەن، نوێژکەران لەو شـــوێنەی بۆیان ئامادەکراوە لە تەنیشت کەنیسە دادەنیشـــن، چەند تابلۆیەکیش هەڵواسراون کە بەزمانی عیبریی تەوراتی لەســـەر نووسراوە و بەشـــەو بەڕۆژ چراکان بەڕۆنی کونجی داگیرساون. لەو شـــوێنە بیری ئاوێک دەبینرێ هـــەروەک ئەو بیرەی لە ناو ماڵەکانی بەغدایـــە هەیە. هەروەها ئەو کەنیســـەیە بووەتە پەناگەی کوێرو خاوەن دەردو نەخۆشـــی کە لەوێدا خوێندنی یاســـاو فەقێتی و شیکردنەوەکانی ئایین دەخوێنن.

دوای گەڕان بەناو شوێنی نوێژکردنەکەدا ڕوومان کردە دەرگایەک کە بـــەرەو بازاڕی (حنون) دەردەچوو، لەوێ پیاوێکمان بینی کە لە هەڕەتی لاویەتیدا بوو لەســـەر تەختێک دانیشتبوو و مێزێکیشی لە پێش بوو کە چەند کتێبێکی لەســـەر دانرابوو، ئافرەتێکـــی پەچەداریش لەبەرامبەری دانیشتبوو، زانیمان کە ئەو پیاوە خەریکی نوشتەو دوعاکردنە، ئەو ڕۆژە گەڕانەکەمان تـــەواو بوو، بەڵام لە بیرمان نەدەچوو هەر بەدوای مێژووی

ئەو مەزارگەیە دەگەڕاین بۆ ئەوەی بگەینە راستی ئامانجەکەمان بۆ رۆژی دووەم سەردانی یەک لە زاناکانی راگەیاندنمان کرد کە لە مێژووی عێراقدا ناویان هەبووە، تکامان لێکرد کە مێژووی کەنیســـە و ئەو شـــێخەی کە راکشـــاوە لەوێ بۆمان باس بکات و بەڕێزیشـــیان بەشێوەیەکی زۆر باش و رێکوپێک وەڵامی داینەوە و گوتی: هەموو شـــتێکیش بەتەواوی نازانم لەســـەر مێژووی ئەو پەرستگایە، بەڵام ئەوەی دەزانم کەوتۆتە گەڕەکێک پێشـــتر بە (باب ارزاد) یان (بیرز) ناســـراوبوو، لە فەرهەنگی وڵاتان لە ماددەی (بیرز) باس کراوە و نووسەرەکەشـــی (یاقوت) بووە، گۆڕەکەی کەوتۆتە نێـــوان خانووەکان و باڵەخانەکانی ئـــەو ناوچەیە لەلایەک، لە لایەکـــی دیکەش گەڕەکی (الظفریـــە) و (المقتدریە) کە کۆمەڵێک گۆڕی لێیە لەوانە گۆڕی (ابو اســـحق ابراهیم بن علی الفیروز ابادی)یە. زاناکە گوتی: لەوانەیە ئەو گۆڕەی لەناو پەرســـتگادایە جوولەکەیە بەناوی (ابو اسحاق ابراهیم بن علی الفیروز)ە، بەڵام لە گرفتەکانی مێژوویی و ئایینی و کۆمەڵایەتیدا ئەو راو گریمانانە پەسند ناکرێ.

بۆ ئەوەی بانگەشـــەکانی جوولەکە و نەریتەکانیـــان لە مێژووی ئەو مردووە پوختە بکەین: ئەویش بە سێ جۆر جیادەکرێتەوە.

١- شێخ اسحاق الغاووتی.

٢- مێژووەکەی بۆ ســـاڵی (٦٢٠) (کاوڵبوونی ماڵی پیرۆز — خراب بیت المقدس) یاخود بۆ کۆتایی سەدەی حەوتی زایینی دەگەڕێتەوە.

٣- لە ماوەی ژیانیـــدا دراو گۆڕێکی هەبووە کە هی (ئیمام عەلی — س.خ) بووە.

(الغاووتـــی) لـــە جوولەکـــەکان بـــووە و بـــۆ خوێندنی تـــەورات و شـــرۆڤەکردنی بەرهەڵستیان کردووە لەســـەرووی هەموویانەوە سەرۆکی هـــەردوو قوتابخانەکانی (بومباد بتا — جبە)و (ســـدرا_ ســـوار) بووە (مندلسون) لە کتێبەکەی بەناوی (جوولەکەی ئاسیا بەزمانی ئینگلیزی) لاپەرە (٢٢٢)دا باسی کردووە.

ئەو ناکۆکییەی لە نێو ســـەرۆکەکانی (جالـــوت والغاووتی) زیانێکی

زۆری بە هەموو هۆزەکە هێناو لە ســـەدەی نۆهەم و دەیەمی زاینیشـــدا زیاتر بوو.

ئەو نازناوەی (شـــێخ) کە بەناوی (اسحاق الغاووتی) دراوە بۆ ئەوە دەچێ کە ئەو پیاوە لەســـەردەمی عەباســـییەکاندا ژیـــاوە، چونکە دراو گـــۆڕەکان و نووســـەرەکانی خـــاوەن متمانە ئەو نازناوەی (شـــێخ)یان دەرکردووە، لەوانەیە ئەو مێژووی کە لەســـەر دیوارەکە نووسراوە باسی ســـاڵی (٦٢٠) دەکات ڕەنگە ڕاست نەبێت و هەروەها لەو باوەڕەشدا نین کە دراو گۆڕی (ئیمام عەلی س.خ) لە کارەکانیدا بەکارهێنابێ لەبەر ئەو هۆیانەی خوارەوە.

١- لە نیوەی سەدەی دووەمی کۆچی، واتە لەسەرەتای نیوەی کۆتایی سەدەی هەشتەمی زایینی (المنصور)ی بەغدا دامەزراوە.

٢- لە مێژوونووســـانی کۆن و نووسەرو شوێنەوارناسان و کۆچەرانی بیانی کە ســـەردانی ئەو وڵاتەیان کردووە هیچ شـــتێکیان دەربارەی ئەو مەزارگەیە نەنووسیوە.

٣- ئەو مێژووەی کە لە ژیانی ئەو زانایەدا باس کراوە لەگەڵ سەردەمی (ئیمـــام عەلی) (س.خ) ڕێکدەکەوێ، بەڵام ئەو مێژووە باســـی ئەو دراو گۆڕە جوولەکەیەی نەکردووە، کە لە خزمەتی ئیمام عەلی دابووە.

بەکورتی ئەگەر شـــێخ (اسحق الغاووتی) بەڕاستی (الغاووتیم)ە ئەوا لەســـەدەی دەیەمی مەسیح زیاتر سەرناکەوێ، ئەگەر ئەوە ڕاست بێ کە کەسێکی جوولەکە باسی لێوە کردووە کە ئەو کەنیسەیە لە سەدەیەک یان ســـەدەیەک و چارەگێک زیاتر نییە، کەواتە (شێخ اسحاق) لە سەردەمی نوێیە.

ئەوەی لەو بەشەدا باسکراوە تەنها لەسەر گریمانەی مێژوو نووسراوە، ئێمەش داوا دەکەین بۆ ئەوانەی هەرچ ڕوونکردنەوەیەکی مێژوویی لەبارەی ڕاســـتی ئەو کەنیســـەیەیان هەیە بۆمان بنێرن یان بـــڵاوی بکاتەوە زۆر سوپاسی دەکەین بەناوی ڕاســـتگۆیی کە سوێندمانە ئەو گەڕۆکانەی کە هاتوون سەردانی ئەو وڵاتانەیان کردووە هیچیان وەسفی ئەو مەزارگەیان

نەکردووە تەنها یەک لەوانە نەبێ ئەویش (بنیامینی دووەم) بوو دەڵێت: ئەو تەلارە شـــوێنێکی فراوانە لەسەر شانزە ستوون دامەزراوە هەر لەوێ کتێبێـــک دەخوێندرێتـــەوە کە تەنها ئاماژە بـــە ڕۆژی چواردە و پانزەی مانگی ئاداردا ئاماژەی بۆ کراوە، لەناو تەلارەکەش هیچ شـــتێکی وا نییە شایانی باسکردن بێت، بنمیچەکەش دوومەترەو بە نەخش هەڵکەندراوە، ئەو کەنیســـەیە بەناوی (شـــێخ اســـحاق الغاووتی) ناونراوە، لەیەک لە ژوورەکانیـــدا گۆڕی ئـــەو زانایەی لێیە و چەند ئاڵایەکی چوار گۆشـــەی ڕەنگاوڕەنگینی لەسەرە و (دە) کەس لەڕەبەنەکان نوێژ لەسەر گۆڕەکەی دەکەن.

## ٥- مەزارگەی ناحوم ئەلقوشی:

لاپەڕەکانی کتێبی پیرۆز هەڵبدەوەو دەبینین ناوی پێغەمبەر (ناحوم) هاتووە کە باس لە پێشـــبینیەکانی ســـەبارەت بە فەوتاندنی (نەینەوا) دەکات و بەسێ بەش کۆتایی پێهێناوە، ئەوەی لەو بەشەدا لامان گرنگە گۆڕی (ناحـــوم)ە، ئایا ئەو پێغەمبەرە لە (قوشـــی ئاشـــوورە)یان لە (قوشی فەلەســـتینە) و ئایا لەکام لەم دوو وڵاتە نێژراوە؟ دوای ئەوەی لە وتەکانی مێژوونووســـان و زانایەکاندا هاتووە کە لە (قوشی ئاشوورە) و جوولەکەکانی عێراق و مەســـیحیەکان و موسڵمانەکان ڕێزی لێ دەنێن، خوانـــاس (ایروتیس) دەڵێ: (قوش) وڵاتی (ناحـــوم)ە، ئەو گوندە لە (الجلیل) بووە و گۆڕەکەشـــی لە گونـــدی (بیت جبرا — Bate Gabra) لە نزیک (عمواس) دەبینرێ، منیش دەڵێم پێشـــبینیەکەی (ناحوم) لە کاتی کۆچکردنی (الاســـباط)ی بچووک بەدەرکەوت کە هەمووی باســـی (نەینەوای) دەکرد، جوگرافیناســـە عەرەبەکان لە نووسینەکانیاندا باسی (القوش) یان نەکردووە، دەرکەوتووە کە ئەو باسە لە سەدەی ناوەڕاستدا سست بووە، ئەوەی نامۆیە کە (بنیامین التطلبی) دەڵێ کەنیس (ناحوم) لە موسڵە. دوای کەمێک دەڵێت گۆڕەکەی ماوەی شەش سەعات لە گۆڕی (حزقیال)وە لە ناوچەی (عین شـــفتا)ەوە دوورە، بەڵام (بتاخیا) دەڵێ:

گـــۆڕی (ناحوم) لـــە گۆڕی (باروخ بن بتری) چـــوار میل دوورەو گۆڕی (بـــاروخ بن بتر)یش لە گۆڕی (حزقیـــال) لە یەک میل زیاتر تێناپەڕی. هەریەک لە (نبیهر) و (لایرد) و (بنیامینی دووەم) باســـیان لە وەسفی ئەو گۆڕە و سەردانەکانی جوولەکە بۆ ئەو شوێنە کردووە.

(لایـــرد) دەڵێ: بەپێی نەریتە گشـــتییەکان (گۆڕی قوش) بەگۆڕی (ناحوم) ناســـراوە موسڵمانان و مەســـیح و جوولەکەش ڕێز لەم شوێنە دەگرن و تەلارەکە دەپارێزن و لە هەندێ وەرزی ساڵدا لەکاتی سەردانی کردنیان زەرافە دەهێنن. گۆڕەکە قەنەفەیەکی ئاساییە لە گەچ یان تاووسی دروســـتکراوە، بە قوماشی سەوز داپۆشراوە. لەســـەر دیواری ژوورەکە چەند کتێبێک دانراوە و بەزمانی عیبری لەســـەری نووسراوە، (بنیامینی دووەم) لە گەشـــتەکەیدا بەشێکی لەسەر (القوش) و مەزارگەی (ناحوم) نووســـیوە، کە پێنج لاپەرە و کەمێک دەبێت و گۆڕی (نبی یونس) یان (یۆنان) و شـــوێنە پیرۆزەکەی دەکەوێتە شـــوێنێکی بەرزی نەینەوا کە مزگەوتێکی موسڵمانانە و بەپێی نەریتەکان گوایە ئەوە گۆڕی (پێغەمبەر یونس)ە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی ئەو نەریتە ناسەلمێنێ.

## قوتابخانەی جوولەکەکان لە عێراق

قوتابخانـــەی ئەلیانس یـــان (یەکگرتوویی ئیســـرائیلی) بەکۆنترین قوتابخانـــە دەژمێردرێت کـــە گەورەترین خزمەتی پێشـــکەش بەتایفەی جولەکەی ئیســـرائیلی لە عێراق کردووە. لـــە بنەڕەتدا دامەزرێنەری ئەو قوتابخانەیە (البارون روتشـــبلد)ە و لە ســـاڵی ١٨٦٤ دروستکراوە. لە پێش هەموویانەوە بۆ دیاریکردنی بەشەکانی خوێندن بۆ فێربوونی کتێبی ئایینی لای جوولەکە بەتایبەتی (تلمود) کاریکردووە وچەند وانەیەکی بۆ خوێندنی (تەورات) تایبەت کردووە. بۆ ئەم مەبەســـتە لە تەواوی دنیادا مامۆستای هێناوە بەتایبەتی لە فەلەستین و کۆمەڵەی ئەلیانس پێشتریش قوتابخانەیەکـــی هاوشـــێوەی ئەوی دامەزراند بوو کـــە وانەی زمانەکانی فەڕەنســـی و ئینگلیزییان دەخوێند و هەوڵی خوێندنی زمانەکانی عیبری و عەرەبیان داوە ســـەرەڕای وانەکانی گشتی وەک (مێژوو- جوگرافیا- زانست- کیمیا. سروشتییەکان و چەندانی دیکەش پاڵپشتی کۆمەڵەکانی جوولەکە لە فەرەنساو کۆمەڵەی ئینگلیزی جوولەکەیی لە لەندەن دەکرد و هەر بەم هۆیەشـــەوە بەشـــێک لە مامۆســـتایانی قوتابخانە لە لەندەن نوێنەرایەتیـــان دەکرد، لـــە جوولەکە ئێراقییەکان (ئەلبرت ساســـون و مناحیم دانیال لەگەڵ نورائیل) پاڵپشـــتیان دەکـــرد، هەروەها رێگە بەو کەســـانەش درا کە جوولەکە نەبوون و پێوەندنییان پێوەکردن، لە ساڵی ١٩٢٠ ئەوکات بڕیاری خوێندنی ماددەی مێژووی جوولەکە لەو قوتابخانەدا درا کە بەتەواویـــش نازانرێت ئەو پاڵنەرە چی بوو بۆ پەیوەســـتکردنی ئەو وانەیەو نزیکەی شەســـت ساڵ بەســـەر دامەزراندنی ئەو قوتابخانەیە تێپەڕیوە. بێ ئەوەی لە خوێندنەکانیدا باس لە جوولەکەدا بکرێ. شتێکی روونە لەم قوتابخانەیە کاروانێک لاو دەرچوون و بەشـــێوەیەکی گشـــتی زۆربەیـــان رۆڵێکی دیاریان لە کۆمەڵگەی عێراقیدا هەبوو بەشـــێوەیەکی تایبەتیش لە کەمایەتییە جوولەکەکاندا هەبوو.

چەند لقێک لەو قوتابخانەیە لە موســـڵ و بەســـڕە و عەممارە دامەزرا و لە ســـاڵی ١٨٩٣ کۆمەڵەی یەکگرتووی ئیسرائیلی قوتابخانەیەکیان بۆ

پەروەردەکردنی کچان لە بەغدا دامەزراند و لە ساڵی ۱۹۰۳ قوتابخانەیەک لە بەسرەو لە ساڵی ۱۹۰۷ دیسان لە بەسرەو لە موسڵیش دامەزراو لە ساڵی ۱۹۱۰ لە شاری عەممارە و لە ساڵی ۱۹۱۱ کۆتایی هات بە دامەزراندنی قوتابخانەیەکی گەورەی کچان بەناوی (لورا خضوري) کە (العازر خضوري) دروستیکردبوو وەک یادێک ناوی (لورا)ی خێزانی لێنابوو، لە ١٤ تشرینی دووەمی ۱۹۱۱ ئاهەنگێکیان سازکردو (جەمال پاشا) و گەورە فەرمانبەرانی حکوومەتی سەربازی و مەدەنی و پیاو ماقوڵان ئامادەی بیوون و (۲۱) هەزار لیرەی عوسمانی تێدا خەرج کرا و لە بەغداش بەخێرایی قوتابخانەی کچان و کوڕان دامەزرا، هەروەها بوونی باخچەی ساوایانیش رەچاوکرا.

لە ساڵی ۱۹۲۰-۱۹۲۱ ژمارەی ئەو قوتابیانەی کە قوتابخانەکانی جوولەکە بەخۆیەوە گرتبووی (۸۲۲۸) قوتابی بوون، ئەوەش ژمارەیەکی گەورەو بێ ژمار بوو کە بەسەر (۲٦) قوتابخانە دابەشکرابوون کە تەنیا لە پێنج شاری عێراقدا بوون لە بەغدا (۱۲) قوتابخانە و چوار قوتابخانەکەی دیکەش بەسەر هەریەک لە شارەکانی (بەسرە – موسڵ – حیللە – عەممارە) دابەشکرابوون ئەگەر بەراوردێک لە نێو ئەو قوتابخانانەی کە هی جوولەکە نەبوون بکەین دەبینین جیاوازییەکی گەورەو فراوانی هەیە، هۆزی مەسیحییەکان تەنها یەک قوتابخانەیان لە بەغدا هەبوو کە باوانی کرملیون دایانمەزراندبوو بە نێوی (قوتابخانەی – القدیس یوسف) بوو، زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی تێیدا دەخوێندراو منداڵانی تایفەکە سەردانیان دەکردن و لە سەرەتای دەسەڵاتی نیشتمانی قوتابخانەی (القاهرە) لە بەغدا دامەزرا کە سەر بە هۆزە کلدانیە مەسیحییەکان بوو، بەڕای من رەگەز پەرستی جیهانی زۆر بە زیرەکانە پیلانێکی فراوانی بۆ بڵاوبوونەوەی قوتابخانەکان لە عێراق و تەواوی وڵاتە عەرەبیەکان دارشت بۆ ئامادەکردنی نەوەیەکی گەنجیی جوولەکەی رۆشنبیر کە بە ئایین و زانست فێرکرابوون بەوەش نەوەستا، بەڵکو هەوڵیاندا بەناردنی هەندێ مامۆستا کە باش دەزانن چۆن تۆی ژەهراویبوون لە مێشکی

قوتابیـــەکان بچێنن تا ناچاریان بکەن زیاتر بە وڵاتەوە پەیوەســـت بن، لەکاتـــی داگیرکردنـــی بەریتانیا هـــۆزی جوولەکە ئەوەی قۆســـتەوە بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ دەســـەڵاتداری بەریتانیا لە ١٩٢١/٢/٢٢ واتە پێش دامەزراندنی حکومەتی عێراق و دانانی تەختی پاشـــایەتی بە پێنج مانگ جوولەکەکان داواکارییەکیان پێشکەشکرد بۆ دامەزراندنی یەکەم کۆمەڵەی رەگەزپەرســـتی لە عێراق و رەزامەندی لەســـەر داواکەیـــان وەرگیراو لە ١٩٢١/٣/٥ (هاروون ساسون ئەلیاهو ناحوم) بوو بەیەکەم سەرۆکی ئەو کۆمەڵەیە. لە ١٨٦٤/١٢/١٠ قوتابخانەی (الاليانس) دامەزرا هەر لەساڵی یەکەمدا و لە ماوەی چارەگی یەکەمی ساڵی خوێندنی ١٨٦٤-١٨٦٥ تەنها (٤٣) قوتابی لە خۆ گرتبوو دوایی لە ناوەڕاستی ساڵی خوێندنی هەمان ساڵدا ژمارەی قوتابییان بۆ (٧٥) قوتابی زیادی کرد..

لـــە ســـاڵی ١٩٠٧ قوتابخانەیەکی ئایینی تایبەت بـــۆ بڵاوکردنەوەی فێربوونی ئایینی جوولەکە و هەر شتێک پەیوەندی بە ئایینی جوولەکە هەیە لەلایەن کەســـێک بەناوی (ئیبراهیم عەبدوڵلا) دامەزرا، وەک رێز لێنانێک بەیادی خوشـــکەکەی (مەندالی — Mandali) کە قوتابخانەیەکی ئایینی بوو، قوتابی کە دەردەچوو پەیوەندی دەکرد بە قوتابخانەکانی (تەلمود و تەورات) بۆ بەردەوامبوونی لە خوێندن و وەرگرتنی پلەی بەرزی ئایینی، لە ســـاڵی ٤٩-٥٠ ژمارەی قوتابیانی گەیشتە (٨٧٠) قوتابی، لە ساڵی ١٩٢٨ پاش داگیرکاری بەریتانی بۆ ســـەر عێراق قوتابخانەی (شماس) ی ئامادەیـــی دامەزرا کە دوای قوتابخانەی (ئەلیانس) بوو، ئەویش هەر ســـەر بە کۆمەڵەی بەریتانی بوو (یعقوب شـــلومو شماس) دایمەزراندوو (١٧) حانوت و میوانخانەیەک و دەرمانخانەشـــی بۆ دروســـتکردبوو، لە قوتابخانەکە زمانی بیانی بەتایبەتی ئینگلیزی تێدا دەخوێندرا. لە ساڵانی ٤٤- ٤٥ قوتابخانەکـــە پۆلی ئێوارانی بـــۆ خوێندنی زانیاری بازرگانی و گواستنەوە کردەوە و بۆ ماوەی دوو ساڵ زمانی ئینگلیزی لە لقی بازرگانی دەخوێنرا، کە یەکەم لقی سیستەمی بازرگانی و خوێندن بوو لە عێراق لە ساڵانی ١٩٤٧ دوای دامەزراندنی کۆلێژی ئابووری و بازرگانی ئەو داخرا،

دەمانــەوێ یادی ئەو قوتابیانە بکەینەوە کــە هەموویان جوولەکەی کچ بوون وەکو وەجبەی یەکەم لە کۆلێژی ئابووری لە سالآنی (١٩٥٠-١٩٥١) دەرچوون و ناوەکانیش ئەمانەن:

١- رحمه طويق.

٢- سميحه يامين.

٣- جوليت حسقيل ناجي.

لە ســالّی ١٩٣٧ دوای ئەوەی خانەی مامۆســتایانی بالآ کرایەوە و خوێندنی تێدا بەردەوام بوو یەکەم وەجبەی قوتابی کە تێدا دەرچوون لە ســالّی (١٩٤٠-١٩٤١) بوو ژمارەیان ٩ قوتابی کچ بوو، دوانیان جوولەکە بوون بەناوەکانی (جوزیف سالّح و هیله موراد) کەلوپەلەکانی قوتابخانە لــە زۆرلاوە بۆیان دەهات، بەلآم زیاترینیان کە دەیانبەخشــی جوولەکە دەولّەمەندەکانی عێراق بوون لەپێــش هەموویانەوە بنەمالّەی (خضوري فرنــك عينی) بوو کە قوتابخانەیەکــی ناوەندی بەناوی خۆی دامەزراند، هەروەها خانەوادەی دانیال شعشوع (ساسون) شمطوب و شكر و هەندێکی دیکە بوون و قونســلگەری فەرەنســی لە بەغدا کە بارەگای ســەرەکی لــە پاریس بوو یارمەتی دارایی کە ســالآنە ٢٠٠٠ دینــاری عێراقی بوو پێشکەشی قوتابخانەی (الاليانس)ی ئیسرائیلی دەکرد و هەروەها سالآنە دیاری لەســەر شــێوەی کەلوپەلی قوتابخانە و پەڕاوگە و ئامادەکردنی کتێبخانەی قوتابخانەکان کە هەموو جۆرە کتێبێکی لە خۆ دەگرت پێیانی دەبەخشــی، وەزارەتی زانیاری عێراقی سالآنە وەک پالّپشتێک یارمەتی پێشکەشــی قوتابخانــە ئەهلییەکان لە عێراق دەکــرد، ئەوەی خوارەوە خشتەیەکە بەو بڕە پارەیەی کە بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەکانی جوولەکە لە عێراق وەریانگرتووە:

| ناوی قوتابخانه | بڕی پارەی ساڵانە |
| --- | --- |
| ١- مەسعود سلیمان | ٤٠ دینار |
| ٢- البیر داود ساسون | ٨٠ دینار |
| ٣- رفعه نۆرائیل | ٢٠ دینار |
| ٤- لورا خضوري | ٨٠ دینار |
| ٥- توعم و طوبه | ٦٠ دینار |
| ٦- راحیل شالمون | ٦٠ دینار |
| ٧- کان مناحیم دانیال | ١٣٠ دینار |
| ٨- الحله الابتدائیه | ٦٠ دینار |
| ٩- البصره الاسرائیلیه | ١٨٠ دینار |

تێبینی: بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانە پارمەتییە داراییەکانی وەردەگرت ئەگەر کەمیش بوایە کە لە راســـتیدا خەرجی قوتابخانە زۆر لەوە زیاترە کە ساڵانە دەبەخشرایە قوتابخانەکان.

لیژنەی قوتابخانەکان کە لە ئەنجوومەنی جەستەیی هۆزە جولەکەکان پێکهاتبـــوو چاودێری ئەو بڕە پارە زۆرەیان دەکرد بۆ خێرا بەڕێوەچوونی کاروانی فێربوونی جولەکە لە عێراق.

جووله‌که‌کان خولیای هونه‌رن به‌پێی ئاره‌زوویان بۆ هونه‌ره‌که به‌رێگه‌ی تایبه‌تـــی خۆیان بایه‌خی پێ ده‌ده‌ن، له‌م لایه‌نه‌دا رۆڵی خۆیان ده‌گێڕا و هـــه‌ر کاتێک ئاهه‌نگێک له گه‌ڕه‌که‌کانی خۆیان بکرایه زۆر به‌بێ ده‌نگی و به‌بـــێ هه‌راوهوریا ئاهه‌نگه‌که‌یان به‌ڕێوه ده‌برد له ترســـی ئه‌وه‌ی یه‌کێک که له ئایین و نه‌ته‌وه‌ی ئه‌وان نه‌بێت هه‌رچی خۆشـــی و شـــادییه لێیان بکات به ناخۆشـــی، به‌تایبه‌تی له کۆتاییه‌کانی ســـه‌رده‌می عوسمانی که له‌لایه‌ن ده‌ســـه‌ڵاته‌وه چاودێرییه‌کی توندیان له‌سه‌ر بوو، له‌وه ده‌ترسان که جووله‌کـــه‌کان له‌گه‌ڵ بیانییه‌کان هاوکارییـــان هه‌بێ چونکه ئه‌وکات ده‌سه‌ڵاتی عوسمانی له‌گه‌ڵ بیانییه‌کان له جه‌نگ دابوون.

له‌ســـه‌ره‌تا ئه‌وانه‌ی ئاره‌زووی هونه‌رو مه‌قامی عێراقی یان یه‌هودییان ده‌کـــرد به‌ده‌رکه‌وتن، هه‌روه‌هـــا حه‌زیان له به‌ســـته‌ی میللی و گۆرانی فۆلکلۆری ده‌کرد و تیپی مۆســـیقای (جالغـــی) به‌غدادیان پێکهێناو له خه‌ڵکانـــی دیکه جیاوازتربوون لـــه به‌کارهێنانی ئامێره مۆســـیقییه‌کان و ناوبانگیـــان ده‌رکرد، به‌شـــێکیان شـــوێنی رابواردنیـــان دامه‌زراند له سه‌رووی هه‌موویانه‌وه (تیاترۆ)ی (ساڵح حسقیل) بوو که به‌ناوبانگترین گۆرانیبێژی جووله‌که‌ی ده‌هێنا بۆ شوێنی خۆی له‌وانه گۆرانیبێژی ناسراو (روبیل رجوان) که ســـه‌رۆکایه‌تی (جالغی به‌غدادی) ده‌کرد و ئاگاداری ده‌ستپێکردنی ئاهه‌نگه‌که‌ی ده‌کرد، ئه‌ندامانی تیپی (جالغی) بریتیبوون له (نسیم یعمون) مۆسیقا ژه‌ن له‌سه‌ر که‌مان و براکه‌ی (شاؤول یعمون) له‌سه‌ر سه‌نتور و (حسقیل شاؤول) له‌سه‌ر ته‌پڵ و ئه‌وانه‌ی له کاره‌که‌یان لێزان و ســـه‌رکه‌وتووتر بوون (رحمان نفطار و ساســـون زعرور و حسقیل بیحی) بوون، کۆمه‌ڵه مۆســـیقا ژه‌نێکی دیکه‌ش هه‌بـــوون بریتیبوون له (ساڵح شمیل) له‌سه‌ر که‌مان و (حوکی سنیو) له‌سه‌ر سه‌نتور و (یوسف عمو) له‌سه‌ر ته‌پڵ که زۆر به‌ربه‌رێکانی له نێو ئه‌م دوو تیپه هه‌بوو.

له ســـاڵی ١٩٣٢ شـــاندێکی هونه‌ری به‌ره‌و قاهیـــره به‌رێکه‌وتن بۆ کۆنگره‌یه‌کـــی مۆســـیقایی له‌گه‌ڵ خۆیاندا گۆرانی بێژی ناســـراو (محمد الکبنجی) یـــان برد بۆ ئاهه‌نگێڕانی مه‌قامی عێراقـــی و ئه‌ندامانی تیپی

مۆسـیقای جوولەکەش لەوێ ئامادەبوون. لـە هەمان ڕۆژ هەواڵەکە بەم شێوەیەی خوارەوە لە ڕۆژنامە ناوخۆییەکان بڵاوکرایەوە.

## شاندی مۆسیقا ژەنانی عێراقی

قونسـڵی بەخشراو لە وەزارەتی دەرەوە خشتەیەک ناوی ئەو مۆسیقا ژەنانەی وەرگرت کە لە پیاوانی کارو گۆرانی بێژەکانی بەغدا پێکهاتبوون لە کۆنگـرەی مۆسـیقایی نوێنەراتیان بکەن کە لە ناوەڕاسـتی مانگی دادێ لە قاهیرە دەبەسـترێ حکومەتی عێراقیش ڕەزامەندی لەسەر ئەو خشـتەیە نیشاندا و خەرجی سەفەری شاندی مۆسیقا ژەنانی عیراقیشی پێ بەخشین کە وەکو هەموو شاندی وڵاتە عەرەبییەکان سەردانی میسر دەکەن، ئەو ناوانەی کە جەنابی خاوەن شـکۆی قونسـڵی میسری وەک لیستێک وەریگربوو ئەوانەبوون.

١- محمد الکبنجی: مەقام بێژ.
٢- یوسف بتوحوکی: سەنتور ژەن.
٣- عزوری یوسف : قانون ژەن
٤- حسقیل : کەمانچە ژەن.
٥- ابراهیم صالح: تەپل لێدەر.

بەناوبانگترین مەفام بێژی عێراقی (یوسف حوریشو) بووە کە لە وتنی مەقامـی (خەنبات) بەناوبانگ بوو کە کاریگـەری هەردوو گۆرانی بێژی بەناوبانگ (احمد زیدان) و (روبیل رجوان)ی لەسەر بوو، گۆرانییەکانیشی لەسەر شریتی بەکرە تۆمارکرابوون لەلای ئارەزوومەندانی مەقامی عێراقی پێشوازییەکی گەرمی لێکرا.

بـەڵام ئافرەتە جوولەکەکانیش تیپی مۆسـیقای خۆیان هەبوو و لە ئاهەنگەکان بەشـداریان دەکرد ئەو ئامێرانـەی بەکاریان دەهێنا (تەپڵ و دەف) بـوو لەگەڵ چەقەنە لێدان و ئـەوەی ئاهەنگەکەی زیاتر خۆش دەکرد (الدقاقات) یان پێدەگوت واتە لێدەرکات و گۆرانی بێژێکیشـیان هەبوو بەناوی (مسعودە البمبیە) وەک پەیوەندییەک و نزیکبوونەوەیەک

لە شاری بۆمبای هیندستان، ئەوەی خوارەوە دێڕێکە لە گۆرانییەکان.

عفاکی عفاکی علی الفند اللی عملتینو

انا تعبت و انا اشقیتو علی الحاضر اخدتینو

هەروەهــا لە کۆمەڵگەی جوولەکەکان هەنــدێ هونەرمەندانی ئافرەت بەدەرکەوتن کە رۆڵێکی دیاریان لە کاروباری رابواردن و هونەردا هەبووە، دیارترینیــان هەر چوار کچەکــەی (مراد) بــوون بەناوەکانی (ریجینە — مســعودە — روزە — ســلیمە (باشــا) بوون، هەریەک لەم ئافرەتە هونەرمەندانەی ناویان هاتووە چیرۆکێکیان لە کۆمەڵگەی بەغدا هەبووە، بەناوبانگترینیان (ریجینە) بووە کە خاوەنی سامانێکی ئێجگار زۆر بووەو کۆشکێکی گەورەی لە شەقامی عەسکەری بۆ دروستکراوە کە بەگەورەترین کۆشک لەو ناوچەیە دەژمێردرا. بەڵام تێیدا نیشتەجێ نەبووە لەبەر ئەوەی بەدەستی هاوســەری دووەمی کوژرا کە ناوی (عەبدولکەریم) بوو کاری ئەندازیاری دەکرد، و هاوسەری یەکەمیشی ناوی (محەمەد) بوو هەر لەو کاتەی کە لەلای هاوسەری یەکەمی بوو ئەو ناوبانگییە زۆرەی دەرکردبوو، جێی وەبیرهێنانەوەیە کە (عەبدولکەریم)ی هاوســەری کاتێ (ریجینە)ی خێزانی کوشت و لە هەمان رۆژدا خۆشی کوشت، بەم بۆنەیەوە شاعیری میللی عێراقی (مەعروف کەرخی) لەســەر کوشــتنەکەی (ریجینە) ئەو دێڕە شیعرەی نووسیوە.

اه بالدینار من جیبی طفر صبحت ریجینه مضروبه بطبر

ئاخ بۆ دیناری لە گیرفانم دەرپەڕی کاتی لەخەوهەستان بوو ریجینە بەتەوراێی درابوو

پــاش کۆچی دوایی (ریجینــە) دەوڵەمەندی ناســراو (نوری فەتاح) کۆشــکەکەی کڕی، و هەروەها (ســلیمە پاشــا)ی خوشــکی (ریجینە) ئەویش رۆڵێکی گەورەو بەرچاوی لە شانۆی بەغدا بینیوە و لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا ناوبانگییەکی زۆری بەدەستهێنا و مێردی بەگۆرانی بێژی ناسراو (نــازم غەزالی) کرد و ژیانی هاوســەرێتیان بەردەوام بــوو تاکو کۆچی

دوایی مێردەکەی کە لە ســالّی ١٩٦٣ دابــوو، ئەویش وەکو وەفایەک بۆ مێردەکەی هەموو ڕۆژانی پێنج شــەممە لە هەموو هەفتەیەک ســەردانی گۆڕەکەی دەکرد کە لە گۆڕســتانی (الغزالی) نێژرابوو، بەڵام (سـلیمە).
ش لە ســالّی ١٩٧٤ لە یەکێک لە نەخۆشــخانەکانی بەغدا کۆچی دوایی کرد و ئەرکی ناشتنەکەی هاوڕێکەی هونەرمەندی خاتوو (عفیفە اسکندر) گرتبوویە ئەســتۆی خۆی، هەروەها چەندان ئافرەتــی دیکە پەیدابوو کە سەرپەرشــتیان لەســەر بەڕێوەبردنی کارەکانی دەکرد بەتایبەتی هەردوو کچەکانی (توحە) کە ناویان (لیلو و خزنە) بوون کە لەســەر تەختەکانی شانۆی بەغدا وەکو سەماکارێکی جوان و بەرچاو دەرکەوتبوون و هەروەها گەشتیارێکی زۆریش ئامادەی ئاهەنگەکانی ئەو سەماکارە دەبوون کە ناوی (حنینە) بوو، سەماکانی لەسەر تەختی شانۆی (ئوتیل متروپول) دەکرد کە لە شــەقامی ڕەشــید بوو، بەڵام ئەوانی دیکە هەمان ڕێگایان گرتبووە بەر ئەوانیش (ریمە ام عظام و ریمە حکاك) بوون کە شوێنی نیشتەجێی لە (عگد الجام) بوو لە گرنگترین دەلالەکانیش (کرجی) بوو کە بەناوبانگترین کــەس بوو ئــەو کارە خراپ و ناو زڕێنەی لە نێــو جولەکەکانی بەغدا لە ساڵانی سییەکان و چلەکاندا بکات، ئەو کارەشی لە یەکێک لە گەڕەکەکانی بەناوی گەڕەکی (تەورات) دەکرد و لە ئافرەتە خۆفرۆشەکانیش کچەکانی (مریــم خان) کــە (تفاحە و نجیبــە و رجو) بوون و لــە بەناوبانگترین مەیخانەکان کە لە پێشــەوەی هەموویــان دابوو مەیخانەی (صالح) کە لە بەغدا بوو، خواردنەوەی ســەرەکی جوولەکــەکان ئارەق بوو کە بەهەزارو دەوڵەمەندەوە دەیانخواردەوە و مەزەشــیان لە ســنگی مریشــک دروست دەکــرد و گوێزو فســتەقیان لەگەڵ تێکەڵ دەکرد، بــەڵام گرنگترین ئەو یانانەی کە جوولەکەکانی عێراق لە چینی ناوەڕاست بۆ سەرەوە سەردانیان دەکرد یانەی (لورا خضوري) بوو ئەو یانەیە (الیعارز خضوري) لەسەر ناوی خێزانەکەی دروستیکردبوو، و هەروەها یانەی ڕەشیدیش هەبوو و ڕێگایان بەو کەسانە نەدەدا سەردانیان بکەن ئەگەر جوولەکە نەبوونایە.

چینە ملییەکانیش ئێواران ســەردانی ئــەو قاوەخانانەیان دەکرد کە

هەر لە گەڕەکەکانی خۆیان بوون و دەڵەمەندەکانیش لەکاتی ئێواراندا لە قاوەخانەی (موشی) (شابەندەر) (ممیز) و شوێنی دیکەش کاتەکانیان بەسـەر دەبرد، زۆربەی جوولەکەکان چ لە بەغدا یان لە شارەکانی دیکە خاوەنی سـینەمای خۆیان بوون بەناوبانگترینیان سـینەمای (سنترال) بوو کە بەردەوام فیلمی وای پیشـان دەدا کە لەگەڵ هەوەس و نەریتی خەڵک بەگشـتی لە بەغدا نەدەگونجا زۆر لە ڕۆژنامە نیشتمانییەکانیش باسـیان لەو جۆرە فیلمانە کردووە کە چیتر نیشـان نـەدەن و ڕێز لە پیرۆزی کۆمەڵگەی عێراق بگرن، جارێکیان لە کاتی نمایشکردنی فیلمێکی ئینگلیزی بەناوی (شەوێک لە قاهیرە) مشتومڕێک لەسەر ئەوە پەیدا بوو لەبەر ئەوەی فیلمەکە لە ڕەوشـت دووربوو بۆیـە ڕۆژنامەکانی نیگەران کردبـوو داوایان لـە ئەمینداریيەتی پایتەخت کردبـوو کە فەرمانێک بۆ خاوەن سینەمایەکان دەربکات کە چیتر بەردەوام نەبن لە نیشاندانی ئەو جۆرە فیلمە نەشیاوانە.

لە ئێوارەی ڕۆژانی شەممە دانیشتوانی گەڕەکەکان و شەقامی غازی و دەوروبەری و دانیشتوانی گەڕەکی (السنک) سەردانی باخچە گشتییەکان دەکەن، بەڵام دانیشـتوانی گەڕەکەکانی (البتاوین والسـعدون والکرادە) سەردانی پارکی (سـەعدون)یان دەکرد، دوای ئەوەی خواردنی تایبەتی دەکوڵێنن بۆ ڕۆژی شـەممە ئامادەی دەکـەن گرنگترین ئەو خواردنانە (السـبوت) بوو کـە لە برنج و مریشـک و هێلکەی کـوڵاو پێکهاتبوو بەشـەوان لەسـەر ئاگرێکی نـەرم دەیانکوڵاند و بۆ بەیانیش دەسـت دەکرا بەگەشـت کردنەکەیان و بۆ ئەوانـەیماڵیان لە پارکەکە دووربوو عارەبانەیان بەکاردەهێنا و ئەوانەشی ماڵیان نزیک بوو هەر بەپێ لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەیان هەریەکە و کیسەیەکی پڕ لە شتومەکی پێویستی گەشتەکەیان لەگەڵ خۆیان دەبرد و سەردانیان دەکرد و کاتێکی خۆشیان بەسەر دەبرد.

سەرچاوەکان

- د. فاضل البراك، المدارس اليهوديه والايرانيه في العراق.
- يوسف غنيمه، نزهه المشتاق في تاريخ يهود العراق.
- صبيحه الشيخ داود، اول الطيق.
- الدليل العراقي الرسمي لعام ١٩٣٦ .
- امين المميز، بغداد كما عرفتها.
- عبدالكريم العلاف، بغداد القديمه.
- فخري الزبيدي، بغداد ١٩٠٠-١٩٣٤ .

دوای هەڵگیرســانی شۆڕشی ١٤ی تەمموز لە عێراق و نەمانی رژێمی پاشــایەتی و دامەزراندنی رژێمی کۆماری ئەو جوولەکانەی نیشــتەجێی عێراق بوون بە شــێوەیەکی بەرچاو و بەخێرایی کەم دەبوونەوە و ئەوەی زیاتر بووە هۆی ئەوەی کە کۆچ بکەن و وڵات جێبهێڵن سەردەمی کۆماری بوو بە پێچەوانەی ئەو پێشکەوتنە زۆرەی کە جوولەکەکان لە سەردەمی رژێمی پاشــایەتی لە عێراق دەیانبینی. لەگەڵ ئەوەی پیاوانی شــۆڕش دڵنیابوون، کە هاوڵاتیانی عێراق لەسەدەمی نوێدا پابەندن بە یاسا، بەڵام ئەوە بێسوود بوو بەرامبەر بەکۆچکردنی جوولەکەکان بۆ دەرەوەی وڵات، دوای ســێ هەفتە پاش هەڵگیرسانی شۆڕش یەکەم بازرگانی جوولەکەی عێراقیان دەســتگیرکرد بەتۆمەتی قۆرخکردن و فرۆشتنی گوێزانی ریش تاشین لە جۆری (ناسیت) بە نرخێکی بەرز کە نوێنەری گشتی کۆمپانیای (برایانی حســو) بوو. تاوانبار. (موشی هارون شوحیط) بۆ ئەنجوومەنی عورفی ســەربازی نێردرا و لە رۆژی ١٩٥٨/٨/٤ دادگایی کراو بۆ ماوەی ســێ مانگ دەســتگیرکراو لەگەڵ بژاردنی بڕی ١٠٠ دینار. سزاکەشی بۆ ماوەی شەش مانگ دەبێ ئەگەر ئەو بڕە پارەیە نەدات.

لە هەمانکاتدا یەکێک لە ئافرەتە جوولەکەکان، کە دەیویست بەرێگەی فڕۆکــەوە عێراق جێبهێڵێت، بەڵام لە فڕۆکەخانە دەســتگیر دەکرێ، کە بڕێــک دیناری عێراقــی و زێڕو پارەی پێبوو. ئــەو ئافرەتە جوولەکەیە نــاوی (ئەلبرتین) کچی (عــزرا مناحیم دانیال) بــووە دوای ماوەیەک دەســتگیرکردن ئازاد دەکرێ ئەویش لەبەرئەوەی هیچ بەڵگەیەکی وایان بەدەست نەبووە پێی تاوانبار بکەن. بۆ لێکۆڵینەوە لەم کێشەیە سەرۆک وەزیران (عەبدولکەریم قاســم) خۆی بەدواداچوونی بۆ کرد و فەرمانیدا بە ئامادەبوونی مولازمی یەکەمی پۆلیس (عەمید — یوسف ئەلسەعدی) کە وەک ئەفســەرێکی پۆلیسی گومرگ لە فڕۆکەخانەی بەغدادی مەدەنی کاری دەکرد، کە ئامادەبێت بۆ وەزارەتی بەرگری و روونکردنەوەی خۆی بدات دەربارەی ئەو کێشەیە. دوای گوێگرتن لە تەواوی رووداوەکە لەلایەن ئەفسەرەکە ســەرۆک وەزیرانیش بڕیاریدا دۆسییەکە دابخرێت، سەبارەت

بەو رووداوە کە سـالّی ١٩٨٢ بوو (یوسف ئەلسـەعدی) خۆی تەواوی رووداوەکـەی بۆ گێڕامەوە و گوتی: کە خانەوادەی (مناحیم دانیال)، کە ماڵەکەیان لە ناوچەی (السنک) بوو، داوەتێکیان بۆ کردم لە ماڵەوەیان و دیارییەکی بەنرخشیان پێشکەش کردم بەرامبەر بەو گەواهییە رەوایەی، کە لە بەرژەوەندی ئەوان داومە، بەڵام دیارییەکەم رەتکردەوە و لە جیاتی ئەوە قتوویەکی کێکی باشـم وەرگرت. ژمارەیـەک لە خاوەن کارەکانی جوولەکە بەبێ وەستان و بەشێوەیەکی رێکوپێک لەکارەکانیان بەردەوام بوون، لەو خشـتەیەدا ناوی ئەو پزیشک و پارێزەرە جوولەکانە هاتووە، کە لە دوای هەڵگیرساندنی شۆڕش لە کارەکانیان بەردەوام بوون..

**پزیشکەکان**

١- د. ئیحسان سمرە- بەغدا.

٢- د. ئەلبیر ئەلحەکیم- بەغدا.

٣ دکتورە ئەلبرتین مەنشی ئیبراهیم- بەغدا.

٤- د. ئەلبیر ساسون شەمطوب- بەغدا.

٥- د. جاک عەبودی شابی- بەغدا.

٦- د. جەمیل مەنشی ئیبراهیم- بەغدا.

٧- د. خضوري نەسیم- بەغدا.

٨- د. داود روبین کەبایی- عەممارە دوایی بەغدا.

٩- د. ساسون بولبول- بەغدا.

١٠- ساسون خەزام- بەغدا.

١١- د. عەزرا نەسیم تەرزی- بەغدا.

١٢- دکتورە فیولیت شاؤول طویق- بەغدا.

١٣- د. کرجی رەبیع- بەغدا.

١٤- د. منیر سەلمان هارون- بەغدا.

١٥- د. ناجی روبین کوهین- بەغدا.

١٦- د. یوسف عەزرا داود حەییم- بەغدا.

دەرمانخانەکان

١- دەرمانسازی کیمیاوی/ ئیدوارد عەبودی شابی- بەغدا.

٢- دەرمانسازی کیمیاوی/ ئیدوار رەبیع- بەغدا.

٣- دەرمانسازی کیمیایی/ ئەلیاهو روبین ئەلعانی- بغداد.

٤- دەرمانسازی کیمیاوی/ حەسقیل مەناحیم نەقار- بەغدا.

٥- دەرمانسازی کیمیاوی/ عەزرا یەهود سومیخ- بەغدا.

٦- دەرمانسازی کیمیاوی/ عەبودی موشی- بەغدا.

٧- دەرمانسازی کیمیاوی/ نەعیم ئیبراهیم شوحیط- بەغدا.

٨- دەرمانسازی کیمیاوی/ یەعقوب ئەلیاهو دەلال- بەغدا.

پارێزەرەکان

١- پارێزەر ئەنوەر شائول- بەغدا.

٢- پارێزەر شوعە سەبون جیجی- بەغدا.

٣- پارێزەر سەبون شوعە سەبن- بەغدا.

٤- پارێزەر ناجی ئەلیاهو- بەغدا.

٥- پارێزەر نەعیم موشی کوهین- بەغدا.

زۆربەی خاوەن کارەکانی دیکە بەتایبەتی لە کەرتی بازرگانی بەشێوەیەکی سروشتی لە کارەکانیان بەردەوام بوون، بەتایبەتی کەرتی جلوبەرگی خودی پیاوان. هەر بەخۆشیان هاوردەیان دەکرد و زۆربەشیان لە شەقامی (السمؤال) بڵاوببوونەوە، کە پێی دەگوترا (شەقامی بنوک) و ژمارەیەک لە دەلالەکان کە لە هەموو جۆرە کارەکان هەتا سەرەتای حەفتاکان لە کارەکانیان بەردەوام بوون. وەکو بەڵگەیەک بۆ گیانی لێبوردەیی و نەبوونی دوژمنایەتی ئەنجوومەنی شۆڕش بڕیارێکی دەرکرد بۆ ئەو جوولەکانەی کە هەر کاتێک بۆیان رەخسا بۆ نیشتمانەکەی خۆیان بگەڕێنەوە.

دوای دامەزراندنی رژێمی کۆماری ژمارەیەکی کەم لەو قوتابیانەی کە ئەوێییان جێنەهێشتبوو بەشێوەیەکی رێکوپێک لە زانکۆو کۆلیژەکان و

قوتابخانە ناوەندی و دواناوەندییەکان لە خوێندنەکانیان بەردەوامبوون.

شایانی باسە جوولەکەکان بەدرێژایی کات لە عێراق بەردەوامی ژیانیان لە خۆشـــی و شادیدا بووە، شتێکی ئاســـاییە گەر تووشی گرفت ببنەوە وەکو زۆربـــەی میللەتانی وڵاتان، کە لە لایەن دوژمنانیەوە هەڕەشـــەی لێکراوەو کەمەنەتەوایەتییەکانیش لەم پەلاماردانە بێ بەش نەبوونە.

ئەوەی سەیرێکی مێژوویی عێراقی بکات هەر لە یەکەم داگیرکاری کە لە ساڵی ١٢٥٨ز لەسەر دەستی (هولاکو)وە هەتا داگیرکاری شەڕی (ام المعارک) پێی سەیر دەبێت، کە ئەو خاکە بەدرێژایی سەدان ساڵ لەلایەن دوژمنانەوەچی بەسەر هاتووە.

## ناوە درەوشاوەکانی نێو کۆمەڵگەی جوولەکانی عێراق

شـــتێکی ئاساییە لە هەموو هۆزێک و لە هەموو جۆرە کۆمەڵگایەک و لە هەر بەشـــێکی ئەو جیهانە فراوانە و لەگەڵ بەســـەرچوونی کات چەند ناوێکی گەشـــاوە کە وەکو ئەستێرەیەک دەدرەوشـــێتەوە هەبێت. نەک تەنهـــا لەنێو کۆمەڵگەکەی خۆی، بەڵکو لەنێو کۆمەڵگە گەورەکانیشـــدا ناوبانگیان بڵاوبۆتەوە.

چەند کەسێکی دیار لە هۆزەکانی جوولەکە لە عێراق رۆڵێکی بەرچاو و پتەویان لەگەڵ تەواوی تاکەکانی نێو کۆمەڵگەدا هەبووەو چاودێریکردن و یارمەتـــی داون بەناردنیـــان بۆ زانکۆکانی وڵات و رێگەی زانســـتی بۆ واڵاکردن بۆ ئەوەی ئاستی هۆشیاری و زیرەکیان شانبەشانی هاوڕێکانیان ببێـــت ئەوانە کـــە جوولەکەش نین، بۆ نموونە کۆمەڵێک لە پزیشـــک و پارێزەر و ئەندازیارو چەندانی دیکە کە لە بەشە زانستەکانی تر دەرچوون و خوێندنەکانیـــان تەواوکرد. هەروەها کۆمەڵگـــەی عێراقی پارێزەرێکی دڵسۆزو هاوسۆزی دەوڵەمەندە جوولەکەکان بوو بە هیچ شێوەیەک ئازاری نەدەدان، بەڵکو بەرگری لە بازرگانییەتی و کەلوپەلەکانیشیان دەکرد.

ئەو چواردە کەســـایەتییەی، کـــە هەڵمانبژاردووە بەشـــێوەیەک لە شێوەکان و هەریەکەیان بەپێی پسپۆڕی و بنکەو شوێنەکەی خۆی لەگەڵ

تەواوی کۆمەڵگەدا پەیوەندییەکی تەواویان هەبووە، بێگومان کەسانی دیکەش هەبووە، کە ڕۆڵیان لە کۆمەڵگایەکی تەسکی جوولەکەدا هەبووبێ، لێرەدا باسیان ناکەین لەبەرئەوەی ڕۆڵەکانیان سنووردرابووە و تەنها پاڵپشتی داراییان بۆ ڕێکخراوە خێرخوازییەکان هەبووە، یاخود ئەوانەی لە چینە موڵکدارەکانن بەهیچ شێوەیەک پەیوەندییان بەکۆمەڵگەوە نییە، بۆیە ناوەکانیان لە بازنەیەکی تەسکدان و تەنها چەند کەسێک دەیانناسن، بۆیە لەم لێکۆڵینەوەدا چاوپۆشیمان لێکردن و باسەکەمان کورت کردۆتەوە بۆ پانزە کەس هیوادارم سەرکەوتووبم لەو کارەی کە پێی هەڵدەستم بۆ ناسینیان بە نەوەی داهاتوو و شارەزابوونیان بە جوولەکەکانی عێراقەوە.

**١- مناحیم سالح دانیال:**

لە سەرۆک هۆزەکانی ئیسرائیل بووە لە ساڵی ١٨٤٦ لە عێراق لەدایکبووە لەو کەسانە بووە کە بۆ هیچ شتێک بۆ کۆمەڵگەکەی خۆی درێغی نەکردووە سەبارەت بە یارمەتی و هاوکاری هەژاران و نەخۆشان و نەخوێندەواران لێهاتوو و بەتوانابووە، لەبەرئەوەی کەسێکی تێگەیشتوو و لێزان بوو لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکان بە پلەی جێگر هەڵبژێردرا بۆ نوێنەرایەتیکردنی شاری بەغدا لە ئەنجوومەنی نێردراوانی تورکی لە ئەستانە. لە ساڵی ١٨٧٨ لەگەڵ دامەزراندنی میرنشینی عێراقی (مناحیم دانیال) یەکەم جوولەکە بوو بە پلەی ئەندام لە ئەنجوومەنی پیرانی عێراقی کاری کردووە و لە ساڵی ١٩٢٥ دەستەی کارگێڕی پاشایەتی لە ئەنجوومەنی ناوبراو بە ئەندام دایمەزراند، هەروەها دووبارە لە خولی دووەمی ساڵی ١٩٢٩ دامەزرایەوە دوای ئەوەی نەخۆش دەکەوێت لە ساڵی ١٩٣٢ کوڕەکەی بەناوی (عزرا) لە شوێنی ئەو دادەمەزرێ.

یارمەتییەکانی (مناحیم دانیال) لە پرۆژە خێرخوازییەکان بەردەوام بووە، سەرەتا بەشداری لە دامەزراندنی قوتابخانەیەک کردووە، کە قوتابخانەی (مناحیم دانیال)ی سەرەتایی کچان بووە و بەشێک لە سامانەکەی بۆ بەڕێوەبردنی پێداویستییەکانی دارایی ئەو قوتابخانەیەی،

که خوێندنی ئینگلیزی و عەرەبی تێدا دەخوێندرا بۆساڵی خوێندنی ٤٩-٥٠ تەرخانکردبـــوو، کە ژمارەی قوتابییەکان ٤٦٠ قوتابی بوون، هەروەها یارمەتی دارایی زۆری پێشکەش بە سندوقی ئەنجوومەنی هۆزەکانی کردووە، کە تایبەت بوو بە یارمەتیدانی هەژارو لێقەوماوان و پێگەیەکی بەرچاویی لەنێو هۆزەکەی، هەروەها لەنێو کۆمەڵگەو حکومەتیشـــدا هەبووە، دوای ئەوەی کۆشـــکی پاشایەتی میر فەیسەڵی یەکەم لە ئەعزەمییە لەناوچوو کۆشکەکەی (مناحیم دانیال)، کە لە ناوچەی (السنک) بوو بەشێوەیەکی کاتی کرا بە بارەگای پاشایەتی و مەلیک فەیسەڵی یەکەم بۆ ماوەی دوو هەفتە لەوێ مایەوە، هەروەها گرنگترین زانیاری کە دەســـتمان کەوتووە کە تایبەتە بەخانەوادەی دانیال ئەو زانیاریانەی خوارەوەیە کە لە گۆڤاری (لغە العرب)دا هاتووە کە باس لە:

**٢- یەکەم فڕۆکەوانی عێراقی دەکات:**

ناوی (ســـەلیم ئەفەندی) بـــرای (مناحیم دانیال) بـــووە، لە وڵاتی ئینگلتەرە هونـــەری فڕۆکەوانی فێربووە، فڕۆکەیەکی بۆ خۆی کڕیبوو لە بەریتانیای گەورەوە سەفەری بۆ بەغدا پێکردووە و لەکاتی رۆژئاوابوون و لە مانگی کانوونی دووەمی ســـاڵی ١٩٣٠ گەیشتە جێ و لە فڕۆکەخانەی رۆژئاوای بەغدا دابەزی و لە لایەن کەســـوکار و خزمانی پێشـــوازییەکی گەورەیان لێکرد ئێمەش شـــانازی بـــەوە دەکەین، کە لە پارەی تایبەتی خۆیـــەوە فێری هونـــەری فڕۆکەوانی بووە، لەو بـــاوەڕە داین حکومەت بەزانست و شارەزاییەکەی سوودی لێوەردەگرێت.

گۆڤاری (لغە العرب).

ژمارەی دەرچوو لە (١٩٣٠) لاپەڕە ١٥٧.

(ئەنوەر شائول)ی شاعیر وەکو رێزلێنانێک هۆنراوەیەکی بەناونیشانی (یەکەم فڕۆکەوانی عێراقی) لە رۆژنامەی (الحاصد)ی ســـاڵی دیاریکراو بڵاوکردەوە..

ئەو فڕۆکەیەی باســـی لێوەکرا بۆ ماوەی ســـی ســـاڵ بـــوو واتە لە ناوەڕاســـتی شەستەکاندا لە باخچەیەکی پشـــتەوەی کۆشکەی (دانیال)

دا سەری داپۆشـــرابوو و خۆڵی لەسەر نیشتبوو ئاشکرا کراو راگەیاندنە ناوخۆییەکان زۆر شتیان لەسەر نووسیبوو.

لەو کارە خێرخوازییانەی (دانیال) کردوویەتی ســەرفکردنی بوودجە بۆ دروســتکردنی قوتابخانەیەکی بێ سەرپەرشــتان، کــە بۆ کۆمەڵەی خێرخوازی ئیســلامی دەگەڕێتەوە. بۆ ئەو مەبەســتە هەموو کۆمەڵگەی عێراق بەگشتی ئەو کارە مرۆڤانەیان بەرز نرخاند و (مەعروف رەسافی) شاعیریش بە بۆنەی کردنەوەی ئەو قوتابخانەیە هۆنراوەیەکی پێشکەشکرد و ئەو کارەشی بەکارێکی خێرخوازی گەورە وەسفکرد.

**تێبینی:**
**بۆ خوێندنەوەی ئەو هۆنراوەیە، شــاعیر لــە دیوانەکەی خۆیدا بڵاویکردۆتەوە لە دیوانی (الرصافی) چاپی (١٩٥٦) لاپەرە ٢٢٥).**

**٣- خضوري و عزرا میرلاوی**

یەکێکە لە بازرگانە خاوەن دەسەڵاتدارە بەهێزە ئابوورییەکانی عێراق و هەریەک لە (ئیبراهیم و شەفیق عەدەس) پسپۆڕیان لە ئۆتۆمبێلەکانی (فۆرد) هەبوو. کۆمەڵەی لاوی یاخود (بیت لاوی) کە لە عێراق بەگشتی وا ناونــراوە ئەوانیش لە ئۆتۆمبێلە بەناوبانگەکانی ئەمەریکایی لە جۆری (بیوک) و (شوفرلێت) پســپۆڕبوون، هەروەها کەلوپەلە یەدەگەکان لە پێش هەموویانەوە کەلوپەلی کارەبایی ناوماڵ وەکو بەفرگرو جلشۆرو شتی دیکەشیان فرۆشــتووە، لەنێو هەردوو کۆمەڵەدا کێبڕکێ بۆ برەو پێدانی ئۆتۆمبێل کرا، بە تایبەتی بۆ پڕکردنەوەی پێداویســتییەکانی ســوپا بۆ ئۆتۆمبێلە بارهەڵگرەکانی (٢ تەنی) و (٥ تەنی) سەرەتا ئۆتۆمبێلەکانیان بۆ پیاوە گەورەکانی وڵات دانا، هەریەکەو بەشێوەیەکی جیاواز دروستکرا. شێخ (محەمەد مەهدی کوبە) باسی لەوە کردووەو دەڵێ: لە ساڵی ١٩٤٨ کە بەپلەی وەزیری تەموین دامەزرام یەکێک لە ئۆتۆمبێلەکانی کۆمپانیای (لاوی)م هەڵبژارد، کاتێ نوێنەری کۆمپانیاکە و بەڕێوەبەری گشتی هاتن بــۆ لام بۆ جێبەجێکردنی مامەڵەی کڕینی ئۆتۆمبێلەکە پێی گوتم: ئێمە

وەكــو نەریتێكی خۆمان بۆ خاوەن وەزیرە باڵاكان بەتایبەتی بۆ وەزیری تەموین ئێوە چۆنتان پێ باشە ئاوا داشكاندنتان بۆ دەكەین، منیش گوتم: نەخێر هیچ كەمكردنەوەیەكم ناوێ، بەڵكو نرخی دیاریكراوی خۆی چەندە ئەوە بڵێ، وەك لە بیرم بێت پێشەكییەكەی سەد دینار بوو، پێشكەشیم كردو ئەو پارەیەی كە مایەوە بەشــێوەی قیستی مانگانەی لەسەر چەك ئیمزام كردو دواتر هەموو پارەكەم لەكاتی دیاریكراوی خۆی دایەوە.

**٤- ئیبراهیم و شەفیق عەدەس:**

هەردوو برا (ئیبراهیم وشــەفیق عــەدەس) بەناوبانگترین بازرگانی عێراق بوون لەگــەڵ دامەزراندنی كۆمپانیاكەیــان توانیان گەورەترین و بەناوبانگترین بریكاریەتی بازرگانیان دەســت بكەوێت، لەوانە كۆمپانیای دروستكردنی (Ford) بۆ بەرهەمهێنانی ئۆتۆمبێل بەهەموو جۆرەكانییەوە لەگــەڵ بەرهەمهێنانی فڕۆكەش، كە لە ڕێبەری بازرگانی عێراقی ســاڵی ٣٦ نــاوی چل و یەك كۆمپانیای جیهانی بۆ بەرهەمهێنانی بەناوبانگترین پیشەســازی ســووك و قورس ناویان هاتووە، كە ئەوانیش نوێنەراتییان لەگەڵدا هەبووە، شایانی باسە هەردوو برا (ئیبراهیم و شەفیق) بەرەگەز جوولەكەی لوبنانین. (ئیبراهیم) لە بەغدا دەژیا و (شــەفیق)ی براشــی لە بەســرە نیشــتەجێ ببوو، لەوێ لقێكی كۆمپانیایەكەیــان هەبوو بۆ بازرگانــی ئۆتۆمبێل و كەلوپەلە یەدەگەكان. (ئیبراهیم) كە بازرگانیەتی هاوردەكردنی ئۆتۆمبێلی جۆری (فۆرد)ی دەكرد بەكەسێكی قسە خۆش و لێهاتوو ناســرا بوو، هەربۆیە كەسانی بەرپرس لە هەموو شوێنەكانەوە دەهاتن ئۆتۆمبێلیان لێدەكڕی و بۆ پروپاگەندەكردن و زیاتر فرۆشــتنی ئۆتۆمبێلەكان زۆر زیرەكانە ڕەفتــاری دەكرد. ئوتومبێلەكانی بە وەزیر، یان بەڕێوەبەری گشتی دەفرۆشــت، دوای ساڵێك كە بەكاریان دەهێناو دەیانگەڕاندەوە بۆ ئەوەی ئوتۆمبێلی دیكەی تازە وەربگرن دواتر هەمان ئوتۆمبێلی بەخاوەن شوفێری كڕییەكان دەفرۆشتەوە، ئەو كارەی دەكرد دوای ئەوەی كە دڵنیا دەبوو كە دەســتكەوتی هەیە یان نا، جگە لەوەی كە بەشێوەی قیست دەیفرۆشت خەڵكیش ئەو كارەیان پێ باش بوو.

دکتۆر (کەمال ئەلســامەرائی) باســی ئەو (ئیبراهیم)ە دەکات، کە ئەرکی خەرجی نەشــتەرگەری بۆ ئافرەتێکی ناســیاوی خۆیان گرتبووە ئەســتۆی خۆی، کە تووشی ئاوسانی ســمتی هاتبوو، دوای ئەنجامدانی نەشــتەگەرییەکە بەسەرکەوتوویی بڕی پێنج ســەد دیناری بەرامبەر بە ماندووبوونەکــە پێدام، ئەویش لە ســاڵی ١٩٤٨ بوو، واتە بەر لەمردنی ئیبراهیــم بەچەند مانگێــک. هەروەها دکتۆر دەڵێ: مــن ئەوکاتە تەنها بڕی (٧٠) دینارم بەرامبەر هەر نەشتەرگەرییەک وەردەگرت. (ئیبراهیم) تووشی نەخۆشی (گول)ی هات و بۆ ئەوەی لەگەڵ خەڵک تێکەڵ نەبێت لە ماڵەکەی خۆی بەندکرا.

تــا رۆژێک تاوانبارێک لە ژووری جێشــتخانەوە بۆی دەچێتە ناوەوە لــە ماڵەکەی خۆی بە چەقــۆ دەیکوژێت. لە هەمــان مانگدا برایەکەی بــە تۆمەتی قاچاغکردنی چەک و تفاق و فرۆشــتنی بــە جوولەکەکان لەکاتی شــەڕی فەلەســتیندا لە ســێدارە دراوە لەکاتی دووەم جەنگی جیهانی ئەوەش بەســەرپێچی دەژمێردرێت. سەرۆک وەزیران (مەزاحەم ئەلباچەچی) ســەردانی راســپێردراو میر (عەبدولئیلاە)ی کردووە باسی ئــەو پروپاگەندەیەی کردووە، کە گوایە جوولەکەکان نیو ملیۆن دیناریان بەئێوە بەخشیوە بۆ ئەوەی سزای لە سێدارەدانی کەم بکرێتەوە بۆ حوکمی هەتاهەتایە، دوای ئەوەی (عەبدولئیلاە) گوێی لە قســەکانی ســەرۆک وەزیران بوو، گوتی: بڕیاری لە ســێدارەدانی دەرکراوەو جێبەجێشــکرا. بەو شێوەیە ژیانی هەردوو برا لە ماوەی مانگێکدا و لە ساڵی ١٩٤٨ بوو کۆتایی پێهات.

مامۆســتا (میر بەســڕی) باس لە ســێدارەدانی (شەفیق عەدەس) دەکات، کە بەخێرایی هەوڵی دەرەکی لەلایەن دەســەڵاتی بێگانە درابوو بۆ رزگارکردنی شــەفیق لە پەتی سێدارە. هەروەها (بەسڕی) دەڵێت، لە ســێدارەدانی بازرگان (شەفیق عەدەس) لە بەسرە، کە لە ١٩٤٨/٩/٢٣ ئەنجامــدرا، هەڵچوونێکی جەماوەریی و هاواری پارتی ســەربەخۆیی و راگەیاندنەکانــی وروژاند و داوای بــە فیرۆنەدانی خوێنی (عەدەس) یان

دەکرد، بەڵگەنامە فەرمییەکانی بەریتانیا دوای (٣٠) سـی سـاڵ چەند نهێنییەکی ترسناکی سـەبارەت بەهەوڵی هەردوو حکومەتی بەریتانیا و ئەمەریکا بڵاوکردۆتەوە، هەردوو حکومەت گەڕاونەتەوە بۆ باڵوێزخانەکانیان لە بەغدا بۆ سـەردانی سـەرۆک وەزیرانی عێراق و ئەمیر (عەبدولئیلاه) پێداگرتنیان لەسـەر جێبەجێنەکردنی فەرمانی لە سـێدارەدان. (هنری باک) بۆ سـەرۆک وەزیران (مزاحەم باچەچی) نووسـیبووی، کە رژێمی بەریتانیا رێگە نادات و لەگەڵ ئەوە نییە کەسـێکی بێ تاوان لە سێدارە بـدرێ. ئەویش وەڵامـی داوەتەوە کە ئەو فەرمانە نە لە دەسـت ئەمیر (عەبدولئیلاه)و نە لەگەڵیشی دایە، بەڵام لەو بڕوایەدایە، کە جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە لە بەرژەوەندی وڵاتە، هەروەها باڵیۆزی ئەمریکی نامەیەکی بۆ ئەمیر ناردووە و دەڵێ: باڵیۆزخانەی نەتەوە یەکگرتووەکان فەرمانێکیان دەرکردووە و ناڕەزایی خۆیان بە لە سێدارەدانی ناوبراو دەرکردووە، گوایە ئەگەری کاریگەری بۆ سـەر ڕای گشتی ئەمەریکی و جیهان هەیە و زیان بەکێشەی فەلەستینیش دەگەیەنێت.

بـەڵام ئەو فەرمانە لە توانای نەبووە، کە کەمی بکاتەوە لە ترسـی ئەوەی مەترسی بۆ سەر ئاسایشی ناوخۆ لەلایەن سوپاو میللەتەوە هەبێ و جگە لەوەش کۆشـکی میریش تووشـی گرفت ببێـت. هەروەها (میر بەسـڕی) دەڵێ: کە ئەمیر (عەبدولئیلاه) بۆ باڵیۆزی ئەمەریکی (جورج وارتی) روونکردۆتەوە، کە ئەو ناتوانێ هیچ شـتێک بکات تەنها دەتوانێ سزاکە جێبەجێ بکات.

**٥- (ساسون حەسقیل):**

لە ساڵی ١٨٦٠ لە بەغدا لە دایکبووە و خوێندنی سەرەتایی لە بەغدا و دواناوەندیشـی لە لەندەن و پلەی بەرزیشـی لە ڤییەنا تەواوکردووە، وەکـو یەکەم عێراقی بڕوانامەی پارێـزەری بە پلەی یەکەم لە وەزارەتی داد لە ئەسـتانە وەرگرتووە، لە یەکەم کاریدا وەکو وەرگێڕێک لە بەغدا کاری کردووە، یەکێکە لـە بلیمەتەکانی ئابووری و کاروباری دارایی، لە سـەرەتای لاوێتیدا سەرکاری چەند پلەیەکی ترسناکی کردووە، هەروەها

لە ئەنجوومەنی نێردراوانی تورکی زیاتر لە جارێک نوێنەرایەتی عێراقیان کردووە، یەکێک بووە لەو دوو عێراقیانەی کە لە کۆنگرەی قاهیرەی ساڵی ١٩٢١ ئامادە بووە، میر فەیسەڵ وەک پاشای عێراق لەگەڵ هاورێکەی (جەعفەر ئەلعەسکەری) بۆ هەڵسوڕاندنی کاروبارەکانی هەڵبژاردن خۆیان ئامادەکرد. لە دوای دامەزرانی دەسەڵاتی نیتشمانی لە عێراق (ساسون حەسقیل) لە پلەی وەزیری دارایی بۆ پێنج جار دانراوە و لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر رووداوی ئابووری عێراق و چۆنیەتی بووژاندنەوەی داناوە و لە ساڵی ١٩٢٥ رۆڵی دانوستاندنی نەوت لەگەڵ لایەنی ئینگلیزی زۆر دیار بوو، کاتێک لەو دانوستانەدا ئاماژەی بە زیادکردنی وشەی (زێڕ) لەسەر رستەی (چوار شلن)دا لەکاتی بژاردنی دەسکەوتی نەوت، کە نە بەریتانیا و نە بانکی ئینگلیزی بیریان لە هەرەسهێنانی پاوەنی ئینگلیزی نەکردبۆوە. بەو شێوەیە هیچ جوولەکەیەک ئەو پلەیەی دەستنەکەوتبوو، کە (ساسون) لەنێو دڵی عێراقییەکاندا بەدەستیهێنابوو و هیچ شاعیرێکی موسڵمانیش وەکو (مەعروف رەسافی) شیعری لاواندنەوەی بۆ کۆچی دوایی (حەسقیل) نەنووسیبوو ئەو کاتەی لە ساڵی١٩٣٦ کە لە پاریس بوو هەواڵی مردنی (ساسون)ی پێگەیشت (فەخری جەمیل) کە وەزیری هەرێم بوو چەند بەسەرهاتێکی خۆشی (ساسون حەسقیل) دەگێڕێتەوە دەڵێ: جارێکیان پەیامنێری رۆژنامیەکی بیانی هاتە ژوورەوە بۆ لای (عەبدولڕەحمان نەقیب)، کە لەنێوان هەندێ لە وەزیرەکان دانیشتبوو بۆ ئەوەی گفتوگۆیەکی رۆژنامەیی لەگەڵدا ساز بکات چەندین پرسیاری ئاراستەکردو تاوای لێهات بێزار بوو لێیان و رووی کردە وەزیر (ساسون)، کە ئەو وەڵامی پرسیارەکانیان بداتەوە و پێی گوت. ئێوە هەردووکتان بێ باوەڕن و دەزانن وەڵامی یەکتر بدەنەوە. شایانی باسە حکومەتی بەریتانیا لە ساڵی ١٩٢٣ خەڵاتی (K.B.E) بەخشیوە بە (ساسون) هەروەها لە ١٢/٤ لە ئاهەنگێکی تایبەتدا نێردراووی بەریتانی پەردەی لەسەر پەیکەری سەرکردەی گشتی سوپای بەریتانیای (ژەنەڕال مود) لادا. کە سێ جاریش وەکو ئەندام لە ئەنجوومەنی نوێنەرایەتی هەڵبژێردرابوو

و زمانەکانــی (عەرەبی و تورکی و فەرەنســی و ئینگلیزی و ئەڵمانی و عیبرانی و یۆنانی و لاتینی) دەزانی.

**٦- دکتۆر داود روبین کبای:**

دکتۆر داود لە خولی پێنجەمی ســاڵی ١٩٣٨ لە کۆلیژی پزیشــکی عێراقی دەرچووە، ســەرەڕای بوونی بە پزیشکێکی گشتی و پاڵپشت بە بەهرەکــەی بە هەردوو لایەنی زانســتی و کۆمەڵایەتی یەوە، توانیویەتی هەنــگاو بە هەنگاو بە پلیکانەی ناوداری ســەربکەوێت، دکتۆر کبای لە ناوچەکانی باشوور لە عێراق کاریکردووە و لە شاری عەممارە جێگیربووە و خزمەتگوزارییــە پزیشــکەییەکانی بۆ ئەو ناوچەیــە تەرخان کردووە، توانــرا پەیوەندییەکی بەتین لەگەڵ زۆربەی خەڵکەکانی ئەو ناوچەیە بە هەموو جۆرە چین و توێژەکانییەوە ببەستێت، لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٤ عیادەکەی خۆی بۆ بەغدا گواستەوە و خانوویێکی لە گەڕەکی (البتاوین) بە کرێ گرت و هەر لە ئەوێش عیادەکەی خۆی دانا، دوای چەند مانگێک ناوی لە نێو خەڵکی بە شــێوەیەکی خێرا وەکو مرۆڤێکی بە ستایش لە بەهرەی پزیشــکی و مرۆڤایەتی بڵاوبۆووە، لە ســاڵی ١٩٦٥ یەکێک لە نەخۆشەکان بۆی باس کردم کە خەڵکی باشوور بە پاسێکی دار کۆمەڵێک نەخۆشی هەڵدەگرت و دەچوونە بەغدا بۆ سەردانی دکتۆر (کبای) هەموو ئێوارەیەکی پێنج شــەممە شوفێری پاسەکە لە شــوێنێکی دیاریکراوی شــاری عەممارە ئەو شوێنەی کە عیادە کۆنەکەی لێبوو هاواری دەکرد و دەیگوت (کبای...کبای...کبای) ئەو کەسانەی کە نەخۆشن و دەیانەوێ سەردانی دکتۆر بکەن ناوی خۆیان دەنوسی بۆ ڕۆژی دواتر بە ئۆتۆمبیل بەرەو بەغدا بەڕێدەکەوتن و لەدوای چارەسەرکردنی نەخۆشەکان بەهەمان شێوە دەگەڕانەوە بۆ شارەکەیان و لە کاتی پشکنین دا هەر نەخۆشەو بە پێی توانای خۆی پارەی پێدەدا و ئەویش رازی دەبوو.

شــایانی باسە من لە ســاڵی ١٩٧٤ لە لەندەن لە ناوچەی (بیکادلی ســرکس) چاوم بە دکتۆر (کبای) کەوت دوای ئەوەی لەکەسایەتییەکەی دڵنیابــووم چــووم بە زمانی عەرەبی ســڵاوم لێکــرد ئەویش خەریکی

ڕۆژنامەیەکی ئینگلیزی بوو پەڕەکانی هەڵدەدایەوە و بە شێوەیەکی جوان وەڵامی سـەلامەکەی دامـەوە وتم دکتۆر من یەکێکم لە نەخۆشـەکانت دوای وتووێژکردن بە خەمبارییەوە باسـی لەو بڕە پارەیەی کرد کەلەلای ناسیاوێکی خۆی دایابوو دواتر حاشای لێکردووە، ئیتر ناچاربووە بەپێ عێراقی جێهێشـتووە و تا گەیشـتۆتە لەنـدەن دوای کۆتایی هێنان بە قسـەکانی پرسیاری بژێوی ژیانیم لێکرد و گوتی: هەر ماوە ماوە هەندێ لە نەخۆشـخانەکان داوای پزیشـکی ئیشـکگر دەکەن منیش هەفتەی جارێک یـان دووجار بەرامبەر بە کرێیەکی دیاریکـراو لەوێ کاردەکەم، دوای ماڵئاواییم گوتی سڵاوم بۆ هەموو خەڵکی بەغدا بنێرە چونکە ئەوان ئازیزن لەلام منیش گوتم بە دڵنیاییەوە و ڕۆیشـتم. هەروەها خۆشترین ڕووداو کەلە ژیانی دکتۆر بەسـەری هاتووە ئـەو چاوپێکەوتنە جیاوازە بووەکە لە سـاڵی ١٩٦١ لەگەڵ (سـەرۆک وەزیران) عەبدولکەریم قاسم هەیبـووە ئەوکاتەی کە لە خوێندنی دواناوەندی بەیەکەوە هاوڕێ بوونە. دەڵێ جارێکییان پیاوانی ئاسـایش هەڵیانکوتاوەتە سـەر ماڵەکەی بە بیانووی ئەوەی بۆ بەرژەوەندی ئیسرائیل سیخوڕی کردووە و بڕی بیست ویەک هەزار دیناریان دەسـت بەسەر داگرت و دوای ئەوەی چەند ڕۆژێک دەسـتگیرکرا و بە کەفالـەت بەردرا، ناچار بووە کەسـەردانی بارەگای سـەرۆک وەزیران لە وەزارەتی بەرگری بکات بۆ ئەوەی چاوی بە دکتۆر (کەمال سامەرائی) بکەوێت کە ئەویش هاوڕێ قوتابخانەی بووە، دکتۆر کبای دەڵێ: هەر لەبەر دەرگاوە بە خۆشـحالیەوە پێشوازییەکی گەرمی لێکردم و دوایی قاوەیەکیشـی بۆ بانگکردم و بەیەکەوە باسـی ڕۆژانی خۆشی قوتابخانەمان دەکرد لە کۆتاییدا داوای لێکردم کە چ یارمەتییەکم دەوێ پێشکەشـم بکات. منیش کاغەزێکم لە پێش داناو سکاڵایەکم تێدا نووسیبوو باسـم لەوبڕە پارەیە کردبوو کە پۆلیس لێیان بردبووم و ئەو تاوانەشـی کە خسـتبوویانە پاڵم، کاغەزەکەی لێوەرگرتم و خوێندیەوە و لە کۆتایی کاغەزەکەدا لەسـەری نووسـی (ئەو بڕە پارەیە بۆ دکتۆر بگەڕێتەوە و لەبەر ئەوەی من دەیناسـم هەرگیز سـیخوڕی لەسەر وڵات

ناکات، پاشـــان بانگی یاوەرەکەی کرد کە ناوی (وەسفی تاهیر)بوو پێی گووت کە خۆی لەگەڵ پەیوەندارەکان بە دواداچوون بکات).

**٧- ئەنوەر هارون شائوول:**

نوسـەر و هەڵبەسـتوانێکی داهێنـەر و ڕۆژنامەنووسـێکی دیـارو پارێزەرێکـی بەناوبانگ بووە، بۆ ماوەیەکـی زۆر کاری ئەدەبی کردووە و چەندیـن چیرۆکی بۆ پاڵپشـتی کردن لە ئەدەبـی عەرەبی هەبووە، لەسـاڵی ١٩٦٥ کتێبێکـی بە ناوی (فی زحـام المدینه — لە جەنجاڵی شاردا) دەرکردووە ئەویش کۆمەڵە چیرۆکێکی کۆمەڵایەتی و فەلسەفیە، ڕاستیەکانی کۆمەڵگەی عێراقی بە شێوەیەکی تایبەتی چارەسەر دەکات و کۆمەڵگەی عەرەبیش بە شێوەیەکی گشتی دیارترین چیرۆکەکانی (فی زحام المدینه) (معلم اللغه) (الوجه المهشمه) (دکتور یسری).

بەڵام لە گۆرەپانـی هۆنراوەدا دیوانێکی بە ناوی (همسـات الزمن) هەیـە کە لـە کۆمەڵە هۆنراوەیـەک پێکهاتووە کە بە هێزی دارشـتنی زمانەکە دەسەلمێنێ، (ئەنوەر شائول) یەکێکە لە دڵسۆزەکانی شاعیری فەیلەسووف (الزهاوی) ئەویش کۆڵەکەیەکی ئەنجوومەنەکانی فەلسەفی هاوچەرخ بـووە، هەروەها چیرۆکی (بائعه الشـوک) لووتکەی بەرهەمە شیعرییەکانییەتی لە نێو کۆمەڵگەی عێراقیدا سۆزی نەتەوایەتیشی لەگەڵ هەژارترین چین و توێژەکاندا هەبووە. لە هۆنراوە ناسـراوەکانیدا (دمعه الفقید) و (الفلاح المنکوب) لە دارشـتنی دێرە شیعرییەکانی سەرکەوتن یـاوەری بووە بۆ ئەوەی ببێتە گەورەتریـن چیرۆکە کۆمەڵایەتییەکان لە دیوانی شیعری عێراقیدا.

(ئەنوەر شـائول) پارێزەرێکی شـارەزاو بە ناوبانگ بووە ماوەیەکی دوورو درێژ کاری لە پارێزەریدا کردووە، نوسـینگە کەشـی لە شەقامی (السـمؤال) بووە، زمانە زیندووەکانیشی وەکو ئینگلیزی و فەرەنسی و فارسی و تورکی زانیووە.

چەند کتێبێکی وەرگێردراوی دەرکردووە لەوانە (الحصاد الاول) (قصص من الغـرب) (ولیم تل) (اربع قصص محلیه)و هتد.. مامۆسـتا (عباس

العزاوی) له کتێبی (العراق بين احتلالين) باسی (ئەنوەر شائوول) دەکات کە نەوەی (صراف باشي- ساسون اباروبين) لەسەردەمی عوسمانییەکان لە ولایەتی بەغدا بووە هەروەها کاری رۆژنامەنووسی کردووە، گۆڤارێکیشی بەنـــاوی (الحاصد) لە ١٩٢٨\١١\٢٨ دەرکـــردووە، گۆڤارەکە بۆ ماوەی زیاتر لە چوار ساڵ دەرچووە،

لە ســـاڵی ١٩٣٥ هۆنراوەیەکی بەناونیشـــانی (الی بائعه الشـــوک) رێکخستبوو کە پێشتر لە گۆڤاری (الرساله) کە خاوەنەکەی (احمد حسن الزيات) بوو بڵاوی کردۆتەوە .. هەروەها دکتۆر (فازل البراک) دەڵێ کە (ئەنوەر شـــائوول) لە ساڵی ١٩٨٠ یادەوەرییەکانی لە کتێبی (قصه في وادي الرافدين) بڵاوکردۆتەوە کەلە بڵاوکراوەکانی یەکگرتووی زانکۆکانی جوولەکە ئاوارەکانە لە عێراق.

**٨- دکتۆر کرجی عزرا ربيع:**

پزیشکێکی جوولەکەیە لە تەوای ناوچەکانی عێراق بە خێراییەکی زۆر ناوبانگی دەرکردووە، لەســـاڵی ١٩٣٢ یەکێک بووە لە نۆ دەرچووەکانی خولی یەکەمی کۆلێژی پزیشـــکی میرنشـــینی عێـــراق، دوای دەرچوونی بڕیاردرا بە ناردنی بۆ لەندەن بۆ بەردەوامبوونی وە دەستهێنانی زانستی بەرز ئەویش لەگەڵ هەردوو لە هاورێکانی هەڵبژێردران ئەوانیش (دکتۆر بیثون رسام و دکتۆر جاک عبودی شابی) بوون.

لەگەڵ ئەوەشـــدا دکتۆر کەرجی وەکو پزیشـــکێک لە نەخۆشخانەی میـــری لـــە بەغدا کاریکـــردووە و هەروەهـــا وەکو وانە بێـــژ لە کۆلێژی پزیشـــکی لە ماددەی فســـیۆلۆژی لە ژێر فەرمانی سەرۆک بەش دکتۆر (کندی) وانەی گوتۆتەوە و پســـپۆری لە نەخۆشییەکانی هەناو هەبووە هیچ پزیشـــکێکی عیراقی لەسەردەمی ئەودا ئەو ناوبانگییەی ئەو هەیبوو کەســـی دیکە دەری نەکردبوو، لە ژێر دەستی ئەودا چەندان خانەوادەی بەناوبانگ لە بەغدا و زۆر لەبەرپرســـان لەسەرووی هەموویانەوە سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانی کوچکردوو (ساڵح جەبر) و ئەندامانی خێزانەکەی بوون بە پزیشک عیادەکەی دکتۆر کەرجی کەوتبووە شەقامی رەشید کە

بنکەی پزیشـــکانی بەغدابوو بەرامبەر بە بانکی ناوەندی عێراقی ئێستا، دەرمانساز (ئەلبیر رەبیع) دەرمانخانەیەکی راستەوخۆ لە ژێر عیادەکەی برای کردبۆوە ئەو نەخۆشەی کەلەلای دکتۆر کەرجی برای دەهاتە خوارێ دەچووە ئەو دەرمانخانەیە، تاکو ناوەراســتی شەستەکان دکتۆر کەرجی لە عێراق لەکاری پزیشـــکی بەردەوام بووە. پاشـــان عێراقی جێهێشتووە بەرەو فەلەستین رۆیشتووە لەوێ ماوەیەکی دوورودرێژ وەک بەڕێوەبەری تەندروستی قودس کاریکردووە.

**٩- دکتۆر جاک عەبودی شابی:**

لە مێژووی پزیشـــکی عێراقیدا (دکتۆر جـــاک) وەک بەناو بانگترین پزیشـــک ناوی دەرکردبوو لە ســـاڵی ١٩٣٢ لە خولـــی یەکەمی کۆلێژی پزیشـــکی میـــری عێراقی دەرچووە، ژمارەی دەرچـــووان تەنها نۆ کەس بوون هەر لەســـەرەتاوە نیشـــانەی زیرەکی ولێزانـــی لێبەدەرکەوتوە لە هـــەردوو لایەنی (تیۆری و تەختەبەندی) لێکۆلینەوەی کردووە، ئەو کاتە نە لە کۆلێژی پزیشـــکی ونە لە نەخۆشـــخانەی میری بەشی تایبەت بە نەخۆشیەکانی دەمارگیری و عەقلی) لێنەبوو، دکتۆر جاک ئەوەی خستە ئەستۆی خۆی هەڵسا بە دروســـتکردنی نەخۆشخانەی (دار الشفاء) کە بەشێکی تایبەت بووە بە نەخۆشیەکانی (عەقلی)، دکتۆر (هانس هوف) پزیشکێکی ئەڵمانی پسپۆر بە نەخۆشیەکانی (عەقلی و دەمارگیری) بوو هاتە عێراق کەلەبەر زوڵم وســـتەمی هیتلەر هەڵاتبوو.. دکتۆر جاک وەکو یاریدەدەرێک لە عیادەکەی دکتۆر هانس کاریدەکرد و زیاتر شـــارەزابوو. هەروەها چالاکییە زانستەکانیشی نوێکردەوە وەکو یاریدەدەری مامۆستا بۆ نەخۆشـــیەکانی عەقڵـــی و دەمارگیری لە کۆلێژی پزیشـــکی دامەزرا و لە ژێر دەســـتی ئـــەو کۆمەلێک کەس تەواو یان کـــردووە و بوون بە پزیشـــک . (جاک) یەکەم پزیشک بوو کە لە پێش هەموویانەوە بە ناوی خۆی نەخۆشخانەیەکی تایبەتی دامەزراند بەناوی (نەخۆشخانەی دکتۆر جاک عەبودی بۆ نەخۆشـــخانەکانی عەقڵی و دەمارگیری) شـــوێنەکەی کەوتبووە سەر ڕێگای ســـەربازگەی رەشید هەردەم (عیادەکەی) پڕبوو

له نەخۆشـــی چەندەها ناوچەی عێراق بـــە ڕۆژهەڵات و باکوور و ڕۆژئاوا تەنانەت نەخۆشەکان لە هەندێ وڵاتانی عەرەبی دراوسێشەوە سەردانیان دەکرد، بەڵگەش بۆ ئەو ناوبانگییە بەر فرەوانە دووکەس زۆر بە توڕەیی بەشەڕ دێن یەکێکیان دەڵی برۆ شێتە بۆ لای دکتۆر جاک لە عیادەکەی، لەدوولا دەتوانرا بچن بۆ عیادەکە یەکەمیان لەشەقامی رەشید گۆرەپانی (الغويری) و دووەمیش لە ناوچەی (حافیز قازی) تەنیشـــت میوانخانەی (ئەلمە شـــرق)ی ئێســـتا دکتۆر جاک لە ژیانی زانستیەوە بەردەوام بوو بە پێشکەشـــکردنی باشـــترین خزمەتگوزاری بۆ هاوڵاتیانی عێراقی بەبێ جیاوازی تاکو کۆتایی ســـاڵی ١٩٦٧ ئەو کاتە عێراقی جێهێشت و بەرەو ســـوید ڕۆیشـــت و وەکو بەڕێوەبەر لە یەکێک لە نەخۆشخانەکانی ئەوێ کاریکرد.

**١٠- موشی مەنشی شەعشوع:**

بـــە بە ناوبانگترین کەســـایەتی جوولەکە لە عێـــراق دەژمێردرا هۆی ناوبانگییەکەیی و چۆنیەتی دەســـتکەوتنی لەبەر ئەوە بووە کە خاوەنی (کۆشکی شەعشوع) بوو ناوبانگی کۆشکە کە بە خاوەنەکەیەوە نوسابوو، هیچ کەســـێک نە ناوی خاوەن کۆشک و نە ناوی باوکی یان نەدەزانی و هیچ زانیارییەکی دیکەیان سەبارەت بە خۆی و خانەوادەکەیان نەدەزانی تەنهـــا ئەوەی زانرابوو لـــەلای خەڵکی بەغدا کە تەنها کۆشـــکێک هەیە بەناوی کۆشکی شەعشـــوع کەلە هەموو کۆشکەکان ناوبانگی زیاتر بوو. تاکو ئێســـتاش وەکو نموونە دەیهێننەوە هەرکاتێک یەکێک لە هاورێکەی دەپرسێ (پێم بڵێ خانووەکەت تەواو بوو) ئەویش دەڵێ نەخێر یەکەمیان دەڵێ ئەوەبوو بە چی ئەو خانووە؟ خۆ کۆشکی شەعشوع دروست ناکەی چیرۆکی کۆشکەکە چییە؟

لەساڵی ١٩١٠ و لەسەرەتاکانی ئەو سەدەیە دەوڵەمەندی جوولەکەی عێراقی (موشـــی مەنشـــی شەعشوع) بڕیاری دروســـتکردنی کۆشکێکی گەورەی بۆ نیشـــتەجێ بوونی خۆی دا، بۆ جێبەجێ کردنی ئەو پرۆژەیە زەوییـــەک بەرووبەری زیاتر لە پێنج هەزار مەتـــر دووجای هەڵبژارد کە

کەوتبووە ناوچەی (الکسرە) کە بەسەر رووباری دیجلەدا دەیڕوانی، بۆ دروستکردنی ئەو کۆشکە لەسەر تازەترین نەخشەدانانی ئەو کاتە دەستپێکرا. دوای تەواو بوونی کۆشکەکە کە هەروەکو گەوهەرێک لە بەغدا دەدرەوشایەوە . کاتێ میر فەیسەلێ یەکەم گەیشتە بەغدا و کۆشکەکەی بۆ بەتاڵ کرد بۆ ئەوەی تا ماوەیەک ببێتە شوێنی نیشتەجێی خاوەن شکۆ، تاکو کۆتایی بە نۆژەنکردنەوەی کۆشکی پاشایەتی خۆی دێت هەر لەو کۆشکە پێشوازی لە وەزیرەکان و پیاوانی وڵات دەکرا، دانیشتن و کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی وەزیرانی تێدا دەبەسترا. پاش ماوەیەک بڕیاری فرۆشتنی کۆشکەکەیدا (جعفر ابو التمن) لێی کڕی بەڵام نرخەکەی ئاشکرا نەکراوە کە بەچەند فرۆشراوە و هەروەها مێژووی کۆچی دوایی شەعشوع و هەر شتێکیش کە پەیوەندی بە منداڵە کانییەوە هەبووە نەزانراوە تەنها کوڕێکی بە ناوی (مەنشی) هەبووە کەلە شەقامی (ابی نواس لە تەنیشت میوانخانەی الامباسادور) نیشتەجێ بوو و تەمەنیشی لە دەوری حەفتا ساڵی دابووە کە ئافرەتێکی جوولەکەی هێناوە، بەڵام هیچ منداڵێکیان نەبوو.

**١١- داود سەمرە:**

مامۆستا داود بە شێخی یاساناسەکان و پێشەنگی پارێزەران و مافپەروەران دەژمێردرا، توانایی و لێهاتووی لە کاروباری یاسایی هەبووە. لە زمانەکانی عەرەبی و تورکی و ئینگلیزی و فەرەنسی و جوولەکەییدا کارامە بووە. لەسەر دەمی عوسمانییەکان وەکو ئەندامێکی دادگای تێهەڵچوونەوە لە بەغدا و موسڵ کاری کردووە، لە ١٩١٨\١\١١ وەک دادوەرێک لە دادگا دامەزرا و دواتر لە ١٩١٩\١١\١١ لە دادگای تێهەڵچوونەوەی عێراق وەک دادوەر کاریکردووە لە ١٩٢٣\٤\١١ تا کۆتایی سییەکان وەکو جێگری سەرۆک کاریکردووە و پاشان لە دادگای تەمیزی عێراقی وەک ئەندام هەڵبژێردراوە و بۆ ماوەی پانزە ساڵ لە ئەندامێتی بەردەوام بووە، پاشان بە پلەی جێگری سەرۆکی دادگای تەمیزی عێراقی تا هەڵگیرسانی شۆرشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ کاریکردوە. لە

ســـەرەتای دامەزراندنی کۆلێژی ماف وەکو مامۆستایەک وانەکانی یاسای دەســـتوورو ماف و یاســـای بە جێهێنان دەگوتەوە چەندین نووسراو و توێژینەوە و لێکۆلینەوەی بە نرخی لە بابەتەکانی پســـپۆری خۆی هەیە ئەویش ســـەلماندنێکە بۆ مافەکانی دادوەری، هەروەها لەســـەر دەستی دیارترین پارێزەر و دادوەرانی عێراق خرێندویانەوە بڕوانامەی دەرچوونیان وەرگرتووە، لە ناوچەی (السـعدون) بەرامبەر کۆشـکی سـپی (القصر الابیض) نیشـتەجێ بووە، شایانی باسە مامۆستا (داود سەمرە) لەبەرە بەیانی ١٤ی تەمووزی سالّی ١٩٥٨ ڕۆژی شۆڕشی عێراق خۆی و شوفێرە تایبەتییەکەی کە ناوی (حاجی سالّح) بوو لەناو ڕووباری دیجلەدا مەلەیان دەکرد و هەوالّی هەلّگیرسـانی شۆڕشیان گۆی لێبوو وبینیان کە (نوری سـەعید) داوا لە راوچییەکی ماسـی دەکات کە بە هۆی بەلەمەکەیەوە بۆ کەناری ئەو بەری ڕووبارەکە بیگوازێتەوە. لە سـالّی ١٩٤٦ مامۆستا (سەمرە) خانەنیشین کراو و لە سالّی ١٩٦٠ کۆچی دوای کرد.

**٩٢- میر بەسری:**

یەکێکە لە شـارەزایانی ئابووری و نوسـەرو ئەدەبیێکی دیاربووە لە سالّی ١٩١٢ لە شاری بەغدا لە دایکبووە، بابەتەکانی ئابووری خوێندووە و ئەدەبی عەرەبیشی خوێندووە لە ڕۆژنامەکانی (البلاد- الزمان- الحاصد- الاخبار) هی دیکەشـی نوسیووە، یەکەم جوولەکە بووە کە لە وەزارەتی دەرەوە کاری کـردووە کە لـە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسـی و عیبری و ئەدەبیاتەکانـی لێهاتووە بووە، پاشـان وەکو بەڕێوەبەری گشـتی لە ژووری بازرگانـی کاری کردووە، لە سـالانی ١٩٣٨-١٩٤٥ لە ماوەی ئەو هەشـت سالّەدا بەرپرسـیاریەتی گۆڤارێکی مانگانەی کردووە، لە سالّی ١٩٣٦ سەرپەرشـتی لەسـەر دەرچوونی بەشـی ئینگلیزی لە ڕێبەری عێراقی کردووە لە سـالّی ١٩٤٤ ژووری بازرگانی وەکو نوێنەری خۆیان بۆ کۆنگرەی بازرگانی جیهانی ناردبوویان کە لە شـاری نیویۆرکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا سـاز کرابوو، پاشان بە ئەندام لە ئەنجوومەنی گشـتی و ئەنجوومەنـی کارگێری لیوای بەغدا هەلّبژێـردرا، دواتر وەکو

بەڕێوەبـــەری بازرگانی لە بەڕێوەبەرایەتـــی کۆمەڵەی خورمای عێراقی و جێگری بەڕێوەبەری گشـــتی دامەزرا و لەســـەر ئابووری عێراقی چەندین بەرهەمی چاپکراوی هەیە لەوانە (رجال و ضلال) (نفوس ضامئه) (اعلام العراق)هتد.. لە ناوەراســـتی حەفتاکان سەرۆکایەتی هۆزی موسەوی لە عێراق پشتگیرییان لێکردووە و لە کارەکەی بەردەوام بووە تا ئەو کاتەی عێراقی جێهێشتووە، لە ساڵی ١٩٥٥ کتێبی (رجال و ضلال)ی دەرکردووەکە بریتی بوو لە کۆمەڵێک چیرۆک کە ئەندێشەکانی کۆمەڵگەی تێدا نوسیوە. هەریەک لە خوا لێخۆشـــبووان شـــێخی رۆژنامە نوسانی عێراقی (رفائیل بطی) و مێژوو نوســـی عێراقی (عباس العزاوی)و زانای بە ناوبانگی زمان (مصطفی جواد) پێشـــنیاریان بۆ کتێبەکەی و بەهرە و تواناکەی کرد تا بتوانێ لە نوسینی هونەری چیرۆک بەردەوام بێت.

**١٣- دکتۆر ئەحمەد نەسیم سوسە:**

یەکێکە لەزانا باشـــەکانی ئەندازیاری کشـــتوکاڵ و ئاودێری لە ساڵی ١٩٠٠ لە شـــاری حیللـــە لە دایکبووە. خوێندنی ســـەرەتایی لەوێ تەواو کردووە و پاشـــان بۆ تەواوکردنی قۆناغی خوێندنی دواناوەندی سەردانی بەیرووتـــی کردووە و بڕوانامەی ئامادەیی بە دەســـتهێناوە و پاشـــان لە ســـاڵی ١٩٢٨ لـــە زانکۆی کولور لە وڵاتـــە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە کالۆریۆســـی لـــە ئەندازەی شارســـتانی وەرگرتووە لە ســـاڵی ١٩٣٠ لە زانکـــۆی (جون هوبکنس) بڕوانامەی دکتـــۆرای بە پلەی نایاب وەرگرت و لە زانکۆی واشـــنتۆن خەڵاتی (وبدیل) کە هەموو ســـاڵێک دەدرێت بە باشـــترین نوســـەری وتار دوای ئەوەی بۆ ماوەی شـــەش ساڵ لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا مایەوە گەڕایەوە بۆ عێراق و لە ساڵی ١٩٣٠ بە ئەندازیار لە فەرمانگەی ئاودێری دامەزرا و بۆ ماوەی حەڤدە ساڵ مایەوە و بەوردی پـــرۆژە ئاودێرییەکانی لە عێراق جێبەجـــێ دەکرد، خوێندنی زانستی بە شێوەیەک خستبوویە سەرشانی خۆی کە جێگای سەرسورمان و خۆشحاڵی بوو، پاشان بە بەڕێوەبەری گشتی ڕوو پێوی دامەزرا، دوایی بـــوو بە بەڕێوەبەری گشـــتی لە دیوانی وەزارەتی کشـــتوکاڵ و جارێکی

دیکه بوو به بەڕێوەبەری گشـــتی رووپێوی تاکو ساڵی ١٩٥٧ له پلەکەی دا مایەوه لەگەڵ دامەزراندنی ئەنجوومەنی ئاوەدانی دکتۆر سوســـه وەکو یارمەتیدەری هونەری به پلەی شارەزا بۆ جێگیری سەرۆکی ئەنجوومەنی ئاوەدانکردنەوه هەڵبژێردرا له ئەندامه پێشەنگەکانی کۆمەڵگەی زانستی عێراقی بوو تا کۆچی دوایی کرد به ئەندامێکی کارا مایەوه.

له نێوان ســـاڵانی ١٩٣٩-١٩٤٠ حکومەتی عێراقی وەک سەرپەرشتیاری جێبەجێکردنی لێکۆڵینەوه له پرۆژەکانی ئاودێری بۆ وڵاتی میرنشینی عەرەبی ســـعودی نارد، لـــه زۆربەی کۆنگرەکانی ئەندازەیـــی عەرەبی و بیانی وەکو ئەندام یان شـــاند نوێنەرایەتی عێراقی کردووه، یەکێک بوو له دامەزرێنەری کۆمەڵەی ئەندازیارانی عێراقی ســـاڵی ١٩٦٢ که وەکو بەڕێوەبەری گشـــتی کاری تێدا کردووه پاشـــان وەک راوێژکارێک له سەندیکانی ئەندازیاران تاکو ســـاڵی ١٩٧٤ کاری کردووه، ئینجا کاتێکیشـــی بۆ نووســـین و لێکۆڵینەوه تەرخـــان کـــرد و زیاتر له پەنجا نوســـراوی به هەردوو زمانـــی عەرەبی و ئینگلیـــزی هەبووه زۆر له وتارەکانی لـــه گرنگترین رۆژنامەکانی تایبەت به کاروباری ئاودێری بڵاوکراوەتەوه له ژیانیدا چەندین خەڵات و نیشـــانەی به دەســـتهێنا وەکو رێز لێنانێک بۆ ئەو لێکۆڵینه به نرخانەی لەسەر ئاودێری نوسیویەتی له ساڵی (١٩٣٩) حکوومەتی میرنیشینی سعودی نیشانەی میر (عەبدولعەزیز)ی پێبەخشی هەروەها حکوومەتی عێراقه نیشانەی رافیدەینی جۆری شارستانی پله دوو نیشانەیەکیش له مەغریب و خەڵاتێک له کوێت و خەڵاتێکیش له رێکخراوی عەرەبی بۆ پەروەردەکردن و رۆشنبیری و زانستی پێبەخشـــرا، دکتۆر سوسه ئافرەتێکی ئەمەریکی هێناو بەڵام له کاتی منداڵ بوون کۆچی دوایی کرد، پاش ئەوەی بو به موســـڵمان ئەوجاره ئافرەتێکی عێراقی موسڵمانی هێنا کچێک و کوڕێکی لێ هەبوو، کچەکەی ناوی دکتۆره (عالیه سوسه) و کورەکەشی (دکتۆر علی سوسه) هەواڵی چیرۆکی بوونی به موسڵمان له کتێبی (طریقی الی الاسلام) که له دوو بەش پێکهاتووه له ساڵی ١٩٣٦ بڵاوکراوەتەوه له ساڵی ١٩٨٢ کۆچی دوایی کردووه.

**١٤- موشير ئەلیاهو ئەلیاس:**

ئەگەر شەعشـــوع بـــۆ نیشـــتەجێبوونی خۆی کۆشـــکێکی تایبەتی دروســـتکرد و ناوبانگی پێ دەرکرد ئەوا (موشیـــر ئەلیاهو)ش بەو کارە مرۆڤانەی کە بۆ هۆزەکەی بە شێوەیەکی تایبەتی و بۆ تەواوی هاوڵاتیان بە شێوەیەکی گشتی ناوبانگی دەرکردبوو، دەولەمەندی جوولەکە (موشیر ئەلیاهـــو) نەخۆشـــخانەیەکی تایبەتی بە ناوی خـــۆی دامەزراند، ماوەی دروســـتکردنی نەخۆشخانەکە لە ساڵی ١٩٠٧ تا ١٩١٠ کۆتایی هات، ئەو پرۆژە خێرخوازییە لە ئاهەنگێکی گەورە و بە ئامادەبوونی قونســـلەکانی وڵاتان کرایەوە و فەرمانڕەوا (نازم باشـــا)ش بە دەســـتی خۆی دەرگای ســـەرەکی کردەوە، خاوەنی ئەو کارە خێرخوازییـــە لە پاش کردنەوەی نەخۆشـــخانەکەی بە ماوەیەکی کەم کۆچی دوایـــی کرد، بەڵام ناوەکەی بەردەوام لەســـەر زمانی نەوە دوای نەوەی عێراقـــی دووبارە دەکرایەوە ئەو زەوییەی کە نەخۆشـــخانەکەی لەسەر دروســـتکرا کەوتبوە ناوچەی (العیواجیە) لە پشـــت گۆڕســـتانی تورکی، بۆ ئەندازەیی دروستکردنی نەخۆشخانە کە تا هاوچەشن بێت لەگەڵ نەخۆشخانەی میری (المجیدیە) کە هەیوانێکی بە درێژایی ســـەدو بیست مەتری کە لە دە ژووریپێکهاتبوو بـــوو هەریەکێکیان ئاودەســـتی خۆی هەبوو بە شـــێوەیەکی ڕۆژهەڵاتی دروســـت کرابـــوو. بەڕێوەبەرایەتی نەخۆشـــخانەکەش دروســـتکراوێکی تایبەتی بۆ ژووری بەڕێوەبەر و ژووری دانیشـــتنی پزیشـــکەکان هەبووە لە عێراقدا یەکەم نەخۆشـــخانەی ئەهلی بووە کـــە تاقیگەیەکی تایبەتی هەبێ و دکتۆرێکی ئینگلیزی بە ناوی (Dr.Mels) سەرپەرشـــتی دەکرد، بە درێژایی ساڵ هەندێ بەشی تازە لە نەخۆشخانەکە زیاتر دروستدەکرا، لە ساڵی ١٩٤٢ دکتۆر (کەمال سامەرائی) باس لەوە دەکات کە حاخامی گەورەی جوولەکەکان (ساسون خەزوری) بانگهێشتی (موشیر)ی کردووە بۆ نووسینگەکەی خۆی و داوای لێکردووە هەڵسێ بە سەرپەرشتی کردنی بەشی ئافرەتان و لە دایکبوون ئەویش داواکەی جێبەجێ کردووە لێژنەی نەخۆشـــخانەکان کەســـەر بە هۆزەکانی ئیســـرائیلی بوون خەرجیەکانی

نەخۆشـــخانەکەیان گرتبووە ئەستۆی خۆیان، دوای کۆچکردنی جوولەکە حکومەتی عێراقی دەســـتی بەســـەر نە خۆشـــخانەی (موثیر ئەلیاهو) داگرت و ناوەکەشی بۆ نەخۆشخانەی (کەرخ) گۆڕی لە سەردەمی رژێمی کۆماریدا ناوەکەی بوو بە (نەخۆشـــخانەی میللـــەت) ماوەیەکی زۆر بۆ خزمەتکردنی هاوڵاتیان بەردەوام بوو تا دوای ئەوەی کە قۆناغی دووەمی پـــرۆژەی (مدینە الطب) تەواو بوو بڕیاری تێکچوونی نەخۆشـــخانەکەی (موثیـــر ئەلیاس) دراو هیچ یادوەریەکی نەما تەنها کەمێک نەبێت کە لە بیری بەغدادیە کۆنەکاندا ماوە.

**١٥- ساسون خەزوری حسقیل:**

دواهەمین (حاخام روحانی) بوو کە سەرۆکایەتی هۆزە جوولەکەکانی لـــە عێراق دەکرد، بۆ یەکەم جار لـــە ١٩٢٨\٤\٢٨ ئەو پلەیەی وەرگرت پاش ئـــەوەی (حاخام دنکـــور) بەوەکالەت کاری دەکرد و پشـــتگیری لە هەڵبژاردنی (حاخام ساســـون خەزوری) کرد کـــە بە پلەی گەورەی حاخامیـــن کاری دەکرد بۆ ئەوەی ســـەرکەوتوو بێ لـــەو پلەیە و ببێتە (حاخام باشی) واتە سەرۆکی ئیسرائیلی لە عێراق. بەڵام ئەوەی حاخام ساسون دەیویست نەبوو، هەر ئەوە بوو بە خێرایی لە نێو کۆمەڵگەیەکی جوولەکەدا جۆرێکی دیکە بەدەرکەوتن کە پیاوانی ئایینی ئەوانەی مەیلی (ســـەهیۆنیان) هەبووە پێشـــرەوییان دەکردن و بۆ لەناو بردنی حاخام ساســـون کاریان دەکرد و دەیانویســـت (حاخام ئەسلان) سەرۆکایەتی هۆزەکان لە عێراق بکات . لە ١٩٢٩\٤\١٨ . ئەنجوومەنی ئایینی هۆزەکان کـــە بەواژووی ٢٥ ئەندام لە حاخامییەکانـــی بەغدا دەرچووە بڕیاردرا بە لێسەندنەوەی دەسەڵات لە ساسون کە وەکو سەرۆکی حاخامینی بەغداو سەرۆک هۆز بۆ ماوەی سالێک کاری دەکرد. لە ١٩٢٩\٤\٣٠ ئەنجوومەنی ئایینی گشـــتی ئیســـرائیلی بڕیاری لێســـەندنەوەکەی دووپات کردەوە و دەڵێ پاشگەزبوونەوەشـــی تێدا نییە لەبەر ئەوەی دەســـەڵاتی ئایینی و یاســـایی رێگە بە (خەزوری) نادات لە پلەکەی بمێنێ چونکە بە گوێرەی چاودێـــری و رێزگرتـــن لە ئاییـــن بە پێی ماددەی ٣٠ی لە دەســـتووری

عێراقی پێویســـته لاببردرێ، هۆی لابردنی ساسون به پێی دانیشتنەکانی ئەنجوومەنـــی ئایینی بەم شـــێوەیە جێ بە جێ کـــراوە (لەبەر خراپی بارو لادانی لە ئایین و ســـەرەرای ناوزڕانی و هەڵســـوکەوتەی بەردەوام پێی هەڵدەســـتی کار لە شێواندنی یاسای) پیرۆز دەکات بۆیە نامەیەکی ئـــاگادار کردنـــەوەی بۆ دەچێ کە بە کۆی دەنگـــی پیاوانی ئایینی و لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا دەبێت دەست لە پلەکەی هەڵبگرێ. لە ١٩٣٠\٨\١٤ دەســـت لەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەشکرد و لە (١٧)ی هەمان مانگدا پەســـندکرا (ئیبراهیم ئەســـلان یەهوذا) ی دوژمنی شوێنەکەی گرتەوە. بەڵام ماوەیەکی زۆر لەسەر دەسەڵات نەبوو خێرا ساسون لە ١٩٣٠\١٢\١٩ بۆ ســـەرۆکایەتی کردنی هۆزەکە گەرایەوە، حکومەتیش پاڵپشـــتی ئەو هەڵبژاردنەی کردو سیاسەتەکەی پەسندکرا.

(ساسون) لە بەڕێوەبردنی کاروباری هۆزەکەی ماوەیەکی زۆر بەردەوام بوو لە کاتی دەسەڵاتی میری و دوای شۆڕشیش، هەردەم بە هەڵسوکەوتی و رەفتاری باش کارەکانی بەڕێوە دەبرد و کێشـــەکانی چارەسەر دەکرد، ببـــوە جێگای رەزامەندی هۆزەکە تا ئەو کاتەی لەســـەرەتای حەفتاکان کۆچی دوایی دەکات، شـــایانی باســـە ئەو منداڵانەی کە هەیبوو لەسەر ئایینی ئەو نەبوون لە دوای مردنی ساســـون (میر بەســـری ) لە جێگای ئەو هەڵبژێردراو کاروباری هۆزەکەی بەڕێوەبرد، پاش ئەوەی (بەســـری) عێراقی جێهێشت هۆزەکە پشتگیری خۆیان بۆ (ناجی شەهربلی) کرد کە بە (ناجی ئەبو نەفت) ناسراو بوو، ئەو نازناوەشی لە ئەنجامی فرۆشتنی نەوتی رەش بۆ خاوەن کارگەکانی خشت داهاتووە.

سەرچاوەی بەش

١- عەباس ئەلعەززاوی = تاريخ العراق بين احتلالين.
٢- د. کەمال سامەرائی = حديث الثمانين ج١-ج٢
٣- الدليل العراقی = ١٩٣٥-١٩٣٦-١٩٦٠
٤- د. فازل بە راك = المدارس اليهوديه و الايرانيه فی العراق.
٥- سادق حه سه ن سودانی= النشاط الصهيونی فی العراق.
٦- محەمەد مەهدی کبە = مذكراتی فی صميم الاحداث.
٧- د. ئەحمەد سوسە = حياتی فی نصف قرن.
٨- عەلی بارزکان = الحقائق الناصعه.
٩- عەبدولرزاق حوسنی = تاريخ الوزارات العراقيه.
١٠- الاب انستلس الكرملی= مجله لغه العرب.
١١- ئەنوەر شائول = ديوان شعر (همسات الزمن).
١٢- عەبدولکەريم عەلاف = بغداد القديمه.
١٣- خيری ئەلعەمری= حكايات سياسيه من تاريخ العراق الحديث.
١٤- مير بەسری = رجال و ضلال.
١٥- ئەمين مومەيز= بغداد كما عرفتها.
١٦- د. هاشم ئەلوەری= تاريخ الكُب فی العراق.
١٧- د. موعەمەر شابەندەر= تاريخ الطب فی العراق.
١٨- يەعقوب يوسف کوريە= باشا حياته و مقتله (مخطوط).

سـالآنێکی دوور و درێـژه جووله‌کەکانی عێراق شانبەشـانی تەواوی هاوڵاتیـان ژیاون کاروبارەکانیان زۆر بە ئازادانەو چالاکانە بەڕێوە بردووە و خێـرو بێرێکـی زۆری بۆیـان هەبـووە تا ئـەو کاتـەی چەتەکانی ڕەگەزپەرسـتی پلانی کۆچکردنـی جوولەکەی عێراقیان داڕشـتبوو بۆ ناردنیـان بۆ زەوی میعاد لە فەڵەسـتین، گەورە ڕەگەزپەرسـتەکان لە جیهـان بیانووی ئەوەیان دەهێنایەوە ئەگـەر جوولەکەکان لەهەرکوێ بن دەبێ بە تەواوی پابەندی ئەو بڕیارانەبن، جموجۆڵی ڕەگەزپەرسـتەکان لە عێراق راسـتەوخۆ دوای وەسـتانی جەنگی یەکەمی جیهانی دەسـتی پێکـرد، چەند جۆرە شـێوەو وێنەی هەموو لایەنێکـی بەخۆوە گرتبوو لەوانـە ڕاگەیاندن، ئەویـش لەرێگەی دەرچـوون و بڵاوکردنەوەی چەند ڕۆژنامەیەک کە بەپێی پیلانێکی پوخت باسی لەکۆچکردنی جوولەکەکانی دەکرد. بـەڵام بۆ لایەنی کۆمەڵایەتی چەند شـوێنێکی ئاهەنگ گێڕان و یانەیان دروستکرد کە ئامانجەکەی بڵاوکردنەوەی گیانی شەڕەنگێزی بوو، هەروەها زانسـتیش ڕۆڵێکـی بەرچاوی لە پێناوی کۆچکـردن لە عێراق گێڕاوە ئەویش لە رێگەی بەکارهێنانی مامۆستایان کە بەلێهاتوویی ژەهری ماری ڕەگەزپەرسـتییان لەنێو زانسـت و قوتابیاندا بڵاودەکردەوە، جگە لەوانە فەرمانگەکانی زایونیزمی لە لەندەن هاوسـۆزیەکی بێ سنوور و بێ هاوتایـان بۆ بزووتنەوەی ڕەگەزپەرسـتی هەبوو، ڕۆڵێکی هاندەریش بوو بۆ ئەو لایەنانەی کە بەدرێژایی سـاڵ بۆ کۆچکردنی بەکۆمەڵی جوولەکە لەعێـراق کاریان دەکرد و توانیان لە سـاڵی ١٩٥٠ کۆچ بە جوولەکەکان بکـەن، لەرووی زانسـتییەوە قوتابخانەی جوولەکـەکان لە عێراق داوای یارمەتی لە ژمارەیەک مامۆسـتای هۆزەکان کـرد و هەروەها داوایان لە فەرمانگەکانـی ڕەگەزپەرسـتی جیهانی کردووە بۆ ئەوەی مامۆسـتای جوولەکەی بیانی بەتایبەتی زانسـتی زمانی بیانی و مێژووی عیبرییان بۆ بنێـرێ. ئەو مامۆسـتایانەی گەیشـتنە عێراق سـەر بـە بزوتنەوەی ڕەگەزپەرستی جیهانی بوون، کە لە دروستبوونی پێکهاتەی ڕەگەزپەرستی هاوسـۆز بوون و ئەو چەمکانەی کە لە تـەورات و تەلمودەدا هاتووە لە

مێشکی ئەوانەی لەوێن بچەقێنن و دەست بەسەر زەوییەکانی فەڵەستینی عەرەبی دابگرن و قوتابخانەکانی جوولەکە لە عێراق بە چاودێرییەکی زۆر تایبەت و شـێوازێکی ورد و ناراستەوخۆ و رۆشنبیر کردنێکی سەربازی و سیخوڕی پیلانەکانیان جێبەجێدەکرد. قوتابخانەکانی جوولەکە ئامادەکرا تاکو بوو بە ترسـناکترین بنکە بۆ بەکارهێنانی تەقەمەنی و دانانی بۆمب و تەقینەوەکان کاربکەن. بەڵگەش بۆ ئەوە بەشـێک لەو مامۆسـتایانەی کە لە دەرەوە هاتبوون خاوەن رۆشنبیری و شارەزایەکی بەرزی سەربازی بوون بەڵام بە جلوبەرگی زانسـت داپۆشرابوون و لەو قوتابخانانە کاریان دەکـرد، لەسـاڵی ١٩٢١ (هارون ساسـون ناحیـم)ی جوولەکە کە لە فەڵەسـتین هاتبووە عێراق بۆ دامەزراندنی رێکخراوێکی رەگەزپەرسـتی هەروەهـا بەڕێوەبەری قوتابخانەی (فردەوس)یش بووە لە سـاڵی ١٩٢٤ بەبێ مۆڵەت پێدانی رەسـمی دامەزرا. لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٣٥دا بەهـۆی نەمانی چالاکیە رەگەزپەرسـتیەکەی لە عێـراق دوورخرایەوە، هەروەها مامۆسـتای عیبریش (کملای) لە قوتابخانەی (ئەلشـەماس)ی رەگەزپەرسـتی دوورخرایـەوە، کـە لەگـەڵ بەڕێوەبـەری قوتابخانەی رەگەزپەرسـتی لە بەغدا لە چالاکییە رەگەزپەرستییەکاندا هاوکاربوون و لەکاتـی پشـکنینی ماڵەکەی برێکـی زۆر لە بڵاوکراوە و پـەڕاوی تێدا دۆزرایەوە کە باسـییان لە بڵاوبوونەوەی بیرو بۆچوونی رەگەزپەرسـتی دەکرد هەر بەهۆیەوە دەسـتگیرکرا و پاشـان ئازادکرا. جارێکی دیکە لە ١٩٣٥/٦/٦ دووبـارە دەسـتگیرکرایەوە، لەبەر بەردەوامبوونی لەسـەر چالاکییەکانی بەشێوەیەکی ئاشـکرا. ئازادکردنیشی بۆ دەسەڵاتداریەتی بەریتانی لەبەغدا دەگەڕێتەوە ئەو سەردانەی کە (ئەلفرید موند) لەساڵی ١٩٢٨ بـۆ عێراقـی کرد نەخشەکێشـراو بـوو چونکە بەپاڵپشـتێکی رەگەزپەرسـتی لە جیهـان دەژمێـردرا بـۆ یارمەتیدانـی بزوتنەوەی رەگەزپەرسـتی لەعێـراق نێردرابوو.هـۆی بەرپابوونـی پەشـێوی و خۆپیشـاندان بۆ رۆڵی راگەیاندنی سەهیۆنی لە عێراق دەگەڕێتەوە کە بۆ خزمەتکردنی ئامانجەکانی سـەهیۆنی کاریدەکرد لـە پێش هەموویانەوە

هەولّــدان بوو بــۆ کۆچکردن لە عێراق. لە مانگی (٩) ی ســاڵی ١٩٢٣ کتێبێک بە ناونیشانی (راپەڕین جوولەکە و مێژووە نەمرەکەی) لە شاری بەغدا بڵاوکرایەوە کە بەراشــکاوی بانگهێشــتی بۆ رەگەزپەرستی تیابوو هەر لەو کاتەدا رۆژنامەی ( سەربەخۆیی) هێرشێکی رەخنەگرانەی توندی بۆ سەر کتێبی ناوبراو کرد و لە رەخنەکەیدا دەڵێت نووسەر لە ناونیشانی کتێبەکەیــدا ئامارەی بــە راپەڕین و مێژووی جوولەکــە دەکات بەڵام لە ناوەڕۆکدا بانگهێشتە بۆ لایەنگیریی و کارەکانی رەگەزپەرستی. لە ساڵی ١٩٢٤ لە بەغــدا رۆژنامەی (المصباح)ی هەفتانە دەرچوو، ئەو رۆژنامەیە لــە بەیانی هەموو رۆژانێکی پێنج شــەممە لەلایەن خاوەن و بەڕێوەبەری بەرپرســی رۆژنامەکە (سلێمان شــینە) بوو کە رەگەزپەرستێکی عێراقی بــوو کە تەنها هەواڵی هۆزی جوولەکەی عێراقی و دەمارگیریی نەتەوەیی بڵاودەکــردەوە و هەروەها بە پێویســتی دەزانین لێــرەدا دەقی راپۆرتی بەریتانی کە (خانەی ئیعتیماد) لە میانەی ئەو راپۆرتانەی کە ســاڵانە بۆ (عصبــه الامم) لە عێراق بەرزی دەکردەوە بڵاوبکەینەوە. لە راپۆرتەکەدا باس لە ســەردانەکەی (ئەلفرید موند) و پشتگیری کردنی بۆ بزوتنەوەی رەگەزپەرستی دەکات، کە لەســەرەتای شوباتدا سەردانی عێراقی کرد و پێشتریش سەردانی فەلەستینی کردبوو و بەدواداچوونێکی تەواوی لەسەر کارەکانی ســەهیۆنییەت وەرگرتبوو لەگەڵ ئەوەشــدا لەسەردانەکەی بۆ عێــراق لێکۆڵینەوەیەکی دەربــارەی بارودۆخی کشــتوکاڵی و زۆربوونی پەیینی کیمیایــی کرد. کاتێک هۆزی جوولەکەکان لە بەغداد ویســتیان ئاهەنگێک بۆ هاتنی (ئەلفرید) ســاز بکەن پرس و گومان و پڕوپاگەندە و بیــری خراپ لــە نێو خەڵکیدا بڵاوبــۆوە و دەوترا کــە (ئەلفرید) بۆ بڵاوبوونەوەی بیری رەگەزپەرســتی هاتووە. هەر بۆیە لەمانگی شــوباتی ســاڵی ١٩٢٨ خۆپیشــاندانێکی توند دژی رەگەزپەرستی بەرپابوو. ئەو چاپخانانــەی کە جوولەکەکان هەیان بوو بەشــێوەیەکی راســتەوخۆ و ناڕاســتەوخۆ بەشــداریان لە چاپکردنی کۆمەڵێک پــەڕاو و ئەدەبیات و بڵاوکــراوە و پاشــکۆی رۆژنامــەکان کرد کە لەســەر رەگەزپەرســتی

ووسرابوون، دیارترینیان (چاپخانەی دنکور) بوو کە بەیەکەم چاپەمەنی ئەهلـــی لە عێراق دەژمێـــردرا و دەستیشـــیان بەســـەر بازرگانی کاغەز داگرتبوو. رەگەزپەرســـت هەوڵی ناردنی هەندێـــک ڕۆژنامەی دەدا کە لە فەڵەســـتین بە زمانی ئینگلیزی دەردەچوو باســـی لە کاروچالاکییەکانی رەگەزپەرســـتی لـــە نێو عێراقـــدا دەکرد تـــا گەنجانی ڕۆشـــنبیر لەوێ بیخوێننـــەوە گرنگترینیـــان ڕۆژنامـــەی (جویـــش کرونیـــکل). لایەنـــە پەیوەندیدارەکان لە بەغدا کاریان لەســـەر قەدەغەکردنی هاتنە ناوەوەی ئەو جۆرە ڕۆژنامانە کرد و بەو شـــێوەیە باڵیۆزخانەی بەریتانیا ناڕەزایی خۆی نیشـــاندا، رەگەزپەرستی تێبینی ئەوەی کرد کە هەرچ جموجۆڵیەک دەکا لە پێناوی زیاتر کۆچکردنی جوولەکە لە ئاســـتی داواکراو نییە و بە ئامانج و مەبەســـتەکەی نەگەیشتووە. پێش هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەم لە چەند ســـەد کەسێک زیاتر نەبوو ئەوەش بەلایانەوە باش نەبوو بۆیـــە بە ئەنقەســـت توندوتیژییان دژی دامـــەزراو و تاکەکانی جوولەکە بەکارهێنا لە ئەنجامی ئەوەشـــدا بارودۆخێکی نوێ لە کۆمەڵگەی عێراقی دەرکەوت ئەویش باری ململانێی (رەگەزپەرســـتی- جوولەکەیی) بوو کە هاندانێکـــی ئیجابی بوو بۆ زیاتر کۆچکردنیان بۆ زەوی فەڵەســـتین، لە ١٩٢٨/١٠/٢٢ زنجیرەیەک کاری توندوتیژی سوک لە هەندێ دامەزراوەکانی جوولەکە دەســـتیپێکرد و چەند بۆمبێکی دروستکراوی ناوخۆییان فڕێدایە ناو شـــوێنی پەرســـتگاو یانە و کۆمەڵێک لەماڵـــە جوولەکەکانی ناوچە جیاوازەکانـــی بەغدا. بەڵام ئـــەو تەقینەوەیە زیانی گیانی بە دواوە نەبوو تەنها پێنج کـــەس لە جوولەکەکانی بەغدا برینـــدار بوون، ئەو چالاکییە رەگەزپەرســـتیانەی پێش هەڵگیرســـانی جەنگی جیهانی دووەم لە عێراق روویدا کەم بوو، بەڵام بیرۆکەی نیشـــتەجێبوونی یەک ملیۆن جوولەکە لە عێراق پەرەی سەند و دەبوایە زەوی تازە و بەرهەم نەهاتوو ئامادە بکەن و بیکڕن بۆ نیشـــتەجێبوونی ئـــەو جوولەکانەی کە بـــۆ عێراق هاتوون، لەســـاڵی ١٩٠١ بۆ مەبەستی کڕینی زەوی ســـندوقی نەتەوەیی جوولەکە (الكيره كميت) دامەزرا بۆ ئەوەی ببێتە موڵکی هەموو میللەتی جوولەکە

گـــەورەکان نەک تاکەکان. ئەو ســـندوقەش لە فەڵەســـتین بەوەکالەتی جوولەکە بەستراوە. ئەو زەوییانەی کە نایابن و هەردوو سیفەتی بە پیت و فەڕ و شوێنی زیندەگییان هەیە ئەوانەیان هەڵبژارد لە ١٥/ ١٢/ ١٩٣٧ (Lighter) لیکتـــر کـــە یەکێک بوو لە بەرپرســـانی جوولەکـــە لە بەغدا ئامادەبوو، بەنهێنی بەناوچەکە دەگەڕاو ئەو زەوییانەی کە پێویســـت بوو بیکڕن دەستنیشـــانی دەکرد و جوولەکەکانی ئامۆژگاری دەکرد کە لەگەڵ موسڵمانەکان بەهاوبەشی بیکڕن. بۆ ئەو مەبەستەش چەند کۆمپانیایەک دامەزرا لەوانە کۆمپانیای (بەغدای نوێ) کە (بولبولی دەلال سەرپەرشتی لەســـەر دامەزراندن و بەڕێوەبردنەکەی دەکرد و کۆمەڵێک پارچە زەوییان لەناوچەکانی (الصلیخ و الفحامە) هەڵبژارد. کاتێک رەگەزپەرســـت بۆی دەرکەوت کە بەقســـەی خۆش بە ئەنجامەکانی نـــاگات و ناتوانێت هانی جوولەکـــەکان بدات بۆ ئەوەی کۆچ بکەن تەنانەت ئەو کارە توندوتیژیەی پێشتریش کردی تێیدا سەرکەوتوو نەبوو بۆیە ئەمجارە رێگایەکی دیکەی بەکارهێنا ئەویش لەگەڵ کۆمەڵێک چەتەو رێگر پێکهات چ بەشـــێوەیەکی راســـتەوخۆ بێت یان ناراســـتەوخۆ بۆ ئەوەی کۆمەڵـــە جوولەکەیەک لە بەغدا و بەســـڕە بکـــوژێ، هەروەها هەوڵی دزیـــن و تاڵانکردنی چەندین خانـــوو دوکان و فرۆشـــگایاندا بـــە تایبەتـــی لە شـــوێنی کۆبوونەوەی جوولەکـــەکان و کەشـــێکی دژواریان بڵاوکردەوە بۆ ئـــەوەی کە بزانن لە مـــەودوا ژیان لـــە عێراقدا نەماوە و رێگە چارە بـــۆ دەرباز بوونیان تەنها دەبێ بەرەو فەڵەستین کۆچ بکەن، ئەو نەخشەو پلاندانانە رەگەزپەرستییە چەپەڵە بووە هۆی کوژرانی چەند کەسێکی جوولەکەو ماڵ و سامانەکەیان دزرا و تاڵانکرا لەوکاتـــەدا بەکردەوە جوولەکەکانی عێراق کۆچیان کرد و تەنهـــا ئەو گرفتـــەی لـــە بـــەردەم دەوڵەمەنـــدەکان بـــوو چۆنییەتی ســـاغکردنەوەی پارەکانیان و دەرکردنیان بۆ دەرەوەی وڵات بوو، پاشان هەندێکیـــان بەرەو ئەوروپا و ئەمریکا رۆیشـــتن و نەگەڕانەوە هەوڵەکانی رەگەزپەرســـت بـــۆ کۆچپێکردنی جوولەکەکان بـــەردەوام بوو بەم جۆرە ململانێیەکـــی تونـــد لـــە نێوان هێـــزی نەتـــەوە و نیشـــتمانی و نێوان

هاندەرەکانی رەگەزپەرستی پەیدابوو. لەژێر سایەی وەزارەتەکەی (یاسین ئەلهاشـــمی)دا چالاکیەکانی رەگەزپەرستی لە تەنگەبەرییەکی قوڵدا بوو، هاشــمی هەڵوێســتێکی یەکلاکەرەوە و شــکۆی بەرامبەر بە شۆڕشـــی فەڵەســتینی وەرگــرت و پارەو چــەک و تەقەمەنی پێــدان و هەروەها حکومەتەکــەی دژی هەوڵەکانـــی هەڵمەتـــی کۆچکردنـــی جیهانـــی و رەفتارەکانی رەگەزپەرســتی وەســتا. لەسەردەمی دەســەڵاتی (نوری ســەعید) چالاکیەکانی رەگەزپەرســتی لە جموجۆڵدا بوونە چاودێری و لێکۆڵینەوەیـــان لەگەڵ دەکرا. لەو کاتەی کە مەلیک غازیش کۆچی دوایی کرد هاندەرانی رەگەزپەرســتی هەناسەیەکیان هەڵکێشا و وایان زانی ئەو دیاریەیان لە ئاسمانەوە بۆ هاتووە ئەویش مردنی مەلیکی گەنجی عەرەب کە هەردەم ســۆز و خۆشەویســتی و پەیوەســت بوونی بۆ فەڵەســتین هەبــوو، بۆیـــە بەمردنی میر غـــازی بارودۆخەکـــە بـــۆ بەرژەوەندی و چالاکیەکانی رەگەزپەرســت گۆڕا. دوای ئەوە میر (عەبدولئیلاه) تەخت و دەسەڵاتی عێراقی پێسپێردرا. لەرووی بارودۆخی سیاسی نێو عێراق بووە هۆی پەیدابوونی چەندین کوتلەی سیاســـی وای لە رەگەزپەرست کرد کە چالاکیـــە گوماناوییەکەیان کەمێک ســـنووردار بێت. بـــەڵام هەڵمەتێکی راگەیاندنی بەهێزی رەگەزپەرســـتی لە نێـــوان جوولەکەکانی عێراق پەیدا بوو و ســـەرکردە ســـەربازییەکانی نیشـــتمانی و نەتەوەیی ترســـێکیان تووشـــبوو و داهاتووی هۆزی جوولەکە لە عێراق چارەنووسێکی نادیاری هەبوو زیانیشـــی پێگەیشـــت دوای ئـــەوە یەکەم ناکۆکی لـــە نێوان میر (عەبدولئیلاه) و ســـەرکردەی (المربـــع الذهبی) روویدا بووە هۆی ئەوەی کە (میر عەبدولئیـــلاه) بۆ دیوانییە رابکات و دواتر بۆ بەغدا گەڕایەوە و وەزارەتێکی نوێی بە (تەها هاشـــمی) ســـپارد و دڵەراوکێ لە مێشـــکی جوولەکـــەکان پەیدابـــوو بارودۆخـــی سیاســـی وڵات لـــە بەرژەوەنـــدی رەگەزپەرســـتیدا بـــوو وای لە جوولەکـــەکان کرد ناچاربـــن کۆچ بکەن. لەســـاڵی ١٩٤١ پێکـــدادان لە نێوان هێـــزی بەریتانی و هێـــزی عێراقی بەرپابوو کە بە تێکشـــکانی بزووتنەوەی (رەشید عالی گەیلانی) کۆتایی

هات و دووباره (میر عەبدولئیلاه) بۆ سـەر تەخت گەڕایەوە و (شەریف شـەرەف) لەسـەر کارەکـەی لابـردرا، دوا بیرۆکەی رەگەزپەرسـتی جوولەکەیـی لـە عێراق سـەبارەت بە کۆچکـردن بەو شـێوەیە بوو. رەگەزپەرسـت رووداوەکانی رۆژانی ١-٢ حوزەیرانی ١٩٤١ی قۆستەوە کە بـە (فەرهـود)ی واتا بە تالآنـی ناسـرابوو، هەلمەتێکـی فراوانی لە هەرەشـەکردن و تۆقیـن بەرپاکرد هەروەها رۆژێکی رەش لە کوشـتن و سـەربڕین و تالانی مولک و ماڵ لـە چاوەڕوانیاندایە. لەگەڵ گەڕانەوەی (میر عەبدولئیلاه) لەژێر نێزەی ئینگلیزدا پیاوانی بزوتنەوەی نیشـتمانی عێـراق لە بەندکردن و دوورخسـتنەوە و لە سـێدارەداندا پەرتەوازەیان پێکرا. بەو شـێوەیە بارودۆخ و کەشـوهەوا سەبارەت بە جوولەکەکان لە عێراقـدا زۆر هێمن و جێگـر و ئارام بوو لەبەرئەوەی دەسـەلاتی میری عێـراق پەیوەندییەکی پتەوییان لەگەڵ گەورەترین پارێزەری بەرژەوەندی جوولەکـەکان لـە جیهاندا کـە ئینگلیز بـوو بەسـترابۆوە. بەمجۆرە رەگەزپەرسـت لە ئامانجەکانی شکستی هێنا و کاروباری جوولەکەکانیش بۆ ماوەی حەوت سـاڵ واتـە لە ١٩٤١ تاکـو ١٩٤٨ جێگیری بە خۆوە بینـی. ئینجا جەنگی عەرەبی ئیسـرائیلی دەسـتپێکرد و دوای جەنگ دەسـتکرا بـە داگیرکردنـی زەوییەکانـی خاکـی عەرەبـی لەلایـەن رەگەزپەرسـتەوە بەو شـێوەیە دەوڵەتێکی ئیسـرائیلییان دامەزراند و هەڵسـان بە کۆکردنەوەی زۆرترین دانیشتوان لە قەوارەی دیاریکراودا بۆ ئەوەی ببێتە قەڵغانێکی پارێزراو بۆ ئاسایشـی ئیسـرائیل لەلایەک و بۆ دڵنیابوونـی هێزی کار و پاڵپشـتیکردنی ئابووری ئیسـرائیلی لەلایەکی دیکـەوە. بڕیاردرا بە کۆچپێکردنی جوولەکەکان بەپێی پێویسـت لەهەر کوێیـەک هەبن. بـەو هۆیەوە چاویان خسـتە سـەر جوولەکەی عێراق کۆچێکـی گەورەیان پێکردن، رەگەزپەرسـت جەخت لـەوە دەکات کە بەهێزتریـن ئەو کارەی کەوا لـە جوولەکەی عێراق دەکات کە هەردەم لە ترسێکی بەردەوام و پاشـان کۆچکردن دابن ئەو توندوتیژییە نەک وەکو ئەوەی کە دە سـاڵ لەمەوبەر روویدا کە تەنها بیروباوەڕی رەگەزپەرستی

بڵاوبکەنەوە. بۆیە لقەکانی ڕێکخراوە نهێنییە ڕەگەزپەرستەکان بەخێرایی کاریان لەسەر هەرشتێک دەکرد کە خزمەت بەئاسایشی ئیسرائیلییەکان بگات و تەواوی زانیارییەکانی سەربازی و ئابووری و ڕۆشنبیری و سیاسییان لە عێراقدا پێشکەشکرد. بەتایبەتی ئەو ماوەیەی کە ئەو کۆمەڵانە چالاکییەکانیان بێ چاوپۆشی لە پێناوی بە جێهێنانی ئامانجەکانییان بەکاردەهێنا. هەروەها سەرەتای ساڵی ١٩٥٠ یەکەم ڕووداوی تۆقێنەر ڕوویدا. لە ڕۆژی شەممە کاتژمێر (٩،٣٠)ی شەوی ١٩٥٠/٤/٨ لەشەوێکی بەهاردا ئەو کاتەی جوولەکەکانی بەغدا لەپاش بەسەربردنی پشووی کۆتایی هەفتە لەگەڵ خێزانەکانیان لەشەقامی (ئەبو نەواس) ڕایانبوارد لەو کاتەی بەرەو ماڵ دەگەڕانەوە بۆمبێکی دەستی تەقییەوە و شەقامەکەی هەژاند. شوێنی ڕووداوەکەش ئەو شوێنەیە کە شەقامی (ئەلسەعدون) بە شەقامی (ئەبو نەواس) دەبەستێتەوە و گازینۆی (البیضاء)ی لێیە. چەند کەسێک لەو ڕووداوە بریندار بوون ئەویش. بەهۆی پەرش و بڵاوەی پارچەی بۆمبە تەقیوەکە. دەسەڵاتی یاسایی هەڵسا بە بەجێهێنانی لێکۆڵینەوەی بەرایی بەڵام نەیانتوانی هیچ بەڵگەیەک بدۆزنەوە بۆ ئەوەی تاوانەکە ئاشکرابێت بەڵام خرایە ژێر چاودێری بەرپرسەکان و دەسەڵاتیش ڕایگەیاند کە لێکۆڵینەوە بەردەوامە. ڕەگەزپەرست هەڵمەتێکی ڕاگەیاندنیان دەستپێکرد وایان لە جوولەکەکان گەیاند کە داهاتوویان سەخت و تاریکە و تەنها خودا نەبێ کەس نازانێ چ شتێک چاوەڕێیان دەکات ئەگەر بێتو لە عێراقدا بمێننەوە. ئەوەی لە ڕۆژی شەممەدا ڕوویدا تەنها ئاگادارکردنەوەیەکە، چالاکییەکانی ڕەگەزپەرست بەردەوام بوو بەڵام هەرچیەکیان دەکرد بۆ کۆچپێکردنی جوولەکەکان بێ ئەنجام بوو، دوای هەشت مانگ بەسەر تەقینەوەی یەکەم جارێکی دیکە لە ١٩٥١/١/١٤ لە نزیک (کەنیسی مسعود شمطوب) ڕوویدا. ئەویش هەر بەهۆی بۆمبێکی دەستی بوو. لە ١٩٥١/٣/١٩ تەقینەوەی سێیەم لە تەلاری نووسینگەی پرسگەی ئەمریکی کە دەکەوتە شەقامی ڕەشید (باب ئاغا) بوو، هەروەها

تەقینەوەی چوارەم لە تەلاری (لاوی) بۆ ئۆتۆمبێل بوو، دوا تەقینەوەش لە نزیک تەلاری (ستانلی شعشوع) لە شەقامی (رەشید) روویدا کە بووە هۆی تێکچوونی باری ئاسایشـــی عێراق و شەڕ و ئاژاوەی لێکەوتەوە. بەو هۆیـــە حکومـــەت لــە ١٩٥١/١/١٦ بەیاننامەیەکی دەرکـــرد کە ناچارە بەدەســـتێکی ئاسنینەوە لەو کەســـانەی کە خۆیان فریوداوە و گاڵتە بە ئارامـــی ئەو وڵاتە دەکەن لێیان بـــدات و هەموو توانای خۆی دەخاتەگەڕ بـــۆ ئـــەوەی تاوانباران ئاشـــکرا بکات.. لـــە بەغدا تۆڕێکی ســـیخوری بەدەرکـــەوت لە دوای لێکۆڵینەوە و پشـــکنین دوو کـــەس کە ڕێکخەری سەرەکی تۆڕەکەبوون دەســـتگیرکران و دانیان بەو تاوانە ناوە کە ئەوان بـــەکاری تەقینەوەکـــە هەڵســـاون و ئامانجەکانیشـــیان بڵاوبوونـــەوەی توندوتیـــژی و پشـــێوی نانەوە بـــووە. پاش لێکۆڵینـــەوە دەرکەوت کە لەگەڕەکی (البتاوین) لە ماڵی (یوســـف و سەلیم) کە هەردووکیان کوڕی (عەبدوڵلا مـــوڕاد خەبازە) بوون، چەندەها جۆر لـــە چەک و تەقەمەنی شاردرابوونەوە جگە لە چەندین بەڵگەنامە کە مێژووەکەیان بۆ ١٩٥٠/٤/٤ دەگەڕایەوە دۆزرایەوە، هەروەها نەخشـــەیەک کە ئامانجەکانی ســـەربازی لەســـەربوو لەگەڵ دۆســـیەیەکیش کـــە نـــاوی ئەندامەکانـــی تێدابوو، رەگەزپەرســـت توانی کە بەناوبانگترین پارێزەری عێراق بکاتە نوێنەر بۆ بەرگریکـــردن لە تاوانباران ئەوەبوو ترســـناکترین تاوانبـــاری گیراو ئازاد بکەن بەناوی (نەســـیم موشی نەسیم) ئەو پارێزەرەش کورد بوو بەناوی (جەلال بابان) کە پێشتر پلەیەکی وەزاری هەبوو، بۆ ئازادکردنیشی بڕی (٦٠٠) دینـــاری بـــۆ کەفالەتـــدا دوای ئازادکردنی بـــەرەو (تەل ئەبیب) رایکـــرد. رۆژنامەکانی نیشـــتمانی دەنگیان هەڵبڕی و هێرشـــیان بۆ ئەو پارێزەرانە برد کـــە بەرگرییان لە تاوانباران کردووە، رۆژنامەی (الیقضە) نارەزایی خۆی لەســـەر ئازادکردنی (نەسیم موشی نەسیم) بڵاوکردەوە و تێیـــدا هاتووە. کە لەو کاتەی دڵەکان رق و کینەیان لەبەر ئەو دەســـتە زۆرداریـــەدا تەقییەوە کە تەنها خراپەیان بـــۆ وڵاتەکەیان دەوێت. لەبەر چاوچنۆکـــی پارێزەرە پلە بەرزەکان کە تاوانباران بەبڕی ١٥٠٠ دینار ئازاد

دەکـــەن خـــودا عێراقمان بپارێزێت ململانێ لە نێوان دوو لایەن دەســـتی پێکـــرد لایەنـــی یەکەم دەســـتەی باڵا بۆ سەرپەرشـــتی کردن لەســـەر لێکۆڵینـــەوە و بەدواداچوونی دەســـتگیرکردنی تاوانبـــاران و دۆزینەوەی شـــوێنی چـــەک و تفـــاق بـــوو. لایەنـــی دووەم رەگەزپەرســـت و تۆرە ســـیخورییەکەی بـــوو کە هەمـــوو هەوڵێکیدا بۆ ئەوەی ســـزا لەســـەر بەکرێگیراوانی هەڵبگرێ و تا بتوانێ لەبەندیخانەو پەتی سێدارە رزگاریان بـــکات پارێـــزەرە عێراقیەکانیش فەرمانی بەســـەربازبوونیان بۆ دەرچوو لەبەر ئەوەی پاڵپشـــتی تاوانبارانیان دەکرد. لێرەدا خشـــتەیەک بەناوی دیارتریـــن ئەو پارێزەرانە دەخەینەروو کە بـــوون بە نوێنەری تاوانبارن و لەبـــەردەم دادگا چاوەڕێـــی فەرمانی دادگا دەبن بـــە تۆمەتی تێوەگلانی دەســـتی پیسیان لەو کارە ســـامناک و چەپەڵانەی دەرحەق بە میللەت و نیشتمان کردویانە..

ناوی پارێزەرەکان:

١- پارێزەر (ذیبان ئەلقەبان)

٢- پارێزەر (یەحیا قاسم)

٣- پارێزەر (محەمەد ئەلجریفجی)

٤- پارێزەر ( عەبدولئەمیر ئەبو توراب)

٥- پارێزەر (محەمەد زەکی عەبدولکەریم)

٦- پارێزەر (فرەنسیس شەماس)

٧- پارێزەر (جەلال بابان)

٨- پارێزەر (فائق تۆفیق)

٩_ پارێزەر(صباح جەمیل روحی)

دادوەری گشـــتی لە خوێندنەوەی بڕیارەکەیدا فەرمانیدا کە ئەو پەڕی ســـزا بدرێتە تاوانباران. بۆ ئەو مەبەســـتەش مولازمـــی یەکەمی پۆلیس (عەبدولرەحمان ئەلســـامەرائی لەولەب) لەگەڵ چەند کەســـێکی دیکە کە لەژێر فەرمانی ئەودا کاریان دەکرد و توانیان هێلانەی سیخورییەکە لە بەغدا بدۆزنەوە و دەستیان بەسەر تەواوی بەڵگەنامەکان گرت و لەبەردەم دادگا

دەریخســـت بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەیەکی راستەقینە دژی تاوانباران لە زۆر لایەنەوە هەوڵیان دەدا کە بڕیارەکەی دادوەر هەڵبوەشێننەوە و فەرمان بدات بە ئازادکردنی تاوانباران بە کەفالەتی پارە. لەکاتی هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٤ی تەمموز (رائید عەبدولجەبار فەهمی) وەکو بەڕێوەبەری پۆلیسی بەغدا کاریدەکرد، فەرمانێکی بۆ دادگای باڵای سەربازی تایبەت پێشکەشدەکرد و بڕیـــاری ئازاد نەکـــردن و لە ســـێدارەدانی بەندکراوەکانیدا بڕیارەکەش جێبەجێکرا و بەرامبەر بە دامەزراوە رەگەزپەرستەکان توندترین رەفتاری بەکاردەهێنا، هەروەها لەســـاڵی ١٩٥١ هەڵســـا بە نووسینەوەی کتێبێک بەناوی (ژەهری ماری رەگەزپەرســـتی) تێیدا رەفتارەکانی رەگەزپەرستی لە چۆنییەتی کارکردنیان بە کۆچپێکردن بۆ ئیســـرائیل ئاشکرا کرد، ئەو کتێبە بە خێرایەکی زۆر سەیر بە چەند رۆژێکی کەم لە کتێبخانەکانی بەغدا نەما (عەبدولجەبار فەهمی) هەڵوێســـتی رەگەزپەرســـتی لەبەردەم دادگا روونکردەوە هەروەها باســـی لەو کاروچالاکییانـــەی کەخۆی و هاوکارانی کردویانە کرد، شـــایانی باســـە کە (عەبدولجەبار فەهمی) لە ناوەڕاستی ســـاڵی ١٩٤٦ تاکو هاتنی ساڵی ١٩٥٠ وەک بەڕێوەبەری پۆلیسی موسڵ کاریکردووە لەپاشـــان گواســـتراوەتەوە بۆ بەغدا بۆ ماوەی پێنج ساڵیش وەک بەڕێوەبەری پۆلیسی بەغدا کاریکردووە و پاشان بە پارێزگاری بەغدا دامەزراوە و نزیکەی ســـێ ســـاڵ لەو کارە بەردەوام بووە. بەر لە کۆچی دوایـــی کردنی لەبەردەم دادگای باڵای ســـەربازی تایبەتدا ئامادە بووە و قســـەکانی خۆی راگەیاندووە و گوتویەتی: ئەوەی خەمبارم دەکات کە من خۆم ئەو کێشەیەم ئاشکرا کردو ئێستاش دادگا بەڕێزەکان دەستی تاوان بۆ من درێژ دەکات گوایە پارەم دزیوە، بەڕێز سەرۆکی دادگا من بایەخێکی زۆرم بەو کێشـــەیە داوە و ئاشکرام کردووە و زۆریش لە تاوانباران لەسەر تاوانەکەیان بە پێی لێکۆڵینەوە بە تۆمەتی تاوانی سیخوڕی دەستگیرکران لەوانـــە دکتۆر (ئەلبیر ئەلیاس) لە نێـــو تاوانبارەکان بووە و دادگاش بە کەفالەت بڕیاری ئازادکردنیداوە بەڵام من بە بڕیارەکەدا چوومەوە و پاشان دادگای باڵا ئازادی کردووە، من هەردەم لە دژی ئەوە بوومە کە تاوانباران

ئازاد بکرێن. ئەو کێشە سیخوڕییە بەهۆی هەواڵگەری یەکێک لە پەناهەندە فەڵەستینییەکان کە ناوەکەی لە بیرم نەماوە ئاشکرا کراوە و دادوەری لێکۆڵینەوە (عەبدولڕەحمان حەمود) لێکۆڵینەوەی لەو بارەیەوە کردووە و لەدوای ڕوودانی هەر شەش تەقینەوەکە لە بەغداو هەواڵەکە وا بڵاوکراوە کە کەسێکی نامۆ لەپشت ئەو کارەیە و هاوکارەکانیشی لە بەغدان واتە بێگانە بوون. پۆلیسیش بە هۆی پەناهەندەیەکەوە چاودێری ئەو شوێنەی کردووە و هەر لەوێ دەستگیری کردوون. لەکاتی پشکنیندا قورئانێکی بچووکی لە نێو گیرفانی بووە و بە زمانی ئینگلیزیش قسەی دەکرد یەکەم شت کە حاشای لێکرد گوایە ئەو جوولەکە نییە و پاسپۆرتەکەشی هی کەسێکی ئێرانیەو لە حکومەتی ئێرانی دەستی کەوتووە بەناوی (ئیسماعیل). دوای لێکۆڵینەوە یەکسەر دانی بەوە ناوە کە جوولەکەیەکی ڕەگەزپەرستیە، دادوەری لێکۆڵینەوە و جێگرەکەی ڕۆیشتن و ماڵەکەیان پشکنی و بەڵگەنامەیەکیان بەناوی (ڕودنی) دۆزییەوە ڕەگەزنامەکەشی ئینگلیزی بوو ئەویش هەر لە دەرەوە هاتبوو. ڕەگەزپەرستێکی بەریتانی بوو لەکاتی پشکنینی ماڵەکەی لەنێو بەڵگەنامەکاندا بروسکە نامەیەکیان دۆزییەوە کە تێیدا نوسرابوو (بەزووترین کات و بە خێرایی کۆمپانیای بازرگانییەکە جێبهێڵن) پاشان دانی پێدانا و کێشەکەمان ئاشکرا کرد. هەر لەوێوە توانیمان ئەو کۆگایەی مین و تەقەمەنیان تێدایە بیدۆزینەوە ئەفسەرێکی تایبەت بە هەڵوەشاندنەوەی مین و بڕینی کارەبایەکەمان هێنا و کارەبایەکەیان بڕی چونکە وایەری کارەباکە بەسەری لوغمەکانەوە گەینرابوو پاشان دەمانچەکان و ڕەشاشەکانمان دەرهێنا و هەروەها لە کۆگاکە شوێنی پەرستن هەبوو کە تەقەمەنیان تێدا شاردبۆوە، هەر لەکاتی پشکنیندا پلانێکمان بۆ بۆردومانی شاری بەغدا دۆزییەوە، هەرچەندە زۆرمان هەوڵدا کە (ئەلبیر ئەلیاس) ئازاد نەکرێت بەڵام دادوەری لێکۆڵینەوە بە کەفالەت ئازادی کرد.

دادگای کردنەکە بەردەوام بوو:

– ئەی رودنی چی بەسەر هات؟

* گەورەم بە پێنج ساڵ حوکم درا

– ئەی ئێستا لە کوێیە؟

* کاتەکەی تەواو بوو سەفەری کرد

– ئـــەی کێ بوو بەرتیلی وەردەگرت، ئایا ئەو بەرتیلە نەبووە هۆی کۆچکردنی جوولەکە؟

* پارێزەرەکان کاریان لەســـەر کێشـــەکان دەکرد لێیان بپرسە من دژی رەگەزپەرســـت بووم ئەوانیش دژی من بـــوون هەموو چرکەیەکیش دەیانویست لە ســـێدارە بدرێم.. هەر لەسەر ئەو کێشەیە دادوەر (کامل فەتاح شاهین) بە هاوکاری برایەکی رائیدی پۆلیس (عەبدولرەزاق) هەموو هەوڵێکیان خستەگەڕ بۆ ئەوەی دەستگیریان بکەن بەڵام بەکرێگیراوان و سیخوڕەکان کە نوێنەری رەگەزپەرستیبوون توانیان بەسەر چالاکییەکانی دڵســـۆزانی ماف و دادوەران زاڵ بن. دادگاییکردنەکە سێ مانگی خایاند دادوەر فەرمانی حوکمی یەکەمی خۆی لەو کێشەیە لەسەر هەریەک لەوانە دەرکرد ئەویش بە لە ســـێدارەدانی (شـــالوم ســـاڵح شالوم) و (یوسف ئیبراهیم بەسری). لەسەر هەمان کێشە تاوانبار (یەهودا تاجر ساڵحون) بە بەندکردنی هەتا هەتایە لەگەڵ ئیشوکاری سەخت حوکمدرا و هەروەها تاوانبار (روبرت) بە (١٥) ساڵ لەگەڵ کاری دژوار بەندکراو فەرمانەکەی بـــۆ دەرچوو لـــەرۆژی ١٩٥١/١٢/١٤ فەرمانی جۆراوجۆریش بۆ ســـێزدە جوولەکە دەرچوو، لە ١٩٥٢/١/٢١ فەرمانی لە سێدارەدان لەسەر تاوانباران (شالوم ساڵح و یوسف ئیبراهیم) درا. چیرۆکی ئەوانەی ناپاکیان لە وڵات کرد کۆتایی پێهات، بەڵام رەگەزپەرســـت هەر بـــەوە وازی نەهێنا چەند جارێک بۆ کاری سیخوڕی خەڵکی دەنارده نێو عێراق.. ئەوەبوو لەساڵی ١٩٥٧ دەســـەڵاتی تایبەت ســـیخوڕێکی ترســـناکی لە رەگەزپەرستەکان دەستگیرکرد کە ناوی (عەزیز فوئاد) بوو بە پاسپۆرتێکی ئێرانی هاتبووە نێو عێراق ئەوەی سەیر بوو لەکاتی دەستگیرکردنی تۆمەتی دزیکردنیشی

هاتبووه سەر ڕۆژنامەکانی عێراقی لەسەر ئەو باسە گوتویانە کە: (عەزیز فوئاد) سیخوڕێکی ڕەگەزپەرستیە لەلایەن پۆلیسی عێراقییەوە بە تاوانی دزی لە ماڵێکی ناوچەی (ئەعزەمیە) دەستگیرکراوە و بەیارمەتی کوڕی خاوەن ماڵەکە دزییەکە ئەنجام دراوە و دادگاش بۆ ماوەی سێ ساڵ فەرمانی بەندکردن لەگەڵ کاری سەختی بۆ دەرکردووە هەرکاتێک ماوەی حوکمەکەی تەواو بوو لە عێراق دەربکرێ. لەوکاتەی کە لەنێو چوار دیواری بەندیخانە دابوو ڕۆژێکیان ویژدانی جوڵاو دانی بە تاوانەکانی دانا کە ڕێکخراوی ڕەگەزپەرستی لە ئێران بۆ کاری سیخوڕی بۆ نێو عێراق ناردوویەتی. (عەزیز فوئاد) لەدان پێناکەی یەکەمی گوتی: ئیمڕۆ زۆر شوکرانەی خودا دەکەم ئەگەر لە سێدارەش بدرێم لام گرنگ نییە، لەبەر ئەوەی بەشداریم کردووە لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیلی تا بەهێزبوو بووە خاوەنی سوپاو چەک و تەقەمەنی و کەشتی و پارێزگاری لە خۆی بکات، من خزمەتی ئیسرائیلیم کردووە لەبەر ئەوەی من جوولەکەو ئیسرائیلیم و دڵسۆزم بۆ نیشتمانەکەم ئەو دان پێنانە لە ژیانی (عەزیز) وەکو خاڵێکی گواستنەوە بوو. لە دزەوە بۆ سیخوڕێکی ترسناک، هەر بۆیە دان پێنانەکەی لەلایەن بەرپرسان بایەخێکی زۆری پێدراو بە خێرایی لێژنەیەکی سێ ئەندامییان پێکهێنا کە لە ئەفسەرێک بە پلەی (موقەدەم روکن) لە هەواڵگەری سەربازی و ئەفسەرێک لە پۆلیسی لێکۆڵینەوەی تاوانەکان و ئەفسەرێکیش لە ئاسایشی گشتی- هۆبەی دەرەکی: لەکاتی لێدوان لەگەڵ سیخوڕەکە وشە بەوشە دانی بە هەموو ئەو شتانەی کە لە ژیانی منداڵی و تا ئەو کاتەی لە بەغدا دەستگیرکراوە ناوە.

لە ساڵی ١٩٢٤ لە لوبنان لەدایکبووە و لە میسر پێگەیشتووە و لە فەڵەستین جەنگاوە یەکێکە لە چاودێرانی ئێرانی، تاوانی دزی کردووە و لە عێراقیش سیخوڕی بەردەوام بووە و چەند نازناوێکی هەبووە لەوانە (عەزیز و موحسین و موریس و موسیر) هەروەها زمانەکانی (عەرەبی و ئینگلیزی و فەڕەنسی و ئێرانی) زانیوە.

لەکاتی دەستگیرکردنی تەمەنی نەگەیشتبووە (٢٩) ساڵ و

بەشـــداری لەو شەڕانە کردووە کە چەتەکانی رەگەزپەرستی دژی عەرەبە فەڵەســتینیەکان کردویانە. خاوەنی دوو ژنـــە یەکێکیان کچی مامیەتی نــاوی (کارمن)ە و لە لوبنان نیشعــتەجێیە و ئەوی دیکە موســڵمانە و لە ئێران دادەنیشــێ، لەکاتی دان پێنانەکەیدا دەڵێ بە مەبەســتی ئەوە هاتۆتە نێو عێراق کە زانیاری ســەربازی و ئابووری دەســتکەوێ تا بۆ لایەنی رەگەزپەرســتەکان بنێرێ، دوای لێکۆڵینەوە لیژنە بڕیاریدا لەسەر تاوانی سیخوڕی دادگایی بکرێ و بەسزای خۆی بگات، سزایەکی توند کە دەرحەق بەو تاوانانەی بەرامبەر بە عێراق کردویەتی.

سەرچاوەی ئەو بەشە:

1- د. فازڵ ئەلبەراک، قوتابخانەکانی جولەکەو ئێرانی لە عێراق.
2- مەهدی ئەلعەگیلی، راستیەکان لە تۆڕی سیخوڕی رەگەزپەرستی لە عێراق.
3- دادگای سەربازی باڵای تایبەت، بەشی حەوتەم
4- رۆژنامەی (الیقظة) رۆژنامەی هەواڵەکانی بەغدادییە.
5- گۆڤاری هەفتانە لە رۆژنامەی میللەت ژمارە (٢٠) لە ١٩٥٧/٩/١٤.
6- چاوپێکەوتن لەگەڵ خزر ئەلعەبیدی (شوباتی ١٩٩٢).

لــە ١٩٤٨/٧/١٨ عــەزرا مناحین دانیــال. ئەندامــی ئەنجوومەنی پیاوماقوڵانی عێراقی لە کاتی بەســتنی کۆنگرەی ئەنجوومەندا قسەیکرد

و گوتی:

داوا لـــه ئەنجوومەنی باڵا دەکەم کە ڕێگەم پێبدەن وتەیەک لەســـەر ڕەگەزپەرســـتی لە عێراق رابگەیەنم. پێش چەند ڕۆژێک هەمووومان لەسەر ئەو گەڵاڵە نامەیەی یاسای کۆتایی یاسای سزاکانی بەغدای ژمارە (٥١) ی ســـاڵی ١٩٣٨ ڕێککەوتین من بە ئەرکێکی خـــۆم دەبینم کە مێژووی چاندنی بیری ڕەگەزپەرســـتی لە عێـــراق بخەمە ڕوو و ئەو ئەرکانەی کە تا ڕووناککردنەوەی ئەنجوومەنی باڵا متمانەمان لە ســـەردا بۆ ئەوەی لە داهاتوو لەکاتی ئاراستەکردنی سیاسەتەکەمان لە عێراق پەندی لێوەربگرن. لە ناوەڕاســـتی ســـاڵی ١٩٢٥ز واتە کەســـێک پاش پێکهێنانی حکومەت لەلایەن کۆمەڵەی ڕەگەزپەرســـتی لە فەڵەســـتین نوێنەرێکیان بۆ عێراق هات. بە ئامانجی دامەزراندنی کۆمپانیایەکی ڕەگەزپەرســـتی و یانەیەک و قوتابخانەیـــەک لەو ناوچەیە بۆ برەو پێدانی بیروڕای ڕەگەزپەرســـتی لای نەوە پێگەیشـــتووەکان و بڵاوبوونەوەی پڕوپاگەندەی کۆچکردن بۆ فەڵەستین، ئەو کارە هۆزی ئیسرائیلی خستە تراویلکە و لەسەر رایەکان کۆبوونـــەوە و لێکۆڵینەوەیان لەو بارەیەوە کـــرد بۆ جێبەجێکردنی ئەو بیرۆکەیەو بـــۆ پێداچوونەوەی کاروبارەکە بڕیاری دانانی شـــاندێک درا، شـــاندەکە بۆ فەرمانگەی (الســـامی) بەڕیتانی چوو. بۆ ڕێگە پێنەدانی ئـــەو پێکهاتانە بە ڕوانینی ئەو لایەنانەی کە چاوەڕێی ســـۆز دەکەن لەو دەوڵەتە کە ســـســـت نەبووە و دانیشتوانەکەی کە لە عەرەب و جوولەکە بوون سەردەمانێک بە خۆشەویســـتی و دڵنەوایی لەگەڵ یەکدی دەژیان کـــە خۆی لە دوو هەزار ســـاڵ دەدا. لەســـەر ئەوەش ئـــەو هەوڵە هیچ بەرهەمێکی بە ئەنجام نەگەیاند، سەرســـام بووین بینیمان کە حکومەتی عێـــراق خۆی ئەو پڕۆژەیەی دانا، پڕۆژەی ڕواندنی تۆی ڕەگەزپەرســـتی لە عێـــراق و ڕێپێدان بە دامەزراندنی بریکارنامەیەکی ڕەگەزپەرســـتی و یانەیـــەک و قوتابخانەیەک، بە پێی مۆڵەتی زانیارییەکان ئەو دامەزراوانە دەستیان بە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە کرد. بۆ برەو پێدان و خۆزگەکانی ڕەگەزپەرســـتی لە عێراق و هاندانیان بۆ کۆچکردن بۆ فەڵەستین لە ژێر

چاودێری و پاراســـتنی حکومەتدا. ئەو باوەڕ پێکراوەی کە بریکارنامەی ڕەگەزپەرستی دایمەزراندبوو لە فەلەستینەوە بۆ عێراق بە فەرمی ڕێگەی پێدرابوو. هەروەها فەرمانگەی نیشـــتنگەو ڕەگەزنامە هیچ پاسپۆرتێکی بۆ فەلەســـتین نەدەدا تا ئەو کەســـە باوەڕپێکراوە واژووی خۆی لەسەر نەکردبایە. حکومەتی عێراق بیرکردنەوەیەکی پێچەوانەی لە بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە دژی ڕەگەزپەرســـتی لـــە قوتابخانە ڕەســـمییەکان و یەکە ســـەربازییەکان و چاپکراوەکان وەرگرت. لەساڵی (١٩٢٨) بەهۆی هاتنە نێو عێراق خۆپیشـــاندانێک دژی (ئەلفرید موند) سازکرا. گوایە یەکێکە لە لایەنەکانی ڕەگەزپەرســـتی، بیری لە هەڵوەشـــاندنەوەی مۆڵەتی ئەو قوتابخانەیـــەی کە خۆی ڕێگەی دابوو نەکـــردەوە. نەک ئەو قوتابخانەیە بەڵکو دامەزراوەکانی دیکەشی بەرهەم هێنا و حکومەتیش ڕەتی نەکردەوە. ئەوەبوو لەساڵی ١٩٣٤ واتە دوای ١٢ ساڵ لە دامەزراندنی ئەو پێکهاتانە. هۆزە ئیســـرائیلیەکان نارەزاییەکی زۆریان لەلایەن سەرپەرشتیارانی ئەو کارانە لە هـــەردوو ڕووەوە دەربڕی. ئەوەی بەرپرس بوو لە مێژووی ئەو دەسەڵاتە گەواهییان لەسەر ئەو کارە داوە...

سەرچاوەی بەش/ دکتۆر عەدنان باجەچی (مەزاحم باجەچی)
سیرە و ذکریات لاپەڕە ١٢٤

لەو کاتەی پتەوبوونی پەیوەندییەکانی ولآتانی ئەورووپی لەگەڵ دەسەلآتی عوسمانی دەستپێکرا و دەسەلآت زاڵبوونی خۆی بەسەر زۆربەی لایەنەکانی نیشـــتمانی عەرەبی گەورە درێژ کـــردەوە چالآکییەکانـــی ئەورووپی بەرەو رۆژهەلآت دەســـتی بە جموجۆڵکردن کرد. زاناکان و لێکۆڵەرانی تایبەتمەند بۆ لیکۆڵینەوە لەســـەر ئەو شـــتانەی کە لەو جیهانـــە فراوانەوە هەیە لە گەنجینەو شارستانییەت هەڵوەستەیان کرد. هەروەها کاری دوورخستنەوەی زانـــا شارســـتانییە ئەورووپیەکان بۆ ولآتی رۆژهـــەلآت چ عەرەبی بێت یان عەرەبی نەبێت بەردەوام بوو. دەبینی کە رۆژهەلآتناسان و زانایانی شوێنەوار و زانایانی کۆمەڵناسی و شوێنەوار ناسان و کۆچەرەکان بە ولآتدا دەگەڕان لەوپەڕی باکوورەوە تا ئەو پەڕی باشوورەوە سەردانیان دەکرد و تێکەڵ بە خەڵک و زەویدا دەبوون و گوێیان بەو ترسە نەدەدا کە لە جموجۆڵەکەیان پەیدا دەبوو. ئەوەی لەو بەشـــەدا لامان گرنگـــە راو بۆچوونی بیانییەکانە ئەوانەی ســـەردانی عێراقیان کرد و ماڵ بە ماڵ دەگەڕان و ســـەیری هۆزی جوولەکەکانیـــان دەکرد و ئەوەیان لەیاد نامەکەیـــان تۆمار دەکرد. ئەگەر بمانەوێ ئەوەی کۆچەرەکان لە ناوەڕاستی سەدەی شانزەهەم تاکو سەرەتای سەدەی بیستەم لەســـەر جوولەکەکان نووسیویانە کۆنوسیان بکەین دەبێ زۆر بگەڕێین و لاپەڕەی کتێبەکەشـــمان تەنگ دەبێت. بۆیە نموونەیەکمان لە گەشـــتیارێکی بەریتانی کە لە نیوەی دووەمی ئەو سەدەیە نووسیویەتی وەرگرتـــووە دوای ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە عێـــراق مایەوە و لێکۆڵینەوەی دەربارەی لایەنەکانی کۆمەلآیەتی و جوگرافی و مێژوویی و ئایینی کردبوو. کاتێک ئەو نووسینانەی بیانییەکان لەسەر عێراق کردویانە تەواو دەبێ ئەو کاتە دەتوانین تیشک بخەینە سەر ئاشکراکردنی هەندێ لەو راستیانەی کە باس لە جوولەکە دەکات. لە کتێبی (بين دجله و الفرات) کە گەشتیارێکی بەریتانـــی (لیدی دراور) بلآویکردۆتەوە بەشـــێکی تایبـــەت بۆ خوێنەران دەخەینە روو کە باس لە جوولەکەی عێراق دەکات. خوالێخۆشـــبوو (فوئاد جەمیل) لە ژێر ناونیشـــانی (ولآتی رافیدەین) وەریگێڕاوە، چاپی یەکەمی لەساڵی ١٩٦١ لە بەغدا دەرچووە.

## خێڵە ئیسرائیلیەکان

سەردەمانێک جوولەکەکان لە عێراقدا ژیاون، مێژووەکەیان گەواهیان بــۆ دەدات کـــە لەســـەر روبـــاری بابل دەگریـــان و بۆ باســـی پارەش کۆدەبوونەوە تاکو ئیمرۆش بۆی تێدەکۆشـــن زۆربەی دراو گۆڕو ســـوو خۆرەکانـــی وڵات لەوان بـــوون. ئەوانەی خزمیان لە شـــوێنی بازرگانی (مانچستەر)ی بەریتانی هەبوو لە بازرگانی قوماش کاریان دەکرد، وەکو لە (کتێبی پیرۆز _ کتاب المقدس)دا هاتووە گوایە پاشای ئاشوورییەکان (تیغلات بیلسر) نەوەکانی (ئیســـبات_ الاسباط) هەریەک بە ناوەکانی (روبین و غاد و مناصح)ی بە کۆیلە گرتوون و تاکو ئێســـتاش لە عێراق دەژین. (نەبو خز نەســـر) ئەو پاشـــایەی کە دەستی بەسەر (قودس)دا گـــرت و کاولی کرد و نەتەوەکەش بۆ بابل گوێزرانەوە و ژمارەیەکیشـــی کۆیلـــە کرد. زۆربەی پێغەمبەرانی جوولەکـــە لەوانە: (عزرا و حزقیال و یوناو ناحوم و چەندانی دیکـــە لە عێراق نێژراون. ناوی (نور) بەردەوام بەنـــاوی (ئیبراهیم و هەندێکی تر) نووســـاوە، هیچ یەکێک گومان لەوە ناکات کە (کەشـــتی نوح) بەشـــە پۆلێکی گـــەورەی وەک چیا لەکاتی لافاوەکـــەی رافیدەیـــن لە ناوچووە. (بەهەشـــتی عەدەن) لە شـــوێنی (قورنە)ی ئێســـتا نزیک شاری بەسرە دروستکراوە. (مرهەف ئەلحەس) ی جوولەکـــە دەردی کۆیلەیـــی بینیوە بۆیە هەوڵـــی تاڵانکردنی ئەوانە دەدات کـــە تاڵانیان کردوون. پرۆفیســـۆر (دیلتن) دووپاتی ئەوە دەکات کە کۆمپانیایەک لەوێ بە نـــاوی (ئیکبی) یان (یەعقوب و منداڵەکانی) هەیە ســـەر بە جوولەکەیە کە لەسەردەمی کۆتایی ئیمپراتۆری بابلیدا لە بازرگانی کاریکردووە. ئەو کۆمپانیایە لە دراو گۆڕو هەمیشە کڕیاری زۆر پێکهاتبـــوو. هەڵکنـــەران تابلۆیەکـــی زۆری قوڕیـــان دۆزییـــەوە کە لە چەکمەجەکە هەڵکەندرابوو لە سەریشیدا تۆمارەکانی کۆمپانیای تێدابوو. لەو تابلۆیانە ئیمـــڕۆ دەتوانرێ لە مۆزەخانـــەی بەریتانیا ببینرێت، ئەو کۆمپانیایە لە سەردەمی (نەبوخزنەسر) لە گەشەکردن مایەوە و گەیشتە لوتکە. پرۆفیســـۆر (دیلتن) دەڵـــێ ئەو کۆمپانیایە بـــۆ ماوەیەکی زۆر

دەستی لە کاروباری دیوەخانی بابلییەکان هەبوو. باجی لەسەر ئەو زەوییانەی کە بەروبوومەکانی خەڵەو خەرمان و خورمایان هەبوو وەردەگرت هەمان باجیش کە لەسەر رێگاو بان و جۆگەو ئاودێری سەپێنرابوو بەرامبەر بە سوود لێوەرگرتن کۆی دەکردەوە و لە حەوشەی خانووی کۆمپانیاکە بۆ جێبەجێکردنی هەموو جۆرە سەوداگەرییەک جەنجاڵی پەیدا دەبوو.. زۆر کەس وا بیردەکەنەوە کە ئەو تابلۆیە قوڕانە بێ کەڵکن و لە شوێنێک دانراون. بەڵام وێنەیەکی گرنگ لە ژیانی نەتەوەیی بابلییەکان و وێنەی هەموو چین و توێژەکان و گەورە فەرمانبەران و تاکو جوتیارە ئاساییەکان و بەندەکان پیشاندەدات. ئەو تابلۆیە قوڕانە بۆ سەردەمی کۆن دەگەڕێتەوە کە ناوی (ئەسکەندەر)ی گەورەی هەڵگرتووە. نووسەری کتێبی (چڵی زێڕین _ الغصن الذهبی) دا دەبینێ کە (بویرم) جەژنی جوولەکەیە هاوچەشنە لەگەڵ ئەو ئاهەنگەی کە بابلییەکان بۆ دەستپێکردنی بەهارو خۆشگوزەرانی سازیدەکەن هەروەکو شازادە (ئێستەر)ە. بە بۆچوونی نووسەر و بۆ راستی و دروستی ئەو بابەتە لە چەندین جوولەکەی عیراقیم پرسی بەڵام وەڵامیان نەدایەوە و ئینکاریان لێکرد. ئەو رۆژەی (نەبوخزنەسر) پەرستگایەکەی کاولکرد بەرۆژی رەش پۆشین ژمێردرا، ئاسانە مرۆڤ باوەڕ بکات کە جوولەکەکان پارەیان لێ وەرگرتوون لەسروشتە رەسەنەکانیاندا ئاڵوگۆڕ و گۆڕینەوەن (المقایظة و التبادل) ئەوانیش بە تێپەڕبوونی سەردەم دوو نموونەی رەوانن لەسەر بەهێزی تایبەتمەندییەکانیاندا. جوولەکەکان پاپەندن لەسەر کۆکردنەوەی پارە، بەڵام کۆکردنەوەی پارە لەلای عەرەبەکان بە ئاسانی سەرفی دەکەن دەستیشیان بۆ خێرو خۆشی واڵا کردووە. پارە لەلای عەرەبەکان نمایشێکە لە نمایشەکانی دنیا، بەڵام لەلای جوولەکەکان هەموو دنیایە.

لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم نرخی روپیە بە خێرایی بەرز بۆوە تاکو لەساڵی ١٩١٩ پاشان گەیشتە (دوو شیلن و شەش پەنسات) جوولەکەو بەغدایییەکان بەربەرێکانێی بازاڕیان دەکرد و نرخیش رووی لە

دابەزیـــن کرد. رۆژێک جوولەکەیەکیانم بینی کە بەخەم و پەرۆشـــەوە لە ئەم و ئەوی دەپرســـی ئایا دەبێ جارێکی دیکە نرخ بەرزببێتەوە یان نا؟ بـــەڵام نرخ بە بەردەوامی لە دابەزین دابوو تەندروســـتی جوولەکەش رۆژ لـــە دوای رۆژ بـــەرەو خراپ بـــوون دەچوو. دکتۆری چارەســـەریش بە دەســـتییەوە دۆش دامابـــوو لەگەڵی، بەڵام کەســـێکی هاورێی گوتی کە نەخۆشـــییەکەی (عـــزرا) تەنها نەخۆشـــی روپیەیەو هیچـــی تر نییە، هەرچەندە لەبەر چاو هیچ عەیبی نەبوو و لە خواردنیش دانەبڕابوو بەڵام باری تەندروســـتی تا دەهات خراپ دەبوو، پزیشـــکەکەش کەوتە گومان کـــە دوای ئەو هەمـــوو چارەســـەرییە هەروەکو خۆیەتـــی ئینجا کەوتە لێپرسینەوە تا گەیشـــتە هۆیەکەی کە تەنها نەخۆشیەکەی زیانی پارەی لێکەوتـــووە بۆیە بەردەوام تورەیە، ئەمجارە دکتۆر ســـەردانی کردەوە و پێـــی گوت (ئەگەر پارەی کرێیەکەم نەدەیتێ جارێکی دیکە نایەمەوە بۆ لات) جوولەکەکـــەش لێی پرســـی ئەو کرێیە چەنـــدە؟ دکتۆرەکەش بە ئەنقەست برێکی پارەی زۆری گوت وای لە نەخۆش کرد کە لەشوێنەکەی هەڵسێتەوە و نەخۆشـــیەکەی بڕواو نەیەتەوە. جوولەکە بەغداییەکان بە سروشت رۆژهەڵاتین وەکو باوانیان بە دروشمی ئایینی و پەرستن پاپەند بوون. بەڵام جوولەکە تازە پێگەیشـــتووەکان کاتێ سەردانی ئەوروپایان دەکـــرد بۆ ســـەردانی خزم و کەســـانیان کـــە دەهاتنەوە، بـــە داب و نەریتەکانیان و ئەو کۆت و بەندەی بەسەریان سەپێنرابوو و هەروەها بە رووپۆشـــی ئافرەتـــەکان زۆر دڵ تەنـــگ دەبوون، هەوڵـــی گۆڕینی ئەو دابونەریتەیـــان دەدا. بەراســـتی ئەوەش جێگای داخ بـــووە کە دەبینین جوولەکەیەکـــی بەغـــدای تەمەنێکی زۆری خۆی و بابـــو باپیرانی لەوێ ژیـــاون شـــێواز و رەفتـــاری خـــۆی بگۆڕێت و بچێتە ســـەر شـــێواز و تایبەتمەندییەکانی ئەوروپی.. بەشێوەیەکی ئاسایی ئاهەنگ و جەژنەکانی جوولەکـــە لە بەغدا هەمـــان جەژن و ئاهەنگـــی جوولەکەکانە لە هەموو جیهاندا هەیە. ئەو جەژنەی کە زیاتر دڵخۆشـــی و ئاسوودەیی دەبەخشێ جەژنی (الفصح)ە. ئافرەتی جوولەکە بە رووپۆشـــی ئاوریشـــمی رەنگ

ناسـك و ئـالاو والا دێنـەدەرێ کە هەر وەکـو گوڵی باخـان لە نێو شـەقامەکاندا دەگەشێنەوە و پابەندن بەو ئەرکانەی کە لە جەژندا هەیە ئامادەی دەکەن لەگەڵ ئامادەکردنی خواردن. لە هەردوو شـەوی یەکەم و دووەمیدا ئاهەنگ و شـایی گەورە سـازدەکەن و سەردان و هاتووچۆ لەنێوان خزم و هاوڕێیانیان دەست پێدەکات و لە نەریتێکیشیاندا ئەوەیە کە (گوڵ و شـیرینی) بە ناوێکی خوازراو لە ماڵێکەوە بۆ ماڵێکی دیکە رەوانـە دەکـەن. لـە دوا رۆژی جەژندا هەموو جوولەکەکان سـەردانی باخچـەو کێڵگـەکان دەکـەن و بە دروشـمەکانی جەژنـی (الکفارە) خۆشـیەکانیان بەشـێوەیەکی زۆر باش بەڕێوەی دەبـەن. زۆربەیان بۆ مـاوەی ٢٥- ٢٦ کاتژمێـر بەرۆژو دەبن و لە تەوقی سـەریان تاکو بنی پێیان جلی سـپی لەبەر دەکەن و هیچ کەوشـی چەرمیش لەبەر ناکەن، بـەلام جەژنـی (المضال- کەپرە شـینە) هەموو خێزانـە جوولەکەکان کۆدەبنەوە لە لق و گەلای دارخورما سـێبەر دروسـت دەکەن بۆ ئەوەی خێزانـەکان تێیدا بحەسـێنەوە، لەبن میچی کەپرەکـە هەندێ میوەی پورتەقـاڵ و شـتی دیکە هەڵدەواسـن ئەوەش وەکـو یادگارییەک لەو چالاکییە کشـتوکاڵییەی کـە جوولەکەکان ئەنجامیـان داوە. لە رۆژی کۆتاییدا جوولەکەکان لەناو کەشـتی رووبارەکانـدا کۆدەبنەوە. یاخود لەکەنـار رووبـار بەکۆمـەڵ بێت یان بـە تەنیا دادەنیشـن. جوولەکە هەژارەکانیـش باوەڕیان بەهێزی چاوی پیس و جادوو هەبووەو هەروەها زۆر لـە ئافرەتەکانیان بە هاوڕێیەتی ئافرەتە موسـڵمانەکان سـەردانی مەزارەکانی ئیسـلامیان دەکرد بە تایبەتی گۆڕی (شـێخ عەبدولقادری گەیلانی). زۆربەی ئافرەتە جوولەکەکان بانگەشـەی ئەو کارەیان دەکرد کە توانای چارەسـەرکردنی زۆر لە نەخۆشیەکان دەکەن لەوانە (نەزۆکی و شـێتی) و هەروەها دەتوانن بە هێنانی بەختی باش و کردنەوەی گرێی بەخت و دروسـتبوونی خۆشەویستی و جگە لەوانەش دەرکردنی جنۆکەو جادوکردن و قسـەکردن لەگەڵ رۆحی مردووەکان و باسـکردنی هەواڵی ئەو کەسانەی کە نادیارن، جارێکیان ئافرەتێکی جوولەکەی جادووکەریان

هێنا بۆ دەستنیشـــانکردنی دەردێک کە پزیشکانی شارەزای پێوە هیلاک ببوو. ئەو ئافرەتە هەر بە خێرایی هۆکارەکەی دۆزیەوە کە جنۆکە چۆتە گیانیـــەوە جا ئایا جنۆکـــە ئاوییە یـــان زەوییە...ئەگەر چارەســـەری نەخۆشـــەکە بە دەرکردنی ئەو جنۆکەیە نەکرا ئـــەوا دەبردرێتە ماڵێکی بەتـــاڵ و بە تەنیا لەگـــەڵ جادوکەرەکە دەمێنێتەوە ســـەرەڕای دانانی ســـەوزە و مریشک و گۆشت و هەندێ شتی دیکە.. کاتێک شەو تاریک و بێدەنگ دەبێت جادوکەرەکە هەڵدەســـتێ بە جێبەجێکردنی کارەکەی و بانگهێشـــتی خێوەکان دەکات. ئـــەو خێوانەش ناتوانن بەرگەی ئەو بۆنە خۆشەی لەو خواردنانەوە دەردەچێ بگرن بۆیە لەشی کەسە نەخۆشەکە جێدەهێڵـــن و بەرەو خوانی رازاوە دەچـــن جارێکی دیکە ناتوانن بۆ نێو جەســـتەی نەخۆشەکە بگەڕێنەوە لەبەر لەدەستدانی هێزی پێویست. زۆر جار ئەو جنۆکانە ئاویین هەر بۆیە ئارەزووی مریشـــک و گۆشـــت ناکات بەو شێوەیە دەبێت نەخۆشـــەکە ببرێتە کەنار رووبار لەوێ پیرەمێردێک هێلکەیەک دەشـــکێنێ. چونکە جنۆکەی ئاوی ئارەزووی هێلکە دەکات. ئـــەوان لەو باوەڕەدان کە زۆر جار نەخۆشـــی لە رێگەی ئەو بۆنانەی کە دەگاتە ماڵەکان پەیدا دەبێت بۆیە بەم شـــێوەیە کەســـە نەخۆشـــەکە دەبردرێت بۆ یەکێک لەشـــوێنی پاککردنی پێســـت و داوای لێدەکرێ کە ئەو بۆنانەی لێوەی دەردەچێ هەڵیانمژێ بۆیە ئەو نەخۆشـــیەی لێیەتی جارێکی دیکە ناگەڕێتەوە. ئەگەر جنۆکەکان بەو بۆنانە ســـەریان لێشێوا ئـــەوا بەبۆنی خـــۆش دەتوانرێ دەربکرێ. زۆر جاریـــش بە جادو و نزاو نوشـــتەکردن دەریان دەکردن و پزیشکیش بەکارەکەی خۆیان.. خەڵکی لـــە هەموو دنیادا جـــادو و بەند هەڵدەگرن کـــە پارچەیەکی کانزاییە و هێمای جادوی لەســـەر دروســـتکراوە یان لە پێســـتەیەک پێکهاتووە کە یـــەک لە زانـــا جوولەکەکان نوســـینێکی لەســـەر کـــردووە، جوولەکەو موســـڵمانان باوەڕیان بەزۆربەی ئەفســـانەکان هەیـــە لەوانە قاچەکانی باڵندەو پیاز چالاکییەکانی جنۆکە بەتاڵ دەکات. ئەگەر نەخۆشـــێک لە ماڵێکـــدا هەبوو یاخود ماڵەکە بە نەگبەتی ناســـرابوو ئەوا زانایەکی ژیر

دەهێنن بۆ ماڵەکە هەر چوار لایەکانی ژوورەکان بە زەیت دەڕشـێنن بۆ ئەوەی ئەو بزمارەی کە لە پردێکدا پێشـتر داکوتراوە دەریکەن و لەنێو گۆڕستانەکانیشـدا هوتـاف لێدەدەن. بـۆ ماوەیەکـی دوورو درێژ لە ماڵەکەمـدا کارم بـە جوولەکەیەک دەکرد و دایکـی خزمەتکارەکەم لە جادووکەرە سـپیە بەناوبانگەکان بوو لەکارەکەیدا دەستکەوتێکی باشی کۆ دەکردەوە. کاتێ خزمەتکارەکەم نەخۆش دەکەوت سەردانی پزیشکی نەدەکـرد بەڵکـو هـەردەم سـەردانی کەسـێکی پەککەوتـەی پیری گەڕەکەکەی دەکرد کە بە جادوو تەڵەکەبازی چارەسـەری نەخۆشەکانی دەکرد و وا ناسـرابوو کە بانگهێشـتکردنی جنۆکەکانـی دەکرد و زۆر لەوانەی کەسـەردانیان کردووە لەکاتی دانیشتندا گوێیان لەو چپەچپانە بووە کـە لەزەوی دەردەچوو ترس بەسـەریاندا زاڵ دەبوو. نەریتێکیان هەبـووە کە لەرۆژی شـەممە داگیرسـانی گڵۆپ و کردنـەوەی ئاگر بە هەموو شـێوەیەک قەدەغەیە هیچ خواردنێکیش لە ماڵەکەیان لێناندرێت لە کاتژمێر شەشـی دوای نیوەڕۆی رۆژی هەینی تاکو کاتژمێر شەشـی دوای نیوەڕۆی شـەممەی رۆژی دوایی. بۆیە بـە درێژایی ئەو کاتە ئاگر داناگیرسـێت. تەنها لەو ماوەیەدا خواردنی سـارد دەخۆن. بەباشترین شـێوە قوتابخانە لەلای جوولەکەکانی بوونی هەبووە؛ لەوانە قوتابخانەی (ئەلیاسی ئیسرائیلی) یاخود (ئیعتمادی ئیسرائیلی) کە قوتابخانەیەکی کوڕان بوو. قوتابخانەیەکی دیکەی کچانیش هەبوو بەڵام ئاستی خوێندن لە قوتابخانەی کوڕان باشتر بووە. کچەکان لەسەر ئاخاوتن بە فەڕەنسی رادەهێنران، کەمێکیشیان بە ئینگلیزی دەیانخوێند و هەروەها راهێنانیان لەسەر دروستکردنی نەخش و کونکردن وەردەگرت. زۆربەیان لەسەرەتای تەمەنیـان خوێندنیان جێدەهێڵاو مێردیان دەکرد و کچە جوولەکەکانیش وەکو موسڵمانەکان رووپۆشـیان لەسەر دەمو چاویان دادەنا. بەڵام زۆر وەکو موسـڵمانان تەسـک نەبوون. بەهۆی بڵاوبوونەوەی بیروبۆچوونی سـەردەم ئەو کچانە خۆدا پۆشـینیان کەم ببۆوە. هەرچەند بە تەمەن منداڵ بوون بەڵام زیرەک و گەشـاوە بوون و هیچ بایەخێکیان بە کوڕانی

قوتابخانەکە نـــەدەدا. ڕۆژێکیان ئامادەی ئاهەنگی قوتابخانەیەکی گەورە بــووم کە یەکێک لـــە گەورە پیاوانـــی جوولەکەی ئەو شـــارە خەرجی دابەشـــکردنی خەڵاتەکانی گرتبووە ئەســـتۆی خۆی. ئـــەوەی جێگەی سەرســـوڕمانی هەمـــوو ئامادەبـــووان بـــوو ئەوەبوو کاتێـــک قوتابیە ڕۆژهەڵاتییـــەکان وتارێکیان دەخوێندەوە یاخود نمایشـــێکی شـــانۆییان پێشـــکەش دەکرد هیچ ترس و پەشـــێوییەکیان پێوە دیار نەبوو. کچانی جوولەکـــە لـــە تەمەنی نێوان ١٢-١٧ ســـاڵیدا مێردیـــان دەکرد و ئەو کەســـەش کە دەبێتە نێوەندێکی یارمەتیـــدەر لە نێوانیاندا جا چ بۆ هەر لایەکیـــان بێـــت یان بـــە تەنیا بۆ لایەنێکیـــان بێت. ئـــەوا بەرامبەر بە ماندووبوونەکەی خۆی کرێیەک وەردەگرێت. خزمەتکارەکەشـــم دەیوست ژن بهێنێت بەڵام هیچ کچێکی بەغدای نەدەناســـی کە بیکا بە هاوسەری خـــۆی بۆیە هەڵســـا بە راســـپاردنی دوو ئافـــرەت و پیاوێکی دەلاڵ بۆ دۆزینـــەوەی ئافرەتێـــک. ئەوەبوو ئافرەتێکیان بـــۆ داواکرد و ڕۆژێکیان خزمەتکارەکـــەم و هاوڕێکانی بە هاوڕێیەتی دەلالێک چوون بۆ ماڵی کچە ڕێـــگای پێدرا کە قســـە لەگەڵ کچەکە بکات باس لـــە کاروباری مارەیی بکەن. کاتێ کە گەڕایەوە ماڵەوە پرسیاری ئەوەم لێکرد کە باسی چیان کردووە، وەڵامی دامەوە و گوتی من لەسەر کورسیەک دانیشتم و ئەویش لەســـەر کورســـیەکی دیکەی نزیک منەوە دانیشـــت و پرســـیارم لێکرد بەراســـتی تۆ ئینگلیزی دەزانی، وەڵامی دامەوە و گوتی: کەمێک دەزانم. بـــۆ ماوەیەکی کەم لـــە نێوانماندا بەم زمانە قســـەمان دەکرد پاشـــان پرســـیاری مارەییم لێکـــرد و گوتی (٣٠٠٠) روپیە منیـــش بۆم کرد بە (٦٠٠٠) بەڵام دوایی لەســـەر مارەیی (٤٠٠٠) روپیە ڕێککەوتین. پاشـــان (١٠٠٠) روپیەی دیکەم بۆ خســـتە ســـەری بـــۆ خەرجیەکانی زەماوەند. هەمـــوو لایەکمـــان قاوەمان خـــواردەوە و ئافرەتەکانیش لە خۆشـــیان هەلهەلەیان لێدەدا. یەکێک لە مۆســـیقا ژەنەکانیش مۆســـیقای لێدەدا و گۆرانـــی خۆی دەگوت کە بەتایبەتی بەکرێ گیرابوو. گەورەی کەنیســـە (حاخام) ڕێورەســـمی نیشانکردنەکەی جێبەجێکرد و کۆتاییمان پێهێنا.

لەدوای ئەڵقە لەپەنجە کردن دەبێ شـــیرینی بۆ گەورەی کەنیسەو کرێی ماندووبوونـــی دەڵاڵەکانیــش بدرێت. بەڵام خزمەتکارەکـــەم تەنها (٥) روپیەیدا بە دەڵاڵەکە کە وەکو بەخشـــیش. چونکە ئەوەی سەرپەرشتی هەمـــوو خەرجییەکانـــی کـــرد باوکی بوکێ بـــوو. بـــەڵام لەنێو چین و توێژەکانـــی دیکە هەریەکەو بە پێی سروشـــتی نەریتەکانیان کارەکانیان ئاســـایی بـــەڕێ دەکرد، هـــەر کورێک بیویســـتایە ژن بهێنێ پێشـــتر دەزگیرانەکەی دەناسی و کاروباری هاوسەر بوونیان بە پێی رەفتارەکانی ئەوروپـــی جێبەجێدەکـــرد. هەمـــوو کچێکی جوولەکەش چارەنووســـی مێردکردنە. بەڵام ئەگەر کچێک نەخۆش بێت یان شـــێواو خولقا بێت یان بەهـــەر هۆیەکی دیکەوە نەتوانـــێ مێرد بکات ئەوا یـــەک لە ئەندامانی خێزانەکـــەی ئەرکی بەخێوکردنی دەگرێتە ئەســـتۆی خۆی. ئەوەش زۆر بەکەمی ئەوە روودەدات. کچەکانیــش میراتی لە باوکیان وەرناگرن هەر چەنـــد دەوڵەمەندیش بن. پـــارەی باوکەکە خزم و کورەکانی دەســـتی بەســـەر دادەگرن. بەڵام لەکاتی مێردکردنیان مارەییەکی زۆر وەردەگرن، ئەگەر یەکێکیان مێردەکەی کۆچی دوایی بکات یان لە یەکتر جیا ببنەوە ئەوا هەموو مارەییەکەی لەگەڵ خۆی بۆ ماڵی باوکی دەهێنایەوە. لەسەر داوەتی مێردکردنی کچێکی جوولەکـــەی دەوڵەمەند ئامادەی ئاهەنگەکە بووم. ئەو ئاهەنگەش لە قوتابخانەی (ئەلیاســـی ئیســـرائیلی) سازکرا. ژمـــارەی بانگکراوەکانیش زۆربوون و حەوشـــەی قوتابخانەکە بەقاڵی و حەسیر داپۆشرابوو، زاوا لەسەر کورسیەک لە دوا ریز دانیشتبوو جلێکی ئەوروپی رێکوپێکی لەبەر دابوو و تەربوشـــێکی لەسەر سەری دانابوو کە کڵاوێکی ســـووری خـــڕە، لەهـــەردوو لای چەپی و راســـتی هاوڕێیەکی دانیشتبوو. هەموو میوانەکانیش لەسەر کورسی کە بەتەریبی رێکخرابوو دانیشـــتبوون هەر هەمووشـــیان جلی ئەوروپی و کڵاوی سووریان لەسەر نابوو. ئافرەتەکانیش لە پێش ســـەربانە بەرزەکانی کە کەوتبووە ســـەر حەوشـــەی قوتابخانەکە وەستابوون و باڵاپۆشـــێکی ئاوریشمی جوان و رەنـــگاو رەنـــگ کە بـــە داوی زیوی نەخشـــێنرابوو لەبەریـــان کردبوو.

هەریەکەشــیان رووپۆشــێکیان لەســەرَ روویان دانابوو زۆرجاریش ئەو رووپۆشـــانە رەشێکی ئەســـتوور بوون هەندێکیشیان رووپۆشی ئەورووپی مۆدێل تازەیان بەکارهێنابوو و بەبێ دەنگی هیچ قســـەیەکیان نەدەکرد و خۆیان بەســـەر دیواری پێش ســـەربانەکە خوار کردبۆوە و ســـەیری ناو حەوشـــەیان دەکرد. بوکیش هـــات و بەخێر هاتنی هەموولایەکی کرد کە جلێکی ئەورووپی لەبەر دابوو چەپکە گوڵێکی لەدەســـت دابوو. بەکورتی ســـڵاوێکی لێکردین بە پێی نەریت لەگەڵ دایکی بەرەو ژوورەکەی خۆی رۆیشت و کە دەرگاکەی لەسەر پێش بانەکە دەکرایەوە. ئەو کچانەی کە تەمەنیان بەســـەر چوو بـــوو هەریەکەو لە ژێر چەناگەیـــان پەرۆیەکیان لوولدابوو سەرپۆشێکی بچووکی ســـەیریان لەسەر سەریان دانابوو کاتێ رووپۆشـــەکە دەوەســـتا کە هەمـــووی بەزێڕ نەخشـــێنرابوو و بە دەنکە مرواری دورابۆوە کە بەسەرپۆشـــی (بانجا دورم) ناسرابوو لەسەرەوەشی بـــە قۆپچەی بچووکی خڕ کە لەزێڕی ســـاختە دروســـتکرابوو رازابۆوە. قاوەیان پێشـــکەش نەکردیـــن بەڵکو دیاریی و چەپکـــە گوڵیان داینێ. لەلایەکـــی دیکەی ئەو شـــوێنەی کە ئێمەی لێ دانیشـــتبووین دوو تیپی مۆسیقای لێ دانیشتبوو کە بە نۆرە مۆسیقایان لێدەدا. تیپێکیان ئامێری مۆســـیقای عەرەبییان دەژەنی کە پێکهاتبوون لە زوڕنا و (ســـنود یان الصنجان) واتە تەپڵی گەورە (النقارە) چەقەوانەکە لە دوو تاسی زەرد و خـــڕ و تەنک و گەورە دروســـتکراوە لە ئاهەنگەکان بـــەکاری دەهێنن و هەروەها تەپڵێکی گەورەش کە بریتی بوو لە دوو دەفری مس هەریەکەو بە پێستەی مەڕ داپۆشـــرابوو، میوزکژەنەکان ئامێرە عەرەبییەکانیان بە باشـــی لێدەدا و ئاهەنگەکەیان خۆشـــکردبوو بەڵام تیپەکەی دیکە کە لە ئامێری ئەورووپی پێکهاتبوو و میوزکی تورکیان لێدەدا بەڵام سەرکەوتوو نەبـــوونَ. هەر لەو ئاهەنگەدا کچی بچکۆڵەش بە دەنگێکی بەرز گۆرانیان دەگـــوت و ئاهەنگەکەیـــان رازاندبۆوە. دوای ئەوەی میـــوزک و گۆرانی کۆتایی پێهات و کاتێکی خۆشـــیان بەســـەر برد زاواش هەڵســـا بەرەو ســـەرەوە رۆیشت و زەردەخەنەش لێوەکانی بەرنەئەدا و چوو لە تەنیشت

بوکێ لەسەر کورسیەک دانیشت (حاخام)یش هاتە پێشی فنجانێکی شووشەی پڕ لە شەرابی لە دەست گرتبوو... (حاخام) نوێژێکی کورتی رێکخست و کچی بچکۆڵەش بە دوایدا دەیانگوتەوە زاوا لە شەرابەکەی خواردەوە و پاشان کەمێکیشی بۆ بووکێ کردە فنجانەکەو پێشکەشی کرد بوکیش دەستی لێداو زاوا دووبارە خواردییەوە ئینجا بە زەوی دادا و شکاندنی لەو باوەڕەدان کە شکاندنی فنجان جنۆکە دەردەکات ئەم نەریتە لە جیهاندا لە زەماوەندەکانی جوولەکەدا پەیڕەو دەکرێ، بە درێژایی ئاهەنگەکە زاوا نەقسەی لەگەڵ بوکێ کرد و نە سەیریشی دەکرد تا ئەو کاتەی بوون بە ژن و مێرد. ئینجا جێیهێشت و هاتە خوارەوە بۆ نهۆمی ژێرەوە و لەگەڵ هاوڕێکانی دانیشت. بوک و زاوا بێزار ببوون لەبەر ئەوەی هیچ رێگایەک نەبوو بتوانن پێیدا بڕۆنە دەرەوە. خێزانەکانی هەردوولاش کەم تەرخەمبوون. زۆر جار لەرێو رەسمی ژنهێنان نەریتی کۆنمان دەبینی وەک سەربڕینی کەڵەشێرو مریشک کە پێشکەشی بوک و زاوای دەکەن و هەروەها داگیرسانی مۆمیشمان لەسەر گەنم و جۆ دەبینی بۆ ئەوەی ئەو هاوسەرگیرییە بەرهەمهێن بێت...

لەکاتی خەمناکیدا ئەگەر جوولەکەیەک بمرێ خزمەکانی یەک بە دوای یەکدا دێن بۆ ماڵەکەی و دەنگی گریان و لاواندنەوە بەرز دەبێتەوە، هەندێکیان خۆڵیان بەسەر سەری خۆیان دادەکرد و هەندێکیشیان لەبەر خەم و خەفەت جلی خۆیان دەدڕاند. جوولەکە و موسڵمانەکان لەسەر مردووەکە شیوەن و گریان و لاواندنەوە دەکەن و چاکەکانی دەژمێرن و باس لەو کارەساتانە دەکەن کە بەسەر خێزانەکەیدا هاتووە و ناشبێ ئافرەتی خەمبار ماڵەکەی خۆی جێبهێڵێ تا دوای چەند مانگێک بەسەر مردنی پیاوەکە ئەویش ئەگەر کاروباری تایبەتی هەبێ. ئافرەتە خەمبارەکان پێشوازی لە هاوڕێکانیان دەکەن و زەردەخەنەش نایەتە سەر لێوانیان بە درێژایی رۆژانی رەشپۆشی. بۆ ماوەیەک لەپاش مردنی هەموو رۆژێک سەردانی گۆڕەکەی دەکەن و پاشان ناوە ناوە دەچن و لەهەر سەردانێک

گریان و لاواندنەوەیان زیاتر دەبێت. هەر وەکو ئەوروپیەکان هەردەم جلی ڕەش لەبەر دەکـــەن.. دیاردەیەکی جوان لەلای هەندێ لە جوولەکەکانی بەغدا هەیە ئەوەیە کاتێک کوڕێکی گەنج هێشـــتا ژنی نەهێناوە و دەمرێ بـــە تیپی مۆســـیقاوە دەڕۆن دەینێژن و بۆ ئـــەو ڕۆژەش کچێک بەکرێ دەگرن و جلی بوکێنی لەبەر دەکەن و لە تەنیشـــت تابوتەکەیدا دەڕوات ئـــەو بیرۆکەیەش کە لەســـەری ڕاهاتوون بۆ بێبـــەش بوونی ئەو گەنجە مردووەیە کە خۆشـــیەکانی ژیانی ئەنجام نەداوە، لەوانەشە وەکو زۆربەی نەریتەکانی دیکە لەبیر بکرێت...

## تالانكردنی بەغدا و رۆژانی كوشتنی جوولەكە

رۆژی یەكەم و دووەم لە مانگی حوزەیرانی ســـالی ١٩٤١ ترسناكترین رووداو بوو كە لە شاری بەغدا بەسەر جوولەكەی عێراقدا هات كە هەزارەها سال لەمەوبەر ژیانێكی ئازادو خۆش پڕ لە چالاكی و گەشاوەیان لە هەموو بوارێكی ژیاندا بەسەر بردبوو. هەر بەو هۆیەوە رژێمی دەسەلات زەرەر و زیانێكـــی زۆری لایەنی ماددی لێكەوت و جگە لە مردنی دەیان كەس لە ئاكامی ئەو رووداوە. رەگەزپەرســـتی جیهانی بۆ بەرژەوەندی چەمك بیرو باوەڕەكەی ئەو بارودۆخەی قۆستەوە و وەسفی ئەو كوشتارگەیەی كە لە دوو رۆژدا رویدا دەكات كە لەلایەن كۆمەڵێكی دیاریكراوی گەلی عێراقەوە نەخشـــەی بۆ كێشرابوو ئامانجی یەكەم و كۆتایی دەست بەسەر داگرتنی تەواوی هێزی جوولەكە بوو لە عێراق بەبێ رەچاوكردنی مافی مرۆڤ یاخود هەر ئاوڕدانەوەیەك لە رێكخراو و یاسای ناوخۆیی و دەولی، رەفتارەكانی رەگەز پەرستی لە ساختە پێكردنی ئەو چەمكە ژەهراوییە بۆ نێو مێشكی سەركردەكانی رەگەز پەرستی لە جیهاندا سەركەوتنی بەدەست هێناو بۆ دەستكەوتنی حساباتی داهاتوویان كاریان دەكرد و تا ئێستاش هۆكاری ئەو پەشێوییە دیار نییە و نەزانراوە. تەنانەت لێكۆلەرەكانیش نەیانتوانی بەدەرخســـتنێكی زانســـتی ورد هۆكاری پێكدادانی هـــەردوولا بدۆزنەوە جگـــە لەوەش نەتوانرا ژمـــارەی قوربانیانی جوولەكە دیاری بكرێت. هەر لایەنەو هەواڵی كوشـــتنی كۆمەڵێك لە قوربانیانـــی خۆی راگەیاند. ئەو ئەنجامەش وای لە لێكۆلەر كرد كە دوای دەیان ســـال لە بەسەر چوونی ئـــەو رووداوە ناخۆشـــە دۆش دابمێنێ و نەتوانی راســـتی راگەیاندنەكە بسەلمێنێ، گرفتی سەرەكی ئەو كوشتارگەیە ئەوەبوو كە بەپێی پێویست هۆیەكانی گواستنەوە و فریاكەوتنەكان نەیانتوانی بە خێرایی بریندارەكان بگەیننە نەخۆشخانە بۆ چارەسەركردنیان. زۆربەی بریندارەكانی جوولەكە لە جیاتی ئەوەی بچنە نەخۆشـــخانە چوونـــەوە ماڵەكانی خۆیان لەبەر ئەوەی كارمەندانی نەخۆشـــخانە جولەكە نەبوون ترســـی ئەوەیان هەبوو كە بیان كوژن  مێژوونووسی عێراقی (عەبدولرەزاق حوسەینی) باس لە

وەســـفکردنی رووداوەکە دەکات و دەڵێ (کارەسات)، رۆژی یەکشەممەی مانگی حوزەیرانی ١٩٤١ز بوو رێکەوت بوو بە جەژنی سەردانی پێغەمبەر (یوشـــع) بۆ لای جوولەکەکان کە زۆربەیان بۆ ســـەیرکردنی ڤیستڤاڵی پێشوازیکردن لە میر (عەبدولئیلاه) بەرەو فرۆکەخانەی مەدەنی رۆیشتن بۆ ئەو مەبەستە کۆمەڵێک مەسیحی و موسڵمانیش بۆ فرۆکەخانەکە چوو بوون هەر لە نێو ڤیســـتڤاڵەکەدا دەمەقاڵێـــەک لەنێوان جوولەکەیەک و موسڵمانێک روویدا. وای لێهات شەڕو پێکدادان لە نێو هەردوو کۆمەڵەکە پەرەی ســـەند و لـــە ئەنجامدا حەڤدە جوولەکە برینـــدار بوون و دوو لە بریندارەکانیش گیانیان لە دەســـتدا. هەمـــوو نارەزاییان بۆ ئەو رووداوە چاوەڕوانکراوە دەربڕی و ئەوانەی دەســـتدرێژیان کرد دەستگیرکران. بۆ ئێوارەی هەمان رۆژ دەســـەڵاتداریەتی لیوای بەغدا لەسەر داوای لێژنەی ئاسایشـــی ناوخۆ بەیاننامەیەکی دەرکرد (لە رۆژی ١٩٤١/٦/٢ رێگا بە جەماوەری پایتەخت و دەوروبەری بدرێ شـــەوانە بەبێ دیاریکردنی کات وەکو پێشـــتر هاتووچۆی خۆیان بکەن) پاشـــان هەریەک لە موسڵمان و جوولەکە و مەسیحی بارودۆخی پایتەختیان بە شێوەیەکی ئاسایی بینی هەر تاکێکیش توانـــی بە ئارەزووی خۆی گوزەر بکات بێ ئەوەی بیر لە داهاتوو بکەنەوە و جوولەکەکانیش لە خۆشـــگوزەرانی خۆیان دابوون و کاتێکی خۆشیان لە ئاهەنگ و سەیران و یانەکان بەسەر دەبرد هەروەها دڵخۆش بوون بە کۆتایی هاتنی بزوتنەوە ســـەربازییەکان و تێکشـــکانی کەیلانی و کۆمەڵەکەی. پاشـــان بینیان کەرتەکانی ســـوپای عێراقی لە مەیدانی جەنگدا پاشەکشـــە دەکەن و شوێنەواری نشوستی و خەمۆکیان پێـــوە دیار بوو، هەندێ گەنجی گێلیش خۆشـــحاڵی خۆیان بەو ئەنجامە دەردەبڕی و ســـوپاکەش گوێیان لەو وشە ناخۆشـــانە دەگرت. سوپای بەریتانی کە خۆی خزاندبووە نێو شاری بەغدا بە دوای هۆکارێک دەگەڕا کە دەیویســـت ئەوەی لە رۆژی (١٩٤١/٥/٧) بە (عەشـــار)یان کرد بە ئەوانیـــش بکەن و دەســـت و پێوەندەکانی کەیلانیش بـــە دوای کارێک دەگەڕان کە رای گشـــتی بشڵەژێنن. لە دەوروبەری کاتژمێر (٨)ی شەو

دەمەقاڵێیەک لە نێوان دوو گرووپ پەیدابوو کە بووە هۆی لێدان و شـــەڕو پێکدادان و پاڵنان بە زووترین کات پۆلیس گەیشـــتە شوێنی مەبەست و توانی ئاســـایش بگەڕێنێتەوە پاش ئەوەی بە کارێکی ناپەسند لە مێژوو تۆمارکرا..

لە بەیانـــی ڕۆژی دواتر کە ڕێکەوتـــی (٢)ی حوزەیران بوو خەڵکی بۆ شـــەقامە گشـــتیەکان هاتنـــە دەرەوەو دەربارەی ڕووداوی شـــەوی رابـــردوو زانیارییەکی ئەوتۆیان نەبوو. کەرتەکانی ســـوپای عێراقیش لە پاشەکشەکردن بەردەوام بوون لەسەر بازگەی (الوشاش) کە لە تەنیشت (الکرخ) بوو بۆ ســـەربازگەی (ڕەشید) و (القلعه المدفعیه) دەکشانەوە کە لەلای (الرصافه) بەســـەر (جسر المامون)دا تێپەر دەبوون. گەنجانی جوولەکە بەردەوام بوون لە ئیســـتفزاز کردنی گەنجانی موســـڵمان بۆیە هەڵچوونـــی دەروونی لە نێو گەنجە موســـڵمانەکان پەیدابوو بووە هۆی شەڕو پێکدادان لە نێوانیان. لەو کاتەشدا پایتەخت دەسەڵاتێکی بەرپرسی تێدانەبوو هەر بۆیە عەرەبەکانی دەوروبەر هێرشیان بۆ سەر هەندێ ناوچە کـــردوو ماڵ و دوکانەکانیان تالان کرد و کارەســـات ڕوویدا و دڵتەنگی و تـــرس و تۆقین لە نێو دەروونی خەڵکیدا دروســـتبوو. (زەعیمی ڕوکن حەمید نەسرە) کە نوێنەری سوپابوو لە لیژنەی ئاسایشی ناوخۆ لەکاتی ڕووداوەکە لە ماڵەکەی خۆی لە (کەرخ) بووە بەڵام بۆ شوێنی کارەکەی کە لە (ڕەسافە) بووە ڕۆیشـــتووە و پەیوەندی بە بەڕێوەبەری پۆلیسی گشتی (حوسامەدین جومعە) کردووە کە ئەندامی دووەمی لیژنەکە بووە. پرســـیاری هۆکاری دروســـت بوونی ئەو ڕووداوە و هەوڵی ڕێگە نەگرتنی لێکردووە. بەڕێوەبەریش لە وەڵامدا دەڵێ: کە ڕێگا لێگرتن پێویســـتی بە بەکارهێنانی هێزە (دەسەڵاتداری لیوای بەغدا (خالید زەهاوی)یش لێرە نییە و کەســـیش شوێنی نازانێ تاکو بە پێی دەسەڵاتی یاسایی فەرمانی پێویســـت بە بەکارهێنانی هێز بدرێ. دوای بینەو بەردەیەکی دوور و درێژ فەریق (ئیســـماعیل نامق) بە سیفەتی ئەوەی کە کاتی خۆی گەورەترین سەرکردەی ســـوپا بووە پەیوەندی بە خاوەن شـــکۆی ڕاسپێردراو کرد

و بارودۆخەکەی بۆ باسـکرد کەوا پێویسـت دەکات بەڕێزیان فەرمانێک بنووسـێ بە بەکارهێنانی هێـز بۆ دامرکاندنەوەی پەشـێوی و کۆتایی پێهێنانـی ئـاژاوە ئەویش بـەم داواکارییە رازی بووە واژووی لەسـەر فەرمانەکە بەو شێوەیەدا:

**- بۆ سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپا.**

دوای ئەوەی کە گەڕامەوە عێراق دەسـەڵاتی تـەواوم وەرگرت بۆیە فەرمانتان پێدەدەم ئەو خۆپیشاندانەی کە لە وڵات دەکرێ رێگای لێبگیرێ ئەوانەی گاڵتەو گەپ بە دەسەڵات و دەستدرێژی بۆ سەر خەڵکی دەکەن لێیان بدرێ و ئەگەر پێویستی کرد ئەوا ئێوە ئازادن لەبەکارهێنانی چەک بۆ ئەو مەبەستە.

**واژوو**

**عەبدولئیلاه**

**راسپێردراو لەسەر کورسی عێراق**

**١٩٤٢/٦/٢**

لیوای تایبەت بەسواری ئەسـپ لەگەڵ تیپێکی لەشکری پیادەی پڕ چەک بەنێو شەقام و دوکانەکانی پایتەخت بڵاوبۆوە و ئۆتۆمبیلی داریش بە دوایاندا دەڕۆیشـت و شەقامە سەرەکیەکانیان داخست و سەنگەریان لەسەر رێگای جیا جیا دانا. لە کاتژمێر یانزە و نیو دەست بە تەقەکردن کرا و لە ئاکامدا ١١٠ کەس کوژرا و زۆریش بریندار بوون ئەو بڕیارەش بە واژووی سەرۆکی سوپا (محەمەد ئەمین ئەلعەمری) دەرچوو.

- بۆ جەماوەری عێراقی ئازیز

پێشتر لیژنەی ئاسایشی ناوخۆ بەیاننامەیەکی فەرمی بڵاوکردەوە کە بە پێی چەند مەرجێک بۆ سەربەخۆیی وڵات گرێبەستێک لەگەڵ حکومەتی بەریتانیا بەسترا. سوپاکەشمان کەموکوڕیان نەبووە. ئەو سوپایەی کە لە ماوەیەکی دژوار و ناخۆشی مێژووی وڵاتەکەمان پاسەوانێکی دەستپاک و وەفاداری وڵاتەکەیان بوون و ماف و ئەرکەکانیان پاراســتووە و ئاسایش و ســەلامەتی و سەربەخۆیی. وڵاتیان خســتۆتە سەرشانی خۆیان و بۆ هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی نوێ لە ژیانی نەتەوەکەمان کە بەڕاستی هەوڵی بۆ ئازادی و سەربەخۆ داوە هەر بۆیە داوا لە رۆڵەی میللەتە بەڕێزەکەمان دەکەین کە بەڕاستی بۆ پاراستنی مافی تاکە کەس و بەردەوامی ئاشتی و هێمنی لە هەموو ناوچەکانی وڵات پاڵپشتمان بن و دوای ئەوەی پایتەخت چەند کارێکی ئاژاوەیی بە خۆیەوە بینی بۆیە هەر لە ئێســتا تا کاتێکی نادیار بڕیاری قەدەغەکردنی هاتووچۆ دەدەم و هەر کەسێکیش سەرپێچی ئەو بڕیارە بکات بــە فەرمانێکی فەرمی تەقەی لێدەکرێ و ئەوانەش کە دەیانەوێ دەســتدرێژی بۆ سەر پیرۆزی ماڵەکان و بازارگەکان بکات ئەوا لە هەر شوێنێک بدۆزرێنەوە لە سێدارە دەدرێن. هەر بۆیە ئەی رۆڵەکانی نیشــتمان لەو کاتە ترســێنەرەداو بۆ مێژووی وڵاتەکەمان بسەلمێنن کە ئێوە خەڵکێکی ئازادن و شــایەنی ســەربەخۆیین بۆ پاراستنی ئاشتی و بێدەنگی دەبێ لەگەڵ ســوپا دلێرەکەتان هاوکاربن تا ئەو کاتەی بەپێی دەستوور وەزارەتەکان دادەمەزرێن.

**سەرۆکی ئەرکانی سوپا**

**محەمەد ئەمین ئەلعەمری**

**بەغدا ١٩٤١/٦/٢**

(تەها هاشـــمی) لە یادەوەرییەکانیدا بەم شێوەیە باس لە رووداوەکە دەکات:

یادەوەرییەکانی (تەها هاشمی) بەشی یەکەم لاپەڕە (٤٥٥)

لە (١)ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤١ (عەزیز سامی) هاتە لام و هەواڵی هێرشـــکردنی جەماوەری بۆ ســـەر ماڵە جوولەکەکانی دامێ لە سەرووی هەموویانەوەش ســـەربازەکان بوون پۆلیسیش نەیتوانی رێگریان لێبکات هـــەر بۆیە (حوســـامەدین جومعـــە)ی بەرێوەبەری گشـــتی پۆلیس کە سەرپەرشـــتی بارودۆخی ئاسایش دەکات داوامان لێدەکات کە دەرگامان دابخەیـــن و ئاگاداربین. لـــە (٢)ی حوزەیرانی ١٩٤١ جەماوەر لە دزین و تالآنی بەردەوام بوو کۆمەڵێک لە (شـــەرقاوییەکان) و خەڵکی عەممارە کـــە بۆ بەغدا نێردرابوون و لـــە ئەمینداریەتی بەغـــدا کاریان دەکرد لە دەوروپشتی خەڵکەکە دەسوڕانەوە و هاوکار بوون لەو راو و روتیە. وادیار بوو کە سەربازەکانیش هاندەرو پاڵپشتیان بوونە بەڵام پۆلیس نەیتوانیوە رێگریان لێبکات، دەڵێن لە دوایدا پۆلیســـیش لەگەڵیان بەشداری کردووە و زۆربەی دیکەش وەک تەماشەکار بووینە. دبلۆماتکاری عێراقی (ئەمین مومەیەز) دەربارەی بەســـەرهاتەکە دەڵێ: ئـــەو کاتەی هەندێ خەڵکی هێرشیان کردە سەر گەڕەک و شوێنە بازرگانیەکانی جوولەکە و تالآنیان کرد هێزی پۆلیس و ســـوپا توانیان هەندێ لە شتوومەکەکان بگەڕێننەوە و بۆ ماوەی چەند هەفتەیەک لە شەقامی (ئەبو نەواس) لە پێش دەرگای وەزارەتی بەرگری لە شـــەقامی رەشـــید و بەردەم فەرمانگەی پۆلیسدا کەڵەکە کرابوون.

**ئەمین مومەیەز**

**لە کتێبی (بغداد کما عرفتها)**

لە یادەوەرییەکانی خاتوو (مەدیحە سەلمان) خێزانی شەهید (مەحمود سەلمان) کە سەرکردەی هێزی ئاسمانی بوو دا هاتووە:

دوای دوو رۆژ لە راگەیاندنی گرێبەستی ئاشتبوونەوە هێزی بەریتانی هاتە ناو بەغداو جوولەکەکانیش پێشوازیان لە کەرتە سەربازییەکان کرد و گوڵبارانیان کردن و لە رووی هەســتی نەتەوایەتیاندا وەستان و وشەی زۆر رقیان بە گوێی خەڵکیدا دەچەپاند جەماوەریش لە دژیان راوەســتان و دەســت بە دزین و کوشــتن و بریندارکردن و تاڵانکردن کرا لەو کاتەدا بەغــدا بوو بــە پارچەیەک ئاگری دۆزەخ لە هەمــوو لایەکی گەڕەکەکان و زۆربــەی گۆڕەپانەکان دەنگــی گوللە لەم لاو ئــەولا دەهات و خوێن بە نێو شــەقامە گشــتییەکاندا بڵاو ببۆوە ئەو بارودۆخە ئاژاوەییە سێ رۆژ ســێ شــەو بەردەوام بوو. بۆیە سوپا بۆ پاراستنی گیانی خەڵکی و سەروەت و ســامانیان پارێزگارییان دەکرد لەگەڵ ئەوەشدا قوربانییەکی زۆری جوولەکــەو خەڵکی دیکەی لێکەوتەوە و زیانی ماددیشــی گەلێک زۆر بوو.

**یادەوەرییەکانی**
**مەدیحە سەلمان**
**(الأسیرە) ژمارە (٩٣)**
**لاپەڕە (١٢٨)**

هەروەها (تاهیر ئەلبەیاتی)یش یەکێک بووە لەو گەنجانەی کە لە ژێر فەرمانی خوالێخۆشبوو (ئەلسەبعاوی) لە کەتیبەی گەنجاندا بووە. بەم شێوەیە باس لە رۆژانی تالآنی دەکات:

ئەو تالآنیەی کە لە بەغدا روویدا بە بانگەشەی رەگەز پەرستی بوو بە کورتی هەروەکو من بینیم کە سەربازانی عێراقی لە بەرەکانی جەنگدا لەبەر دۆڕاندنیان لەشەڕ کردن لەگەڵ ئینگلیز باری دەروونیان بیهێز و ماندوو بوو. گوێمان لێبوو کە سەرکردەیەکی رەگەز پەرستی بوو لەشاری حەببانیە کوژرا. لەو کاتەی بۆ پێشوازیکردنی (عەبدولئیلاە) دەرچووبوون هەندێ جوولەکەش بیانویان بە سەربازە گەڕاوەکان دەکرد و شەڕێک هەڵگیرسا توخمە رەگەز پەرستەکانی لە نێوان جوولەکەی بەغدادا ئەوەیان قۆستەوە بۆ پێگەیاندنی ئەو تاوانانە دژی جوولەکە.

**تاهیر ئەلبەیاتی**
**گۆڤاری (الف باء)**
**تەمموز ١٩٩٦**
**ژمارە (١٤٤٩)**

(مەحمــود ئەلدرە) لە کتێبی (جەنگی بەریتانیا و عێراق)دا باس لە تالانیەکە دەکات:

ڕۆژێکیـــان (عەقیدی ڕوکن نورەدین مەحمــود) بانگی من و (حەقی عەبدولکەریم)ی کرد و داوای لێکردین کە بۆ وەستاندنی ئاژاوە و تالانی لە بەغدا هاوکاری بکەین. پێشنیازی ئەوەی کرد کە قەدەغەکردنی هاتووچۆ لە نێوان (٥)ی ئێوارە تا (٦)ی بەیانی بدرێت و ئەوەی سەرپێچی بکات بــە چەک لێیبدرێ... بەرێوەبەری جموجۆڵی (عەمید مەحمود نورەدین) لەســەر ئەو بیرۆکە رازی بوو داوای کرد جێبەجێ بکرێ، بەیاننامەیەکی نووســی و داوای لـــە (نورەدین مەحمود) کرد واژووی لەســەر بکات لە رادیۆ بڵاو بکرێتەوە (نورەدین مەحمود)یش رازی نەبوو واژووی لەســەر بکات چونکە لە ســوپادا لە ئەو پلــەی بەرزتری تێدابووە. دوای ئەوەی (لیوا ئیســماعیل نامیق) لە (مەنســوریە) گەڕایەوە بۆ بەغدا لە دیوانی ســەرۆکایەتی ئەرکان دانیشــت. (عەقید نورەدیــن مەحمود)یش داوای کرد کە دەبێ لیوا (ئیســماعیل نامیــق) بەیاننامەکە واژوو بکات. من و حەقی عەبدولکەریم ســەردانمان کرد و بەیاننامەکەمان پیشــاندا، بەڵام واژووی نەکرد لەبەرپرسیارەتی ترسا. راسپێردراو (عەبدولئیلاە) گەیشتە بەغــدا پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لەگەڵ (لیوا ئیســماعیل نامیق) کرد و داوای واژووکردنی بەیاننامەکەی لێکرد ئەویش واژووی کرد. ئەفســەرانی ئەرکانی جمووجۆڵیش هەوڵیاندا دەقی بەیاننامەکە بە لیژنەی ئاسایشی ناوخــۆ بگەیەنن. بەڵام نەیانتوانی ئەندامانی لیژنەکە بدۆزنەوە، پاشــان بــە یارمەتی ئۆتۆمبێلێکی گەڕۆک بە بلندگۆ بڵاوکرایەوە. پاش هەوڵێکی زۆر ماڵــی ئەندازیاری رادیــۆ دۆزرایەوە و بەیاننامەکــە ئێوارەی رۆژی (١)ی حوزەیران لە رادیۆ پەخشــکرا کە بە هەموو شــێوەیەک دزین و تالانی و خۆپیشــاندان قەدەغە بکرێت. بەڵام لەبەر نەبوونی سیستەم و پاراستنی ئاسایش لەشەودا جارێکی دیکە شەڕ و ئاژاوە و تالانی دەستی پێکردەوە و بەغدای شــێواند و بۆ تۆڵە ســەندنەوە لە جوولەکە هەندێ لەســەیارە گەڕاوەکانی بەرەی جەنگ بەشداریان لەو ئاژاوەیەدا کرد، هەر

لــــه بەیانـــی رۆژی (٢)ی حوزەیران تاکو نیوەڕۆ شــــەڕەکە توندی کرد. ســــەرۆکی ئەرکانی ســــوپای نوێ (فەریق محەمەد ئەمین ئەلعەمری) که لەو رۆژەدا بەیاننامەی قەدەغەکردنـــی هاتووچۆی بڵاوکردەوە، فەرمانی بەکارهێنانی چەکی دەرکرد بۆ هەرکەسێک سەرپێچی ئەو فەرمانە بکات و ئەوانەش کە هەوڵی دەســـت درێژی بۆ سەر پیرۆزی ماڵ و بازاڕگەکان دەکەن لەهەر شوێنێک بدۆزرێنەوە لە سێدارە دەدرێن و سەرۆکی ئەرکانی سوپا فەرمانی بەکارهێنانی شەش لەشکری ئەسپ سواریدا بۆ پاراستنی ئاسایشــــی پایتەخت و ســــێ کەتیبەی خۆی لە هێلی بەرگری پاشەکشە پێکرد بۆ ئەوەی بچنە ئەو شوێنە هەستیارانەی کە ئاوەدانی خەڵکی لێیە. ئاژاوە و تالآنی لە بەیانی رۆژی (٣)ی حوزەیران کۆتایی پێهات جگە لە هەندێ کاری تاکانە رۆژی پێنج شــــەممە (٥)ی حوزەیران بەردەوام بوو. ئیتر باری سروشتی بۆ پایتەخت گەڕایەوە.

**مەحمود ئەلدەرە**
**جەنگی بەریتانی و عێراقی**
**لاپەڕە (٤١٠-٤١١)**

## کۆچکردن و لێسەندنەوەی رەگەزنامە لە جوولەکەی عێراق

دوای ئــەو زنجیــرە تەقینەوانــەی کە لە ناوچە جیا جیاکانی شــاری بەغدا روویاندا بە پێی بڕیاری وەزارەتەکەی (تۆفیق ئەلسـویدی) یاسـای کۆچکردنی جوولەکەی پەسـند کرد کە تیایـدا دەڵێ: هەر جوولەکەیەکی عێراقی بە ویسـتی خۆی دەتوانێ ئەو ماوەیەی کە بۆی دیاریکراوە عێراق جێبهێڵـێ هەریەک لە (تۆفیق ئەلسـویدی) و (سـەلاح جەبر)ی وەزیری ناوخـۆ بەرگرییان لـە هۆکاری دەرکردنـی ئەو بڕیارەکرد و ئەوەشـیان روونکردەوە کە ئەو کارە لە پێناو بەرژەوەندی نیشتمان و گەلە و هەروەها بۆ پاراستنی ئابووری عێراقە کە بەهەموو جۆرێک کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی جوولەکە. لەلایەکـی دیکەوە لە نێو پەرلەمانـدا نارەزاییەکی بەهێز دژی دەرکردنی ئەو یاسـایە هەبووە (مەزاحەم ئەمیـن باچەچی) کە ئەندامی ئەنجوومەنی پیاوماقوڵان بووە سەرکردایەتی ئەو بەرهەڵستکارانەی دەکرد و لە دانیشتنێکی ئەنجوومەنی پیران کە لە ١٩٥٠/٣/٤ بەسترا یاداشتێکیان دەرکـرد کە لە ئەوەی خـوارەوەدا هاتووە: بەرێزان لە یـادم نییە کە لە رۆژی دامەزراندنـی ئەنجوومەنی نەتەوایەتی تا ئیمرۆ هیچ یاداشـتێک لەو شێوەیە کە ترسـناک بێت پێشکەش بە ئەنجوومەن نەکراوە و پێم سەیرە کـە وەزارەت ئەو بڕیارەی دەرکردووە و داوا لـە ئەنجوومەنی نوێنەران و ئەو ئەنجوومەنە دەکات کە بە رێگایەکی خێراو سـەرپێیی چارەسـەری بۆ بکات. وەزیـری ناوخۆ لە بەیاننامەکەی بەرامبەر بە ئەنجوومەنی نوێنەران دەڵێ: (بۆ ئاسـانکردنی کاروباری جوولەکەکان ئەوانەی کە بەیەکجاری و بەشـێوەیەکی نایاسایی و سەرپێچی دەیانەوێ عێراق جێبهێڵن دەستەیەک لە چەتەیان بۆ پێکهێنان). یاداشتێکمان بە دەست گەیشتووە کە باس لەو جوولەکانە دەکات کە بەبێ پاپەندبوونی یاسـا رایانکردووە و چەتەکانیش یارمەتیان داون و حکومەتیش دەیەوێ ئەو سـەرپێچیە بە شتێکی یاسایی دابنێت، بۆیە ئەو یاداشـتەمان هێناوە کە ئەنجوومـەن بە خێرایی چاوی پێدابخشـێنێت بەڵام کاتێ کـە بینراو نەتوانرا قەدەغە بکرێت پێویسـتە کە توشـی توندترین سـزا بدرێـت. وەزیری ناوخۆ لـە بەیاننامەکەیدا لە

ئەنجوومەنــی نوێنەراندا دەڵێ: پەیوەندی بەهەندێ کەســایەتی ئەو هۆزە کراوە بەڵام نەتوانراوە کە هیچ چارەســەریەک بکرێ. حکومەتیش دەبینێ کە ڕێگەیەک بۆ پێشکەشــکردنی ئەو یاداشتە نییە، ئەوانەی کە دەیانەوێ عێراق جێبهێڵن نابــێ ناچاریان بکەن کە بمێننەوە چونکە لە بەرژەوەندی وڵاتدا نییە. لەوانەشــە لە بەرژەوەندی زۆربەی هۆزەکەش نەبێ. من ناتوانم دان بــە خۆمــدا بگرم و زۆر بــە داخەوەم کە دەبینــم وەزارەتێک ئاوا بە شــێوەیەکی لاواز و ملکــەچ دەرکەوتووە بەڵام خەڵکەکەش دەبێ ســزای خۆیــان وەربگرن. (مزاحەم باچەچی) لە وتارەکەی لە ئەنجوومەنی پیراندا بــەردەوام دەبێت و دەڵێ: لە ئەنجامی یاداشــتەکەدا هەروەکو گوتم دەبێ ڕێگە چارەیەک بۆ ئەو دەســتەو کۆمەڵانەی کە دەیانەوێ ئاسایشــی وڵات تێکبدەن و حکومەتیان ناچارکــردووە داواکارییەکانیان بۆ جێبەجێ بکات و زۆربــەی ئەو گەنجانەی ڕایانکردووە و بونەتە هێزێک بۆ ســوپای دوژمن پێویســتە لەســەرمان کە لە دژیان بجەنگێین چونکە کێشەیەکی گەورە بۆ عێراق دروســت دەکەن. سیاسەتی ئەو یاداشتەش ئاسانکردنی کۆچکردنی جوولەکەیە بۆ نێو لایەنگرانیان کە لەسەر حسابی عەرەب و عێراق سوپای دوژمن بە هێز دەکەن. بــەڵام نوێنەری جوولەکە کەمەکان لە ئەنجوومەنی پیران (عزرا مناحیم دانیال) کۆچکردنی جوولەکەی بەو شێوەیەی خوارەوە شیکردەوە.

١- ســەپاندنی ڕاگرتنی کاروباری ئیداری بەســەر هــۆزی جوولەکە بە درێژایی دوو ساڵ پێش ئەوەی کۆچ بکەن.

٢- نەبوونــی هیچ کارێک کە جوولەکەی عێراقی بیەوێ کاری پێی بکات و قوتابخانە باڵاکانیش قوتابی جوولەکە وەرناگرن. ئەگەر بیانەوێ لەســەر حســابی خۆیان بخوێنن هەر ڕێگەیان پێنادەن و هەروەها هیچ دامەزراندن و کاروباری بازرگانیان پێنادرێ جگە لەوانەش لە ڕیزی پۆلیس و سوپاشدا وەرنەدەگیــران هــەر لەبەر ئــەو توندوتیژیە بوو جوولەکــەکان عێراقیان بەجێهێشت.

لە ڕاپۆرتی دانیشــتنەکانی ئەنجوومەنی پیــران ٤٩- ٥٠ کۆبوونەوەی

ئاسـایی (٢٣) چاپخانـەی حکومەت لاپەڕە (٢٩) لە هەمان دانیشـتندا (تۆفیق ئەلسـویدی) بەرگری لە کێشەی جوولەکەی کردوو لە ئەنجوومەنی پیراندا گوتی ئێمە بۆچی ئەوانە ناچار بکەین بۆ مانەوەیان لە وڵاتدا ئەگەر دەیانەوێ بمێننەوە ئەوا بە خۆشـحاڵییەوە با بمێننەوە. ئەگەر ئارەزووش ناکـەن ئەوا ئێمە لە بارو زروفێـک داین ناتوانین ناچاریان بکەین. وەزیری ناوخۆ (ساڵح جەبر) ڕەشنووسێکی یاسایی بۆ پەرلەمانی عێراقی بەرزکردەوە و تیایدا دەڵێ: ڕێگا بە جوولەکەکان دەدرێت کە وڵات جێبهێڵن پاش ئەوەی دەسـتبەرداری ڕەگەزنامەی عێراقی دەبن و لە بەرژەوەندی گشتی دانییە کە خەڵکی ناچار بکەین لە وڵاتدا بمێننەوە ئەگەر خۆیان ئارەزوویان لێنەبێت. لـە کاتی وتووێژکردن لە نێو پەرلەمـان کۆمەڵێک لە نوێنەران ڕێگر بوون لە بەردەم جێبەجێکردنی ڕەشنووسی یاسـایی دیاریکراو لەوانە (مزاحەم باچەچی و ئیسـماعیل غانم) گوایە ئەو بڕیارە لەگەڵ بەرژەوەندی عەرەب ڕێک ناکەوێت. لەو کاتەی ڕەگەزنامەی عێراقی لە جوولەکەکان سێندرایەوە (تۆفیق ئەلسویدی) کە بە پلەی سەرۆک وەزیران کاریدەکرد تاوانبار کرابوو و لە دانپێنانەکەیدا هاتووە و دەڵێ: (گەورەم من پێم خۆشە لەبەردەم دادگا سەبارەت بە لێسـەندنەوەی ڕەگەزنامەی جوولەکە ئاگادارتان بکەمەوە لە ڕاستیدا جوولەکەکان ژمارەیان نزیکەی (١٢٠) هەزار کەس دەبوو. نزیکەی (١٠٨) هەزاریان لە بەغدا بوون و دەسـتیان بەسـەر بازرگانی و ئابووری وڵاتدا گرتبوو هەروەها ڕێکخسـتنێکی تایبەتیان پێکهێنابوو پاشان پۆلیس حەشارگەیەکی چەک و تەقەمەنی ئاشکرا کرد وابزانم زۆر لە ئێوەش ئاگادار بوون لەبەر ئەوەی ئیسـڕائیل بووەتە گرفت لە کێشەکانی ناوەوەی وڵاتی عەرەبی بۆیە ناتوانرێت ڕێژەیەکی وا زۆر کە نزیکەی (١٠٨) هەزار جوولەکە دەبێـت بـە خێو بکرێت هەر لەبەر ئەوە بەشـانازییەوە کارم بۆ یاسـای لێسەندنەوەی ڕەگەزنامە کردووە و من پێم خۆش بوو خۆم ڕەگەزنامەکەیان لێبسەنمەوە بەڵام پێم گوتن کە دەتوانن ڕەگەزنامەکە ڕەت بکەنەوە. ئەگەر ڕەتیان کردەوە ئەوە یەک مانگ مافی مانەوەیان هەیە پاشان دەبێ بڕۆن و لەگەڵ خۆشیان تەنها (٢٥) دینار ببەن.

## کۆچکردنی جوولەکەی عیراق

پێــش ئەوەی لە چۆنیەتی گەشــەکردنی رەگی رەگەز پەرســتی لە کۆمەڵگەی عیراقدا بکۆلینەوە کە ببووە هۆی کۆچپێکردنی زیاتر لە (١٠٠) هەزار جوولەکەی عێراقی بۆ فەلەســتین ئەگەر بە شــێوەیەکی کورتیش بێت دەبێ لەسەر پەیدا بوونی بزووتنەوەی رەگەز پەرستی بزانین پاشان بۆ پەل هاویشتنی رەگەزپەرستی بۆ سەر عێراق بگەرێینەوە.

## رەگەز پەرستی چییە؟

دەســتەواژەی (رەگەزپەرســتی) بۆ یەکەم جار لە مێژوودا لەکتێبی (البعث الثقافی للشعب الیهودی فی ارضە موسیلە لحل المشکلە الیهودیە) دەرکەوتووە کە بیرمەندی ئەڵمانی رەگەزپەرســت (ناثان بید ناحوم) لە ســاڵی (١٨٩٣) بڵاویکردۆتەوە (بید ناحوم) پەیڤی رەگەزپەرســتی لە جیاتی نەتــەوەی جوولەکە بەکاری هێناوە کە کاتی خوی لە کتێبەکانی بیرمەندەکان و رەگەزپەرســتەکان باو بــوو، بانگەوازیان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی جوولەکە دەکرد.

لە ســەرەتای شەستەکان و لە سەدەی هەژدەهەمدا هەندێ بیرمەندە جوولەکەکان لە پێناوی گەرانەوەیان بۆ فەڵەستین و ئاوەدانکردنەوەی بۆ کارکردن گەرانەوە. لە پێش هەموویانەوە (حاخام هیدی کالیشر/١٧٩٥-١٨٧٤) بوو کەلەســاڵی ١٨٨٦ کتێبێکــی بەناوی (البحث عن صهیون) دەرکرد، بەرهەمی ماندووبوونەکەشــی یەکەم کۆمەڵەی رەگەزپەرستی لە ئەڵمانیا دامەزرا.

لە ســاڵی دووەم (موسا/ ١٨١٢-١٨٧٥) هەڵســا بە بڵاوکردنەوەی کتێبی (روما والقدس) کە بانگەواز بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی جوولەکە لە فەلەســتین دەکات، بەلام (دایفید کوردن/ ١٨٢٦-١٨٨٦) بایەخ پێدانی داگیرکردنی جوولەکە بۆ فەلەســتین دوپات دەکردەوە و هەروەها کار بۆ گۆرینی جوولەکە بۆ نەتەوەیەک وەکو نەتەوەکانی دیکە دەکات. وکتێبی (لیوبینکو/ ١٨٢١-١٨٩١) لە ســالی ١٨٨٢ دەرچووە، کە بەگشتی باری

جووله‌که‌ی چاره‌سه‌ر کردووه که به‌کورتی بانگه‌واز بۆ نیشتمانێکی نه‌ته‌وه‌یی جووله‌که له فه‌له‌ستین و ئه‌مه‌ریکا ده‌کات که به‌هێزترین نوسراوه‌کانی ره‌گه‌زپه‌رستیه و قوڵترین کاریگه‌ری هه‌بووه به‌لام ره‌گه‌زپه‌رست تا ساڵی (١٨٨١) مایه‌وه. ئه‌و کاته ژماره‌یه‌کی زۆر ئاماده‌بوون بۆ روسیا رۆیشتن و کۆمه‌ڵه‌ی ره‌گه‌زپه‌رستی ناوخۆیی به‌ناوی (حب صهیون) یان (احباب صهیون) یان دامه‌زراند، ئه‌و کۆمه‌لانه پرسی نیشته‌جێ بوونی جووله‌که‌یان له فه‌له‌ستین خسته‌روو له کۆمه‌ڵه‌کانی (حب صهیون) چه‌ند سه‌د گه‌نجێکی ره‌گه‌زپه‌رستی بزووتنه‌وه‌ی (البیلو) یان دامه‌زراند که بۆ مه‌به‌ستی نیشته‌جێبوون کاریان بۆ کۆچپێکردنی جووله‌که بۆ فه‌له‌ستین ده‌کرد، ئه‌وه‌بوو له‌سالی (١٨٨٢) یه‌که‌م پێشه‌نگی کۆچکردن که‌ده‌ستی پێکرد کۆمه‌لێک گه‌نج بوون ژماره‌یان له بیست جووله‌که زیاتر نه‌بوو بۆ فه‌له‌ستین کۆچیان کرد.

### بانگه‌وازی ره‌گه‌زپه‌رست

له‌سالی ١٨٨٢ له زانکۆی قوسته‌نتینیه یه‌که‌م بانگه‌وازی جووله‌که‌ی جیهان بلاوکرایه‌وه تا به‌ره‌و زه‌وی میعاد جووڵه بکه‌ن، پاشان ره‌گه‌زپه‌رست ئه‌و بانگه‌وازه‌ی به نموونه‌یه‌ک بۆ بانگهێشتی جووله‌که لێکدایه‌وه که تێدا هاتووه بانگهێشت بۆ ئه‌و جووله‌کانه‌ی که دوورخراوه‌ته‌وه (نفی) راپه‌رین بکه‌ن له دژی ئه‌و کۆیلایه‌تیه‌و شووره‌ییه‌ی که هه‌زار ساڵ به‌رده‌وام بوو، هه‌روه‌ها بۆ ده‌ستکه‌وتنی نیشته‌جێیه‌ک بۆ جووله‌که له‌سه‌ر خاکی فه‌له‌ستین و دانانی بنکه‌یه‌کی سه‌ره‌کی له شاری قودس وه‌رگرتن له ده‌سه‌لاتی عوسمانی به هه‌موو جۆره هۆکارێک و فریودانیان بۆ یه‌کسانی کێشه‌کان و ده‌ست که‌وتنی پالپشت و چاودێری کردنیان. له کۆمه‌ڵه‌کانی (حب صهیون) گه‌وره جووله‌که (البارون ادموند روتشلید-١٨٤٥-١٩٣٤) به‌رێوه‌ی ده‌برد بزووتنه‌وه‌ی ره‌گه‌زپه‌رستی به په‌رش و بلاوی مایه‌وه و نه‌توانرا خۆیان رێکبخه‌ن و پیلانێکی روون دابنین، تا ئه‌و کاته‌ی (ئیودور هرتزل) له (١٨٩٧/٨/٢٧) توانی یه‌که‌م کۆنگره‌ی ره‌گه‌زپه‌رستی له شاری (بازال) ی سویسری ببه‌ستێ.

(هرتزل) بیرو بۆ چوونەکانی خۆی ســەبارەت بە مەسەلەی جوولەکە پیشــانداو لە کتێبەکەی کە لەســالی ١٨٩٥ دەریکردووە بە ناونیشانی (الدوله الیهودیه) چارەســەرەکان شــیدەکاتەوە . (هرتزل) پێشنیاری دامەزراندنــی (کۆمەڵەی جوولەکەی) کرد بۆ رێکخســتن و کۆکردنەوەی جوولەکــەو هەروەها کۆمپانیایەکی جوولەکــە بەبێ ئاگایی ئەو کۆمپانیا گــەورە ئەوروپیانەی کــە لە ئاســیا و ئەفەریقا هەیە هەلدەســتی بە نیشتەجی بوونی داگیرکارەکان و قۆستنەوەی بەرو بوومی ولات و دەست بەسەرداگرتنی.

## یەکەمین کۆنگرەی رەگەزپەرستی

ســەرەرای کۆســپێکی زۆر (هرتــزل) توانــی یەکــەم کۆنگــرەی رەگەزپەرستی ببەســتێ بە ئامادەبوونی (٢٠٤) نوێنەر کە نوێنەرایەتی کۆمەڵەکانی رەگەزپەرستە بەربلاوەکانی هەموو لایەک دەکەن رێکخستنی ئەو کۆنگرەیە بۆ دیاریکردنی ئامانجەکانی بزووتنەوەی رەگەز پەرستییە کە بە بەرنامەیەکی کارامە نمایشکرا.

ئامانجەکانی رەگەزپەرستی لە یەکەمین کۆنگرەیدا دیاریدەکریت:

مەبەســتی رەگەزپەرست ئەوەیە کە نیشــتمانێک بۆ گەلی جوولەکە لە فەلەســتین دروست بکات و یاسای گشــتی لە خۆ بگرێت، هۆیەکانی هێنانەدی ئەو ئامانجەش ئەوانە بوون.

١- کار بۆ داگیرکردنی فەلەستین بکرێ بە یارمەتی کرێکارانی پیشەیی و کشتوکاڵی بە پێی دامەزراوێکی پیشەسازی.

٢- لەگەل ئەو یاسا جێگیرانەی لە هەموو ولاتدا هەیە، دەبێ جوولەکەی جیهانی رێک بخرێ و بە رێکخراوەکانی ناوخۆیی و دەولی ببەسترێتەوە.

٣- بــە هێزکردن و خۆراک پێدانی هەســت و هۆشــیاری نەتەوەی جوولەکە.

٤- بــۆ بەجێهێنانی ئامانجەکانی رەگەزپەرســتی و دەســتکەوتنی رەزامەندی حکومەت، پێویستە هەنگاوەکانی بەرایی بگریتەبەر.

له بەرنامە کارامەکەدا دەرکەوتووە کە رەگەزپەرستی بزووتنەوەیەکی توخمیە خاوەن سروشـــتێکی داگیرکەرە ئامانجی لە ریشـــە دەرهێنانی جوولەکـــەی جیهانـــە لـــەو کۆمەڵگایانـــەی تێیدا نیشـــتەجێن بە هۆی کۆچکردنێکی بـــەردەوام لە وڵاتێکی نەتەوەیی جوولەکە لە فەلەســـتین دروست دەکات.

ئەو پەیوەندییە توندەی لە نێوان داگیرکەرو رەگەز پەرســـتدا هەبووە ئامانجی رەگەزپەرست وای کردووە کە عەرەبەکانی فەلەستین بکێشێتەوە وڵاتێکـــی جوولەکەی بەهێز دامەزرێنی لە ژێر پارێزگاری وڵاتی داگیرکار، ئەو وڵاتەی کە زۆرتر لەگەڵ بزووتنەوەی رەگەزپەرستی هاوسۆزبووە وڵاتی بەریتانیا بووە، هەروەکو رەگەزپەرست لەلایەن گەورە سیاسەتمەدارەکانی داگیرکـــەر هاندراون، لەبەر زۆر بوونی کۆچکردنی جوولەکە لەروســـیا و پۆلۆنیا بۆ گەرەکە رۆژ هەڵاتیەکانی لەندەن بۆ ئەو مەبەســـتە حکومەتی بەریتانیـــا لە ســـالی ۱۹۰۲ لێژنەیەکی بۆ لێکۆلینـــەوە لە کۆچکردن بۆ ئینگلتـــرە پێکهێنا بە هاوکاری لەگەڵ (تشـــمبرلن) کە یەکێک بووە لە داگیرکارەکانـــی بەریتانیا و پشـــتگیری لە بزووتنەوەی رەگەزپەرســـتی کردووە، (هرتزل) توانی کە پرۆژەی ئاوەدانکردنەوە لە قوبرس و ئەسینا بخاتە بەردەمیان کە لە ژێر تاجی بەریتانی دایانبنێ تاکو لەوێ نیشتمانێک بۆ جوولەکە دا بمەزرێنی، بەڵام (کرومر) لەسەر پرۆژەی دیاریکراو رازی نەبووە (تشمبرلن) بابەتی نیشـــتەجێبونیان لە ئوگەندا خستە بەر دەم (هرتزل) ئەویش رەزامەندییەکی ســـەرەتایی نیشاندا لە ساڵی (۱۹۰۳) کاتیک کۆنگرەی سەهۆنیەت بەسترا رووبەرووی توندترین رەخنە بووە تا ئەو ئاســـتەی یەک لە ئەندامانی کۆنگرە (هرتزل)ی بەناپاک تاوانبارکرد بەهۆی دەســـت بەرداربوونی لە فەلەستین . لە ساڵی (۱۹۰٤) (هرتزل) کۆچـــی دوایی کرد و لـــە دوایی ئەو لە ســـاڵی (۱۹۰۵-۱۹۰۷) (دایڤید غوریون) ســـەرکردایەتی رێکخستنی کۆچکردنی دووەمی کرد کە چەندین جۆری دوورکراوەی بۆ فەلەســـتین تیدابوو بۆ ئەوەی کار بۆ دۆزینەوەی ئاوەدانییەکی بچووک بکەن سەرکردەی رەگەزپەرستی (وابزمان) هەوڵیدا

له وەزیری دەرەوەی بەریتانی (بلفور) نزیک ببیتەوە ئەوە بوو لە کانوونی یەکەمی ســـالی (١٩١٢) لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا چاوی پیکەوت (وابزمان) پێــی گوت کە کۆمەڵگەیەکمان دەوێ چـــوار تا پێنچ ملیۆن نیشتەجێی فەلەستین بگرێت، ئەو بریارانەی لە کۆنگرەی رەگەزپەرستی کە لە (براغ) بەسترا داوای کردنەوەی دەرگاکانی فەلەستین بەرامبەر بە کۆچە بی سنوورەکان دەکات و یارمەتیان دەدات تا سەهیۆنیەتی جیهانی خێــرا جموجۆل بکات تا هەوڵبدات هەر جوولەکەیەک لەهەر شـــوینێکی جیهان بێت بۆ فەلەستین کۆچ بکەن.

**ناپلیۆن و سەهیۆنیەت**

دوای ئەوەی لە سالی (١٧٩٨) ناپلیۆن لە هەڵمەتێکی دا بۆ سەر میسر هەوڵیدا کە بەســـەر مەمالیک دا سەربکەوێت و خۆی خزاندە فەلەستین و بـــەرەو دیوارە بەرزەکانی (عکا) رۆیشـــت، تا پەنای بۆ بانگهێشـــتی ســـەهیۆنیەت بردو لـــە (١٧٩٩/٧/٢٢) ئاگادارییەکی بلاوکردەوە داوای لە جوولەکە کرد کە بۆ گەرانەوەی قودس و دامەزراندنی میرنیشـــینێکی ئیســـرائیلی بەیەکەوە بجەنگێن تا رادەســـتی جوولەکەکان بکرێتەوە بە پێی ئەوەی ئەوان بۆ ماوەیی یاســـاییی ولاتی فەلەســـتینن، بەو شێوەیە ناپلیۆن یەکەم هەوڵی خۆی دا بۆ نێشـــتەجی بوونی جوولەکە لە وڵاتی فەلەستین.

لەســـالی (١٨٤٢) (کۆمەڵەی بەریتانی بیانی) لە لەندەن دامەزرا تا لەسەر گەڕانەوەی نەتەوەی جوولەکە بۆ فەلەستین کار بکات کە لە نیل بۆ فوراتەوە دریژ دەبێتەوە و بە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیاوە دەبەستریتەوە.

---


سەرچاوەکان

١- د. عەبدولوەهاب کیالی / تاریخ فلسطین الحدیث.

٢- عەبدولقادر یاسین / مجلة افاق عربیة (ژمارە -٣- سالی ١٩٧٧)

## خشتەیەک ناوی جوولەکەکانی دانیشتوی عیراق
## دیاری دەکات کە لە سالانی ١٩١٩-١٩٤٥ ئاوارەبوونە

| سالّ | ژمارەی ئاوارەکان |
|---|---|
| ١٩١٩ | — |
| ١٩٢٠ | — |
| ١٩٢١ | ٤٩ |
| ١٩٢٢ | ١٠٥ |
| ١٩٢٣ | ١٧ |
| ١٩٢٤ | ٧٧٦ |
| ١٩٢٥ | ٧٥٣ |
| ١٩٢٦ | ٧٧٧ |
| ١٩٢٧ | ٣١١ |
| ١٩٢٨ | — |
| ١٩٢٩ | — |
| ١٩٣٠ | — |
| ١٩٣١ | — |
| ١٩٣٢ | — |
| ١٩٣٣ | ١ |
| ١٩٣٤ | ١٢ |
| ١٩٣٥ | ٩٦ |
| ١٩٣٦ | ١٢ |
| ١٩٣٧ | ٢ |
| ١٩٣٨ | ١ |
| ١٩٣٩ | — |
| ١٩٤٠ | ٢ |
| ١٩٤١ | ١ |

| | |
|---|---|
| ١٩٤٢ | ٣٥١ |
| ١٩٤٣ | ١٦٩ |
| ١٩٤٤ | ١٠٠ |
| ١٩٤٥ | ٢ |

کۆی گشتی ٣٥٣٩

---

سەرچاوە

١- کۆچکردنی جوولەکە بۆ فەلەستینی داگیرکراو.

٢- ئەلیاس سەعد (بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی ئازادی فەلەستینی — لاپەرە/٣٩).

لە ١٩٤٨/٥/١٥ دروستبوونی سەهیۆنیەت ڕاگەیەندرا ئەو کاتە ژمارەی جوولەکەکان ٦٥٠ هەزار کەس بوون هەر لەو کاتەش ژمارەی دانیشـــتوانی عەرەبی فەلەستین لە یەک ملیۆن و سێ سەد کەس زیاتر بوون.

٣- هەمان سەرچاوە لا ٣٦-٣٧.

کۆچکردنی جوولەکە بۆ فەلەســتین ئەو کۆچەیە کە لە کۆتایی سەدەی ڕابردوو دەستی پــێ کردووە و تا ئێمڕۆش هەر بەردەوامـــە، جیاوازییەکی زۆر گەورە و جۆریی هەیە لە چاو کۆچکردنی ئەورووپا و ئاســیا لە هەر یەک لە (وڵاتـــە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و کەنەدا و ئوسترالیا).

هۆکارەکانی ئابووری و زانستی و ئایینی و تەکنەلۆژی بە گرنگترین پاڵنەری کۆچکردنەکانی ئاســیاو ئەورووپا هەژمارکراوە، و پاڵنەری سیاســی و ئایینی و بیرو باوەڕیش هۆکار بووە بۆ کۆچکردنی جوولەکە، ئیســرائیل وەک کۆمەڵگەیەکی جوولەکەو وەک دەوڵەتیکی سەهیۆنی لە بەجێهێنانی خواســتی ئەوانەی کۆچیان بۆ ئەوێ کردووە ســەرکەوتوو نەبووە، هەروەها نەیتوانی ژیانیکی باش و زیاتر ئاســایش و جێگیربوون و بە خشــین بۆ ئەوان و نموونەی ئەوان بەدەست بهێنێت.

لە سالی ١٩٤٨ کە دەولەتی ئیسرائیلی لە فەلەستین دامەزرا لێکدانەوەیەکی سەرکەوتنی بزووتنەوەی رەگەزپەرستی بوو وەک بزووتنەوەیەکی سیاسی کۆمەلایەتی، ئامانجی سەرەکی نیشتمانێکی نەتەوەیی بۆ جوولەکەکانی جیهان مسۆگەر بکات کە تێیدا نیشتەجی ببن لەو شوێنەی کە دەیانەوێ کە بە پەیوەندییەکی ئایینی و سۆزدارییەوە بەسترابێتەوە، بە هۆی بەشدار بوونی زۆربەی جوولەکەکانی جیهان لە گەشەپێدانی بزووتنەوەی رەگەزپەرستی و پالپشتی کردنیان جگە لەوەی ژمارەیەکی زۆریش هاتنە نێو ریزەکانیان.
هەلوێست و روانین و سیاسەتەکان بە شێکن لە کەسایەتی ئەو جوولەکانەی لە زۆربەی ناوچەکانی جیهاندا هەیە جیانابیتەوە ئەویش بە پێی چالاکیەکانی و سروشتی ئامانجەکانی بۆیە زۆربەی جوولەکەی جیهان سەیری ئیسرائیل دەکات بە تایبەتی ئەوانەی بە بیروڕای رەگەزپەرستیەوە پابەندن بەو پێیەی کە یەکەم نیشتمانە و بنکەی رۆشنایی ئایینی و رۆشنبیریانە، هۆکارەکانی ئایینی و کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووری هۆیەکە بۆ پێکهینانی پەیوەندی رەگەزپەرستی بە ئیسرائیل لەلایەک و لەلایەکی دیکەوە پەیوەندی ئیسرائیل بە جوولەکەی جیهانەوە، بەو شێوەیە بەرگری کردن لە ئیسرائیل و پالپشتی کردنیان جگە لە رەچاو کردنی پەیوەندییەکانی سیاسی و لایەنگیری نەتەوایەتی ئەوا هەمووی بەرپرسیاریەتی تەواوی جوولەکەی جیهانە، زۆربەی ئامارەکان ئاماژە بە کشانەوەی بەردەوامی کۆچکردنی جوولەکە لە سالی ١٩٧٣ لە فەلەستین دەدەن تاکو راگرتنی دوای سالی ١٩٨٢، ئەگەر کۆچکردن لە فەلەستین زۆربوو ئەوا مانای ناڕەزایی بوونی ئیسرائیلیەکانە بە ئیسرائیل وەکو کیانیکی رەگەزپەرستی سیاسی لایەنی (ئابووری و کۆمەلایەتی) سەیر دەکرێ، بەلام پاشەکشەپێکردنی جوولەکە بۆ فەلەستین گەشبینی جوولەکەی جیهان بە رێبازی بزووتنەوەی رەگەزپەرستی و خۆ ئامادەکردنیان و پالپشتی کردن و هاتنە نێو ریزیان پێچەوانە دەکات.

---

سەرچاوە /
١- الهجرة اليهودية في فلسطين المحتلة دوافعها وا تجاهاتها/ د. محمد عبدالعزيز الربيع...

لــە چەند لایەنێکی جیاوازی شــاری بەغدا پێنــج رووداوی تەقینەوە روویدا یەکەم تەقینەوە لــە ١٩٥٠/٤/٨ کە لە نزیک گازینۆی (البیضاء) ی شــەقامی ئەبو نەواس دەستی پێکرد ئەویش لە ئەنجامی بەکارهێنانی بۆمبێکی دەســتی بوو ئەو تەقینەوەیەی لە ١٩٥١/١/١٤ لە کەنیســەی (مســعود شــەمتوب) روویدا هەر بەهۆی بۆمبی دەســتی بوو، رووداوی تەقینەوەی ١٩٥١/٣/١٩ لە نووســینگەی پرسگەی ئەمریکی لە شەقامی رەشــید دوا بە دوای ئەوان هات، هەروەها ئەو رووداوەی کەلە دەرەوەی تەلاری کۆمپانیای لاوی لە ١٩٥١/٥/٦ روویدا ماددەیەکی تەقینەوەی تێدا بەکارهاتبوو، هەموو ئەو رووداوە تاوانکارییانە بە رووداوێک کۆتایی پێهات و لە ١٩٥١/٦/١٠ لە نزیک تەلاری (ستانلی شعشوع) لە شەقامی رەشید روویدا کە هەمان ماددەی تەقینەوەی پێشــووی تێدا بەکارهاتبوو، لەگەڵ تەقینەوەی یەکەمدا حکومەت هەموو هەوڵێکی خۆی خستەگەر بۆ زانینی تاوانباران و پۆلیســیش هەوڵەکانی خۆی دووئەوەنــدە کرد لە ئەنجامی لێکۆلینــەوە و پشــکنیندا تۆرێکی ســیخوریان لە بەغدا ئاشــکراکرد لە نێوانیاندا دووکەسی بیانی بوون کە هەردوکیان سەر دەستەی تۆرەکە بوون دەســتگیرکران و ئەوانەی تەقینەوەکەشیان ئەنجام دابوو لەوانە بوون کە دەستگیرکرابوون ئامانجیان لەوە تێکدانی ئارامی و شێواندنی راستیەکانی عیراق بەرامبەر بەرای گشــتی جیهان پیشانبدات، هەروەها لێکۆلینەوەکە ئاشــکرای کردوە کــە چەندەها جۆری جیاواز لە چــەک و تەقەمەنی لە ماڵی تاوانباران (یوســف و سەلیم) کە هەردووکیان کورەکانی (عەبدوللا خەبازە)ن شــاردراونەتەوە و ماڵەکەیان کەوتبــووە ناوچەی (البتاوین) لەگــەڵ ئەوانەی کەدۆزیانــەوە بەڵگە نامەیەک بە مێــژووی ١٩٥١/٥/٤ هەبووە کە ئاماژە بە بوونی حەشارگەیەکی چەک لە کەنیسی (عزرا داود) دەدات ئەویــش هەر لەگەرەکی (البتاوین) بووە، هەر لەهەمان شــوێندا چەند نەخشەیەکی سەربازی دۆزرایەوە هەوەها تۆمارێک بەناوی ئەندامانی رێکخراوە تیرۆرســتەکان دۆزرایەوە لەکاتی پشــکنینی کەنیسەی ناوبراو دەمانچەو رەشــاش و بۆمبی دەستی و ماددەی تەقینەوە و تفاق و چەند

نەخشەیەکی تێدا دۆزرایەوە و هەروەها لە کاتی لێکۆلینەوەکەدا دەرکەوت کــە گەنجینەیەکی چەک و تەقەمەنی لە هەردوو کەنیســەی (مەســعود شــەمتوب) و کەنیسەی (حاخام حســقی) کە لە گەرەکی (تەکیە) بوو دۆزرایەوە جگە لەوخانووەی کە لە گەرەکی (فرج الله) ژمارەکەی ١٤٤/٦٠ بوو، ئەو خانــووەش بۆ (حوکی یەعقوب نەســیم) دەگەرێتەوە یەکێکە لەوانــەی رەگەزنامەی عیراقیان لیســتاندۆتەوە، هەروەها لە کەنیســەی (حاخام حسقیل) حەشارگەیەک کە ئامێری چاپ و یەدەگەکانی و پەڕاو و بڵاوکراوە و نەخشەی تێدا شاردرابۆوە بە ئامادەبوونی دادوەری لێکۆلەری رەســافەی باکوور و بەریوەبەری پۆلیســی لیوای بەغدا و دەستەیەک لە کەســانی هۆزی ئیسرائیلی دەستیان بەســەرداگیرا و هەرچی تەقەمەنی و کەرەســتەی جەنگی هەبوو لە لیســتیک دا تۆماریــان کرد و لە کاتی هێنانە دەرەوەشیان لە حەشارگەکە وەکو بەڵگەیەک بە وێنەی فۆتۆگرافی وێنەیان گیرا، بەو شــێوەیە زۆربەی ئەوانەی پەیوەندییان بەرووداوەکان هەبووە دەستگیرکران و لێکۆلینەوەش بە وردی بۆ ئاشکرا کردنی حەشار گەکانی دیکە بەردەوام بوو...

پیویســت بە دوپات کردنــەوە ناکات کە حکومەت دەتوانێ دەســت بەسەر هەموو جموجولیەک دابگرێ و ئەوانەی سەقامگیری و ئارامی وڵات دەشێوێنن ئەوا توندترین سزایان پێدەگەیەنریت.

**و/بەرێوەبەری بانگەشەی گشتی**

## ئەوانەی بە چالاکییەکانی رەگەز پەرستی لە عیراق تاوانبارکراون

+ کێشەی تیرۆرستی سەهیۆنی.

١- شالوم سالح شالوم.

٢- یوسف ئیبراهیم بەسری.

لــە ١٩٥١/١١/٥ دووەم دادگای ســزای گەورە لــە بەغدا فەرمانی لە ســێدارەدانی بۆ دەرکردن لەســەر تاوانی یەکەم کە فرێدانی بۆمبێک بوو بۆ نووســینەگەی پرســگەی ئەمەریکی کە بووە هــۆی تێکدانی هەندی

له بەشـــەکانی و برینداربوونی چەند کەســێک و هەروەها لەسەر تاوانی دووەمیـــش فەرمانی لە ســێداره دانیان بۆ دەرچـــووە ئەویش بە دانانی ماددەی تەقینەوە لەبەردەم تەلاری کۆمپانیای لاوی کەلە شەقامی رەشید بوو لـــە ئەنجامی تەقینەوەکە بە شــێکی پێشــەوەی تەلارەکە تێکچوو هەروەها لەســـەر تاوانی سێهەمێش فەرمانی لە سیداره دانیان تاکو مردن بۆ درا بەدانانی ماددەی تەقینەوە لەلایەکی تەلاری (ســتانلی شعشـــوع) کە کەوتبوە شەقامی رەشید لە ئاکامی تەقینەوەکە بەشێک لە پێشەوەی تەلارەکـــە تێکدراو هەرســێ فەرمانی دادگایی بە پێــی برگەی یەکەم لە ماددەی (١٤) لە بەشی (١٢) بە پێی ماددەکانی (٥٣-٥٤-٥٥)لە یاسای سزاکانی بەغدا بەیەکەوە جێبەجێ دەکرێ.

ب/ کێشەی تایبەت بەرێکخراوە رەگەزپەرستەکان.

١- شالوم سالح شالوم.

٢- یوسف ابراهیم بەسری.

لە ١٩٥١/١٢/١٣ دووەم دادگای سزای گەورە لە بەغدا فەرمانی دادگایی دەرکرد بە زیندانی کردنیان بۆ ماوەی (١٥) ساڵ لەگەڵ کاری قورس و بە پێی برگەی دووەم لە ماددەی (١٤) لە بەشـــی (١٢) لە یاسای سزاکانی بەغدادی بۆ ماوەی پێنج ســـاڵ بە کاری قورس بە پێی رســـتەی (١) لە برگەی (٥) لە ماددەی یەکەم بە پێی برگەی یەکەم لە یاســـای سزاکانی بەغدادی ژمارە (٥١)ســـالی ١٩٣٨ تێکرا لەگەڵ فەرمانە سەپێنراوەکانی ســـەری لە داوایەکی نا پوختە بە ژمارە ٤٦٨-ج-٩٥١ بەیەکەوە جێبەجێ دەکرێ.

٣- یهوذا تاجر (ئیسماعیل سالحون) ئیش و کاری هەتا هەتایە.

٤- ئەلیاهو کرجی عابد/ فەرمانی بەندکردنی بە ئیش و کاری سەخت بۆ ماوەی (١٥) ســـال بە پێی برگەی دووەم لە ماددەی (١٤) لە یاسای سزاکانی بەغداد و ئیش و کار بۆ ماوەی (٥) ساڵ بە پێی رستەی (١) لە برگـــەی (٥) لە ماددەی یەکەم بە پێی بەڵگەی برگەی یەکەم لە ماددەی یەکەم پاشـــکۆی یاسای سزاکانی بەغدای ژمارە (٥١) سالی ١٩٣٨ تێکرا

به تێکهەڵکێش جێبەجێ دەکرێ.

٥- فوئاد ئیسحاق ناثان.

٦- فوئاد ئیسرائیل دلح.

٧- ئیسحاق یەعقوب سبتی.

٨- ئیبراهیم حسقیل.

٩- شائول حسقیل.

١٠- ئیبراهیم ساسون کرکوکلی.

١١- یەعقوب ساسون شعیا.

١٢- عزرا رحمین.

بە پێی رستەی (١) لە برگەی (٥) بە بەلگەی برگەی یەکەم لە ماددەی یەکەم لە یاسای پاشکۆی سزاکانی بە غدادی ژمارە (٥١) ساڵی ١٩٣٨ بۆ ماوەی (٥) ساڵ فەرمانی کاری سەختیان بۆ دەرچوو.

١٣- ئەسبرونس شەماس.

١٤- ئەلبەرتین روبین ئەلیاهو.

١٥- مادلین روبین لاوی.

بە پێی هەمان بریاری دادگای سەرەوە فەرمانی (٥) مانگ یان بۆ دەرچوو لە دوای تەواوکردنی ماوەی دادگایی لە بەندیخانە بریاری ئازادکردنیان بۆ درا ئەگەر لەسەر هیچ تاوانێکی دیکە بەند نەکرابن.

ج/ سیخوری کردن بۆ ئیسرائیل.

١-یەهوذا منشی تاجر (ئیسمایل سالحون)

٢- روبرت هنری رودنی.

٣- لەتیف فرایم.

٤- سەلیم موعەلم.

لە ١٩٥٢/١/٢١ دادگای دووەمی تاوانی گەورە لە بەغدا کۆبۆوە و فەرمانی دادگاییان بۆ دەرکردن کە بۆ ماوەی (٥) ساڵ لەگەڵ کاری قورس زیندانی بکرێن، بۆ تاوانباری یەکەم دادگایی کردنەکەی تێکهەڵکێش دەکرێ لەگەڵ دادگایی کردنەکانی پێشووی و بۆ ئەوانی دیکەش بە پێی

ماددەی چوارەم لە بەشــی دوانزەهەم لە یاســای سزاکانی بەغدادی لەو ماوەیــەی کە بەندکراون هەر لە ژێر لێکۆلینەوە دادەبن و بە پێی ماددەی (٣٢) لە ی.س.ب. هەریەک لە (یەهوزا منشــی و روبرت هنری و لەتیف فرایــم) کە بەندکراوی بیانی بوون دادگا بریاری دوورخســتنەوەی دان لە دوای کۆتایی هێنانی ماوەی دادگایی کردنیان.

١- یاسای ژمارە (٥) سالّی ١٩٥١.

بەرێوەبردن و چاودێری کردنی سامانی ئەو جوولەکانەی کە رەگەزنامەی عیراقیان لی سەنرا بۆوە.

ماددەی دووەم /

أ- ئەو کەســانەی رەگەزنامەیان لێ ســەندرابۆوە پــارەو پولەکانیان هەڵدەپەســێر درێت بە هیچ شــێوەیەک لە شــێوەکان نابێ هەڵسوکەوتی پێبکرێ . تەنها بە پێی ئەو یاساو بریارەی بۆی دەردەچێ.

ب- بەسەرۆکایەتی ئەمینداری گشتی فەرمانگەی ئەمینداریەتی گشتی دادەمەزرێ بۆ چاودێری و بەرێوەچوونی سامانی ئەو کەسانەی رەگەزنامەیان لێ سەندراوەتەوە بریارەکانیش لە ئەنجوومەنی وەزیرانەوە دەردەچێ.

مووچــەی فەرمانبەرانی ئەو فەرمانگەیــە و خەرجیەکانی بە پیێ ئەو یاســاو رێســایەی کەلە ژێر هەڵسوکەوتی ئەمینداری گشــتی دایە بەرێوە دەچێ.

٢- یاسای ژمارە (١٢) سالی ١٩٥١.

یاسای پاشکۆی یاسای چاودێری و بەرێوەچوونی سامانی ئەو جوولەکانەی کە رەگەزنامەی عیراقیان لێ ســەندراوەتەوە، ژمارە (٥) ســالێ ١٩٥١، و بەرەزامەنــدی ئەنجوومەنی پیران و نوێنــەران فەرمانی جێبەجێکردنی ئەو یاسایەمان پێدرا.

**ماددەی یەکەم:**

لە رۆژی یەکەمی سالّی ١٩٤٨ ئەو جوولەکانەی بە پاسپۆرت عێراقیان جێهێشــتووە سامانەکەیان هەڵدەپەسێردرێت، بەپێی یاسای ژمارەی (٥) سالّی ١٩٥١ ئەو یاسایەی بۆی دەردەچێ لەسەری دەچەسپێت.

**ماددەی دووەم:**

أ- هەمـــوو جوولەکەیەکی عێراقی ماددەی یەکـــەم دەیگرێتەوە دەبێ بـــۆ ماوەی دوو مانگ بگەڕێنەوە عێـــراق لە مێژووی بەیاننامەکەو بە پێی دەرچوونی برگەکانی خوارەوە.

ب- لەســـەر شـــاندە دبلۆماتەکان و قونســـڵییەی عێراقیە کە لەهەر وڵاتێکـــی بیانی دابێت یاخود ئەوانەی مافـــی عێراقیەکان بەڕێوە دەبەن، بە یاننامەیەک لە یەکـــێ لەرۆژنامەکانی پایتەختی ئەو وڵاتە بڵاوبکەنەوە و تێدا داوا لەو کەســـانەی کە برگەی یەکەم دەیانگرێتەوە لە ماوەی دوو مانگدا لەگەڵ مێژووی بڵاوکردنەوەدا بۆ عێراق بگەڕێنەوە.

ج- هەرکەســـێک فەرمانەکانی برگەی پێشووی لەسەر جێبەجێ بکرێ و لـــە کاتی دیاریکراویشـــدا نەگەڕێتەوە عێراق، وادیـــارە کە بەیەکجاری عێراقی جێهشـــتووە بە کۆتایی هاتنی مێژووی ماوەکە رەگەزنامەکەی لێ دەســـەندرێتەوە و کاری پێ ناکرێ و فەرمانی یاســـای ژمارە (٥) ساڵی ١٩٥١ لەگەڵ ئەو بریارەی بۆی دەردەچێ لە سەریدا جێبەجێ دەکرێ.

د- ئەگـــەر پێـــش کۆتایی هاتنی ماوەی دیاریکـــراو بگەڕێتەوە عێراق ئەوا سامانە هەڵپەسێردراوەکەی بۆ دەگەڕێتەوە لەگەڵ داشکانی خەرجی کارگێری ئەویش ئەمینداری گشـــتی بریاری لەسەر دەدات کە بۆ جێبەجێ کردنی یاسا خەرج کراوە.

**ماددەی سێیەم/**

أ- لە برگەی (ج) ماددەی دووەم دا باس لەوکەســـانە دەکات کە لـــەدەرەوەی عێراقن، بەڵام ئەگەر مانەوەکەیـــان بۆ یەکێک لەو دوو هۆیانەی خوارەوە بێت ئەوا لە ئەوانی دیکە جیادەکرێنەوە:-

١- ئەگەر بێتو نەخۆش بێت لە نەخۆشـــخانە یاخود لەگەڵ یەکێک لە ئەندامانی خێزانەکەی (تا پلەی ســـێ یـــەم) یش بێت لەگەڵی دا بێت لە نەخۆشـــخانە ئەوا دەتوانێت ســـەفەر بـــکات بە مەرجێک بە بەڵگەنامەی فەرمانگەی پزیشکی یەوە پشتگیری کرابێت.

٢- ئەگـــەر لە قۆناغەکانی خوێندن بێت و تەمەنی (٢٧) ســـاڵی

تەواو نەکردبێ، ئەویش دەبێت بە بروانامەی پزیشـــکی لە پەیمانگای خوێندن پشتگیری و پەسند کرابێت.

ب/ دەبـــێ لەگەڵ بروانامـــەکان بۆ هەردوو هۆیەکانی ســـەرەوە بەڵگەنامەی پەسەندکراوی لەگەڵدابێت لە لایەن شاندەکانی دبلۆماتی یان قونسڵییەکانی عێراقی یاخود ئەوانەی لە وڵاتە بیانییەکان چاودێری مافەکانـــی عێراقی دەکـــەن لەلایەن ئەندامێک یـــان فەرمانبەرێکەوە دەرچوبێت .

ج/ ئەگەر ئەو بیانووەی کە پشـــتی پێ بەســـتووە بۆ گەڕانەوەی کۆتایـــی پێ هات و لە ماوەی یەک مانگـــدا نەگەڕایەوە ئەوا وای بۆ لێکدەدرێتەوە کە عێراقی بە یەکجارەکی جێهێشتووە و ڕەگەزنامەکەی لێ دەستێنرێتەوە و بە فەرمانی یاسای ژمارە (٥) ساڵی ١٩٥١ و ئەو سیستەمەی بۆی دەردەچێ لەسەری جێبەجێ دەکرێ.

**ماددەی چوارەم/**

١- فەرمانی یاســـای بنچینەیی و سیســـتەمی دەرچوو یاخود بە گوێرەی ئەوەی دەردەچێ جێ بە جێ دەکرێ لەسەر هەر عێراقیەکی جوولەکە کە پێش ڕۆژی یەکەم لە ســـاڵی ١٩٤١ بە پاسپۆرت عێراقی جێهێشـــتووە ئەو فەرمانەی لەسەر جێبەجێ دەکرێ و سامانەکەشی لەو حاڵەتانەی خوارەوە هەڵدەپەسێردرێت.

أ- ئەگەر لەوڵاتێکی بێگانەدا لە شوێنی نیشتەجێبوونەکەی ڕاهاتبوو حکوومەتیش وا دەبینێت کە پێویست ناکات بۆ عێراق بگەڕێتەوە.

ب- ئەگەر ئەمینداری گشـــتی لەو بڕوایەدا بوو کە هەر کەســـێک لە پێـــش مێژووی دیاریکراو بنکەیەکـــی بازرگانی لە وڵاتێکی بێگانە دامەزراندبـــوو لقێکیشـــی لە عێراق بـــۆ ئاڵوگـــۆڕی بازرگانی هەبوو بـــەو شـــێوەیە حکوومەت وادەبینی کە پێویســـت نـــاکات بۆ عێراق بگەڕێتەوە.

ج- بەمەبەستی جێبەجێ کردنی ئەو ماددەیە فەرمانەکانی ماددەی دووەم لەو یاسایەدا چاودێری دەکرێ.

**ماددەی پێنجەم:**

أ- جوولەکـــەی عێراق ئەوەی لەدوای کۆتایی فەرمانی یاســـایی ژمارە (١) ساڵی ١٩٥٠ عێراقی جێهێشتووە یان ئەوەی دەیەوێ بڕوات و یاخود ئەوەی هەوڵ دەدات بە شـــێوەیەکی یاسایی دوای دەرچوونی ئەو یاسایە عێراق جێبهێڵێ ئەوا بە پێشـــنیاری وەزیر و بڕیاری ئەنجوومەنی وەزیران ڕەگەزنامەی عێراقی لێدەسێنرێتەوە.

ب- هەر جوولەکەیەک لە دوای دەرچوونی ئەو یاسایە بە پاسپۆرت عێراق جێبهێڵێ ئەگەر لەو ماوەیە کە لە پاســـپۆرتە کە دیاریکراوە نەگەڕێتەوە ئـــەوا ئەنجوومەنی وەزیران بە پێشـــنیاری وەزیر ڕەگەزنامەی عێراقی لێ دەســـێنرێتەوە و هەڵســـوکەوت بە پارەکەی دەکرێ بە پێی یاسای ژمارە (٥) ســـاڵی ١٩٥١ لەگەڵ ئەو سیستەمەی کە دەردەچێ و لەسەر وەزیرە کە ڕێنمایی بەمەبەستی جێبەجێکردنی ئەو ماددەیە دەربکات.

**ماددەی شەشەم:**

لەسەر وەزیری ناوەخۆ پێویستە کە فەرمانی دوورخستنەوەی هەریەک لە وانەی کە ڕەگەزنامەیان لێ ســـەندراوەتەوە دەربکات، ئەوانەشـــی کە مانەوەیـــان کاتیە لە عێراق و پێویســـتیان بە چەند کارێکی یاســـایی و دادگایی هەیە.

**ماددەی حەوتەم:**

١- بۆ سەلماندنی داواکردنی مافەکانیان لەسەر سامانەکەیان کە بڕیاری ژمارە (٥) ســـاڵی ١٩٥١ دەیانگرێتەوە بەڵگە پەســـند ناکرێت تەنها ئەگەر بێتوو بە نوسراوێکی باوەر پێکراو لەسەرچاوەیەکی فەرمی پێش دەرچوونی یاساکە نوسرا بێت و پشت بە دەفتەرەکانی بازرگانی بەسترا بێت و هەروەها مامەڵە کە پێشتر لە داد نوس تۆمارکرابێ و پەسەندیش کرابێت.

٢- بەڵگە پەســـەند ناکرێت بۆ سەلماندنی داوایەکەیان بە متمانەی ئەو کەســـانەی فەرمانی یاسای ئەسڵی و ئەو یاسایە دەیانگرێتەوە بە مەرجێک ئەگەر هاتوو لە پێش دەرچوونی یاســـاکە بە نوســـراوێکی ڕەســـمی باوەر پێکرابێت.

٣- بۆ سەلماندنی گرێبەستی کرێ لەسەر ئەو سامانەی کە یاسای ئەسڵی و ئەو یاسایە دەیانگرێتەوە و ماوەی ساڵێکیشی بەسەر تێپەڕیبێ ئەوا بەڵگە پەسەند ناکرێت تەنها ئەگەر لەسەر چاوەیەکی فەرمی یەوە پشتگیرییەکەی باوەر پێکرا بێت.

**ماددەی هەشتەم:**

ئەو دەستەواژەیە دەخرێتە سەر دوا ماددەی یەکەم لە یاسای ژمارە (٥) ساڵی ١٩٥١ کە تێیدا کەلوپەلی ناوماڵ و کەرەستەی ژیاندن و جلوبەرگی تایبەت جیادەکرێتەوە ئەگەر هاتوو پێویستیەکی زۆری لەسەر بوو ئەویش دەبێت ئەمینداری گشتی بریاری لەسەر بدات و دەشبێت ئەو شتومەکانە ئەو برە پارەیە کەمە هەڵاوێژ بکرێت.

**ماددەی نۆیەم:**

ئەو یاسایە لە مێژووی بڵاوکردنەوەی لەرۆژنامەی فەرمی جێبەجێ دەکرێ.

**ماددەی دەیەم:**

لەسەر وەزیرەکانی وڵات پێویستە ئەو یاسایە جێبەجی بکەن.

**لە ١٩٥١/٥/٢٢ لەبەغدا نووسراوە.**

**(نوری سەعید و عەبدولئیلاه)**

## یاسایی ژماره (١) ساڵی ١٩٥٠

یاسایی پاشکۆی فەرمانی لێسەندنەوەی رەگەزنامە ژمارە (٦٢) ساڵی ١٩٣٣ بە رەزامەندنی ئەنجوومەنی نوێنەران و پیران فەرمان لەسەر یاسای خوارەوە درا:

**ماددەی یەکەم:**

سەرۆک وەزیران بریار دەدات کە هەر جوولەکەیەکی عێراق ئەوەی دەیەوێ بە ئارەزووی خۆی بە یەکجاری عێراق جێبهێڵێ و رەگەزنامەکەی لێبسەندرێتەوە دەبێت لەبەر دەم ئەو فەرمانبەرەی کە وەزارەتی ناوخۆ دەستنیشانی کردووە واژووی خۆی لەسەر فۆرمێکی تایبەت بکات.

**ماددەی دووەم:**

بە بریاری سەرۆک وەزیران هەر جوولەکەیەکی عێراقی ئەوەی دەیەوێ عێراق جێبهێڵێ ئەوا رەگەزنامەکەی لێ دەسەنرێتەوە.

**ماددەی سێیەم:**

ئەو جوولەکە عێراقییەی کە پێشتر بە شێوەیەکی نایاسایی عێراقی جێهێشتووە ئەگەر لەماوەی دوومانگ پێش بریارەکە نەگەرێتەوە وای بۆ دادەنرێت کە بەیەکجاری عێراقی جێهێشتووە، ئەگەر کۆتایی بەماوە دیاریکراوەکە هات و نەگەرایەوە رەگەزنامەکەی لێدەسەندرێتەوە.

**ماددەی چوارەم:**

لەسەر وەزیری ناوخۆی پێویستە ئەوانەی کە رەگەزنامەی عێراقیان لێسەندراوەتەوە بە پێی هەردوو ماددەی یەکەم و دووەم فەرمانی دوورخستنەوەیان بۆ دەربکات بەڵام ئەگەر زانرا کەمانەوەیان لە عێراق کاتییە و کاری دادگایی و یاساییان هەیە بۆ کاتی دیاریکراو جێبەجێ دەکرێ.

**ماددەی پێنجەم:**

ئەو یاسایە بۆ ماوەی یەک ساڵ لە مێژووی دەرچوونیەوە وەک خۆی دەمێنێتەوە و دەشبێت هەر لەو ماوەیەدا ئەگەر دەسەڵاتدار بیەوێت ئەوا دەتوانێت کۆتایی بە فەرمانەکە دەهێنێت و لە رۆژنامەی فەرمی بڵاودەکرێتەوە.

**ماددەی شەشەم:**

ئـــەو ماددەیە لە مێژووی بڵاوبوونەوەی لـــە ڕۆژنامە فەرمییەکان جێ بەجێ دەکرێ.

**ماددەی حەوتەم:**

لەسەر وەزیری ناوخۆیە ئەو یاسایە جێبەجێ بکات.

لـــە ڕۆژی ١٩٥٠/٣/٤ لە بەغداد نوســـراوەتەوە بە واژووی هەریەک لە توفیق ئەلسویدی و عەبدولئیلاه.

**پاشکۆی ژمارە (٥)**

-یاسای هۆزی ئیسرائیلی ژمارە (٧٧) ساڵی ١٩٣١

-ئێمە موڵکی عێراقین.

بەرەزامەندی ئەنجوومەنی پیران و نوێنەران فەرمان لەسەر دانانی ئەو یاسایە درا.

**ماددەی یەکەم :**

هۆزە ئیســـرائیلیەکان لە عێراق لە چەند کۆمەڵەیەک پێکهاتبوون هەر کۆمەڵەیەکیش لەو ئیســـرائیلیانە پێکهاتووە کە نیشتەجێی ئەو ناوچەیە بـــوون بە گوێرەی ئەو یاســـایە جێبەجێ دەکرێ، ئەو کۆمەڵانەی کە بروا پێکـــرا بوون هەر ئەوان بوون کە لە بەغدا و بەســـرە و موســـڵ بنکەیان هەبوو، دەتوانرێ پێکهاتـــەی هۆزی دیکە زیاد بکرێ ناوچەکەش بە پێی یاســـا دیاری بکرێ، و هەر لەســـەر ئەو زیاد کردنەش ئەو ناوچانەی کە هەیە ڕێکدەخرێت.

**ماددەی دووەم:**

أ- بۆ هەریەک لە کۆمەڵەکانی بەغدا و بەســـرە و موسڵ سەرۆکێک و ســـەرۆک حاخامین و ئەنجوومەنی گشتی و ئەنجوومەنی (جسمانی) هەیە لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵانی بەغدا ئەنجوومەنی (روحانی) یشیان هەیە.

ب- کۆمەڵەکانی دیکەش سەرۆک و ئەنجوومەنی گشتی و ئەنجوومەنی (جسمانی) یان هەیە بەڵام سەرۆکی حاخامیان بۆ دەست نیشان ناکرێت

ئەگەر دادگایەکی ئایینی بۆ ئەو کۆمەڵانە پێکنە هێنرێت بە پێی ماددەی چواردەهەم لەو یاسایەدا.

**ماددەی سێیەم:**

................

**ماددەی چوارەم:**

بە ویستی دەسەڵاتدار دەستنیشـــانی سەرۆک دەکرێت و لادەبردرێت لەوانەیە لەگەڵ ئەو بارودۆخەی خوارەوە دا (اصدار) دەربچێ.

١- دەست لەکار کێشانەوەی خۆی بدات بەوەزیری داد.

٢- لەهەر دادگایەکی سزاداندا فەرمانی زیندانی کردنی دەردەچێ.

٣- بە هۆی ئەو تۆمەتانەی لە دژی دا پێی تاوانبار دەکرێ و لە پاش لێکۆلینەوەی یاســـایی لەگەڵی بە فەرمانی ئەنجومەنی گشـــتی لە کار لا دەبرێت.

**ماددەی پێنجەم:**

أ- لەکاتی زۆر پێویست سەرۆک ئەنجوومەنەکانی گشتی و (جسمانی) کۆدەبنەوە هەموو ئەرک و دەسەڵاتێک بەکاردێنن کە یاسا رێگەی پێداوە و دەبنـــە نوێنەری فەرمی هۆزەکە و ئـــەوەی پەیوەندی بە حکوومەتەوە هەیە پێداچوونەوەی بۆ دەکەن.

ب- ئەگەر بێتو لەبەر هەر هۆیەک لە هۆیەکان ئەنجوومەنی (جسمانی) بـــۆ راپەراندنی ئەرکەکانـــی داوای لێبوردنی کرد، ئـــەوا بە تەنها دەبێت ســـەرۆک ئەوەی کە بە گرنگـــی دەزانێ بۆ پارێـــزگاری کردنی کاروباری کۆمەڵـــەکان بگرێتە بەر بەمەرجێ لە کۆبوونەوەی داهاتوو بۆ ئەنجوومەن دیاری بکات بە هەموو ئەو کارانەی کە لەو رووەوە پێی هەڵساوە.

**ماددەی شەشەم:**

١- ئەنجوومەنی (جسمانی) لە سەرۆک و هەشت ئەندام لە کۆمەڵەکانی بەغدا پێک دێت و لە کۆمەڵەکانی دیکەش ســـەرۆکێک و چوار یان شەش ئەندام پێک دێت ئەوانە رێکخستنەکان دیاریدەکەن، ئەنجوومەنەکانی گشتی دوو لە ئەنجوومەنەکانی (جســـمانی) هەڵدەبژێـــرن ئەرکەکانی بۆ ماوەی

دووساڵە بەمەرجێ تەمەنی ئەندام بیست و پێنج ساڵی تەواوکردبێ.
٢- سەرۆکی ئەنجوومەنی (جسمانی) دەبێتە نوێنەر لە جیێ سەرۆکی هۆز ئەگەر نەیتوانی بە هۆی نەخۆشی یان هەر هۆیەکی دیکە بەکارەکانی هەڵبستێ.
٣- ئەگەر سەرۆک هۆز (جسمانی) بوو ئەوا سەرۆکایەتی (جسمانی) دەکات لەو حاڵەتەدا ســـەرۆک بۆ ئەو ئەنجوومەنە هەڵنابژێردرێ، بەڵکو ئەنجوومەنـــی (جەســـمانی) یەکێک لە ئەندامانی وەک جێگری ســـەرۆک هەڵدەبژێردرێ بۆ ئەوەی سەرۆکایەتی ئەنجوومەن بکات و لەکاتی پێویست بەکارەکانی سەرۆک هۆز هەڵبستێ.
٤- سەرۆکی حاخامین ئامادەی دانیشتنەکانی ئەنجوومەنی (جسمانی) دەبێت ئەگەر ئەنجوومەنی ناوبراو بانگهێشتی بکات و هەرزانیارییەکی لێ داوا بکرێ و پەیوەندی بە کاروباری هۆزەکەوە هەبێت دەبێ بە ئەنجوومەن رابگەیەنێت.

**ماددەی حەوتەم:**

ئەرکەکانی ئەنجوومەنی (جسمانی) ئەمانەن:
١- سەرپەرشتی کردن لەسەر بەرێوەبردنی ئەو کەلوپەلانەی کە جێیان هێشـــتووە یان دەســـتیان بەســـەر داگیراوە بۆ کاری خێرخوازی بەکاری دەهێننەوە.
٢- بەرێوەبردنی قوتابخانەکان و دامەزراوە خێرخوازییەکان.
٣- بەرێوەبردنـــی هەموو کاروبارێکی تایبەت بە داهات و دراو گۆری و لە نێوانیاندا کۆکردنەوەی رســـوماتی هۆزەکان و دەستکەوتەکانی و دانان و لابردنی فەرمانبەران.
٤- بەکارهێنانی هەموو دەســـەڵاتییەک کـــە ئەنجوومەن بەرێکوپێکی بەکاریدەهێنێت.

**ماددەی هەشتەم:**

ئەگەر ئەنجوومەنی (جســـمانی) بریاریدا کە یەک لەو کێشـــانەی پێی سپێردراوە لەو بابەتانەن کە دەبێ لەلایەن ئەنجوومەنی گشتی یەوە ئاشکرا

بکرێن ئەوکاتە دەبێ ســـەرۆکی هۆزەکە فەرمان بدات کە بۆ ئەنجوومەنی گشتی سپاردە بکات.

**ماددەی نۆیەم:**

١- کۆمەڵەکانی بەغدا سەرپەرشتی لەســـەر پەروەردەکردنی پیاوانی ئایینی و بنکەی ئایینیەکان و گشـــت کێشەکان دەکەن کە پەیوەستن بە بەرێوە چوونێکی باشـــی کاروبارەکانـــی کۆمەڵەکانی (روحانی) ئەوانیش پێک دێت لە سەرۆک حاخامین کە سەرۆکایەتی دەکات و حەفت ئەندامیش کە ئەنجوومەنی گشتی بۆ ماوەی چوار ساڵ هەڵیاندەبژێرێت.

٢- ســـەرۆکی حاخامین هەڵدەســـتێ بەو ئەرکانەی کـــە تایبەتن بەو کێشـــانەی کە پێشتر باســـکرا بە گوێرەی ئەوەی کە ئەنجوومەنی ئایینی دایدەنێ.

٣- جگـــە لـــە بەغدا لە نێـــو کۆمەڵەکانی دیکە ســـەرۆکی حاخامین دیاریدەکەن کە سەرپەرشتی لەسەر کاروباری ئایینی کۆمەڵە کە دەکات.

٤- لە ئەنجوومەنی ئایینی بەغدا سەرۆکی حاخامین مافی هەیە کە داوا لە سەرۆک هۆز بکات ئەو پرسە گرنگانەی لای ئەنجوومەنی گشتی یە بۆ تاوتوێکردن پێیان بسپێرێت.

٥- ئەنجوومەنی گشتی لە دوای ئەنجامدانی لێکۆلینەوە دەتوانێ سەرۆک حاخامین لە کار لابدات بە پێی ئەو سیستەمەی کە یاسا دەریدەکات.

ماددەی دەیەم:

١- ئەنجوومەنـــی گشـــتی لە کۆمەڵەی بەغدا لـــە ٦٠ کەس پێکدێت، حەوت کەسیان لە حاخامین دەبێت.

٢- ئەنجوومەنی گشـــتی لە کۆمەڵەکانی دیکە لە ٢٠-٤٠ کەس پێکدێت بە پێێ سیستەم دیاریدەکرێت.

٣- جگە لە حاخامین تەمەنی هەریەک لە ئەندامانی ئەنجوومەنی گشتی لە بەغدا نابێ لە ٢٥ ساڵ کەمتر بێت لەلایەن کۆمەڵەکەوە هەڵدەبژێردرێن و مافی هەڵبژاردن بە هەر کەســـێک دەدرێ کە تەمەنی ٢١ ســـاڵی تەواو کردبێ و ماوەی ئەندامییەتیش چوار ساڵ دەبێت.

٤- حاخامـــی کۆمەڵەی بەغدا حاخامییەکان بۆ ئەنجوومەنی گشـــتی هەڵدەبژێرن .

٥- هەمـــوو ئەندامانـــی ئەنجوومەنی (جســـمانی) و (روحانی) مافی ئامادەبوونـــی کۆبوونەکانی ئەنجوومەنی گشـــتیان هەیە و بەشـــداری لە یادەوەرییەکان دەکەن، بەڵام ئەوانەی کەلە ئەنجوومەنی گشـــتیدا ئەندام نین هیچ راو بۆ چوونێکیان نابێت.

٦- سەرۆک هۆز سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی گشتی دەکات.

**ماددەی یازدەهەم:**

ئەرکەکانی ئەنجوومەنی گشتی هەڵبژاردنی سەرۆکی حاخامییەکانە و لەگەڵ ئەو ئەنجوومەنانەی کە سەرپەرشـــتی لەسەر کارەکانی ئەنجوومەن و پەســـەندکردنی بودجەو رەزامەندنی لەســـەر ژمێریاری و تاوتوێی ئەو کێشـــانەی پێیان دەســـپێردرێت بە گوێرەی هەردوو ماددەی هەشتەم و نۆیەم و کارەکانی گشتی بە پێی سیستەم جێبەجێ دەکرێ.

**ماددەی دوازدەهەم:**

١- رێگە بە هیچ کەســـێک نادرێت کە بەشداری لە هەڵبژاردنی یەک لە ئەنجوومەنەکان بکات ئەگەر بێتو بەرەگەز عێراقی نەبێت.

٢- ئەگـــەر خوێندنەوەو نووســـین نەزانێت ئـــەوا نابێتە ئەندامی هیچ ئەنجوومەنێک .

٣- لە هیچ ئەنجوومەنێکدا نابێتە ســـەرۆک یان سەرۆک حاخامین یان ئەندام ئەگەر بە تاوانی ئابروو بردن یان هەر تاوانێک دادگایی کرابێت.

٤- جگە لەســـەرۆک هیـــچ کەســـێکی (کۆمەڵەی جســـمانی) مافی ئەندامێتـــی لە ئەنجوومەنـــەکان نییە ئەگەر بێتو مووچـــە لە گەنجینەی هۆزەکە وەربگرێ.

**ماددەی سێزدەهەم:**

١- هەر ئەندامێک دەست لە کارکێشانەوەی خۆی پێشکەش بە سەرۆکی ئەنجوومەنی کرد ئەوا لەکار لادەبرێت.

٢- ئـــەو ئەندامەی لە یەکێک لـــە ئەنجوومەنەکان تاوانبار دەکرێت بە

بریاری ئـــەو ئەنجوومەنە لە کار لادەبرێت دوای ئەوەی بە گوێرەی دەقی یاسا کە لە سیستەمەکەدا هاتووە لێکۆلینەوەی لەگەڵ دەگرێت.

٣- رێگـــە بەو کەســـە نادرێت کە بۆ کارێک یـــان ئەندامەتیەک خۆی هەڵدەبژێرێ ئەگەر بێتو پێشتریش ئەو ئەرکە یان ئەو ئەندامەتیە یان لە ئەنجوومەنەکە هەبووە.

٤- دەکـــرێ لە نێوان ئەندامانی ئەنجوومەنی گشـــتی یان لەدەرەوەیدا ئەندامێتی بۆ هەردوو ئەنجوومەنی (جسمانی) و (روحانی) هەڵبژێردرێ.

**ماددەی چواردەهەم:**

١- لە کۆمەڵەکانی بەغدا و بەســـرە و موســـڵ و کۆمەڵەکانی دیکەش دادگایەکی ئایینی پێکدەهێنرێت کە بە ویستی پادشایی دیاری دەکرێت و مافی راپەراندن و بینینی کێشەو سکاڵا و داواکاری هاوسەرگیری و مارەیی و تـــەلاق و جیابوونەوەو بژێوی خێزانی و باوەڕپێکردنی راســـپاردە هەیە جگە لەو پرسانە نەبێت کە پەیوەندییان بە بەرژەوەندی دەسەڵاتی دادگا ئایینیەکانی تایبەت بە ئەندامانی هۆزەکەوە هەیە هەموو ئەو پرســـانە بۆ کاروباری کەسێتی دەگەرێتەوە بە گوێرەی پێکهاتنی هەردوولا پێشکەش بە دادگا دەکرێت.

٢- بە پێی سیســـتەم هەمـــوو دادگا ئاینییەکانی ناوچەکە مافەکانیان جێبەجێ دەکرێ.

**ماددەی پازدەهەم:**

١- لـــە کۆمەڵەکانـــی بەغـــدا دادگایەکـــی ئایینی لە ســـێ ئەندامی ئەنجوومەنی ئایینی پێکدێـــت لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە ئەنجوومەنی ئایینی هەڵیاندەبژێرێت بە گوێرەی ئەوەی کە لە سیستەمەکەدا هاتووە.

٢- لە کۆمەڵەکانی دیکەدا دادگا لەسەرۆک حاخامین پێکدێت و زەمەنی حاخامیەکان هەڵیاندەبژێرن، ئەگەر حاخامینیش نەبێت ئەوکاتە سەرۆکی حاخامییەکان لە جیاتی ئەوان دووکەسی دیکەی ئاسایی دادەنێت.

٣- دەبێت چاوپێخشاندنەوەیەک بۆ بڕیارەکانی هەموو دادگا ئاینیەکان بکرێ ئەویش لەســـەر داوای لایەنی تایبەت کە بەرزی دەکاتەوە، دووبارە

کردنـــەوە کە لەلایـــەن دادگاوە بەڕێوە دەچێ کە ســـەرۆک حاخامین لە کۆمەڵـــەی بەغدا دەبێت و چوار ئەندامیش لـــە ئەنجوومەنی ئایینی پێک دێت بە مەرجێ پێشتر لە دادگا ئەندام نە بووبێت.

٤- ئەنجوومەنـــی ئایینـــی لە بەغدا بـــۆ بیمەی دادپـــەروەری مافی دامەزراندنی حاخامینی هەیە کە ببنە ئەندام و بخرێتە ســـەر ئەندامەکانی دیکە بۆ ئەوەی شوێنی ئەو ئەندامانە بگرنەوە کە ناتوانن لە دانیشتتنەکانی دادگای ئایینی ئامادە بن، بە مەرجێک ئەو ئەندامە زیادانە نابێت بەشداری لەو کارانەی کە پەیوەندییان بە کاروباری ئەنجوومەنەوە هەیە بکەن.

٥- جگە لـــە کۆمەڵەی بەغدا، لـــە کۆمەڵەکانی دیکـــە ئەنجوومەنی (جســـمانی) مافی ئەوەی هەیە کە حاخامێکی دیکە دیاری بکات و ببێتە نوێنەر لە جێی ســـەرۆک حاخامین لەو کاتەی کە ئامادەی دادگای ئایینی نابێت.

٦- دادوەر فەرمانبەرەکانـــی دادگا ئایینـــەکان هەروەکو فەرمانبەری گشتی هەژمار دەکرێن بۆ بە جێهێنانی ئەرکەکانیان لەو دادگایانەدا.

٧- ئەنجوومەنی (جسمانی) مافی دیاریکردنی پارێزەرێکی جوولەکەی هەیە کـــە پلەی پارێزەری هەبێ لە پێناو ئامادەبوون لە دانیشـــتنەکانی دادگاکانـــی ئایینی دا بۆ ڕێنمایـــی کردنی دادگا ســـەبارەت بەوکارانەی کە پەیوەســـتن بە یاســـای بەرگری و ماددە یاساییەکان بەڵام دەسەڵاتی دادوەری نابێـــت تەنها ئەگەر بێتو بە پێی برگەی دوو لەو ماددەیە وەکو ئەندام لەو دادگایە وەرگیرابێت.

**ماددەی شانزەهەم:**

دەبێ بۆ ئەو مەبەستانەی خوارەوە ڕێنمایی دەربچێ:

أ- بۆ دیاریکردنی یاسا (الاصول) لە هەڵبژاردنەکان و ئەوانەی خۆیان هەڵدەبژێرن.

ب- بـــۆ دیاریکردنی ڕێگەیەک بـــۆ کۆکردنـــەوەی ئەنجوومەنەکان و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کاروبارەکان.

ج- چۆنیەتی تاوانبارکردنی سەرۆک حاخامین و ئەندامانی ئەنجوومەنەکان

بە شێوەیەک لێکۆلینەوە لە دژیان جێبەجێ دەکرێت.

د- دەســـەڵاتی ئەنجوومەنی ڕێک کاری (ئینزبات) لەسەر ئەندامەکان دیاریدەکرێت.

ه- ئـــەو بارودۆخەی کە لە یەکێک لە ئەنجوومەنە هەمە جۆرەکان یان لەهەرکارێک دا ڕوو بدات بە پێێ ئەو یاسایە و چۆنیەتی دیاریکردنیان لە شوێنێکی بە تاڵ دیاریدەکرێت.

و- دەسەڵات و ئەرکەکانی ئەنجوومەنی فەرمانبەران دیاریدەکرێت.

ز- وا باشـــترە بە شێوەیەکی گشـــتی ئەو یاسایە جێ بەجێ بکرێ و کاروباری هۆزەکەش بەرێوە بچێ.

**ماددەی حەڤدەهەم:**

١- لەکاتـــی پەیدابوونـــی ناکۆکی لـــە نێو کۆمەڵێک لـــە کۆمەڵەکان بەرامبەر بە یەکێک لە فەرمانە یاساییەکان یاخود دەرحەق بە دەرچوونی هەر یاســـایەک، بێگومان ئەو ناکۆکیە بە شێوەیەک تەگەرە دەخاتە نێو کاروبـــاری دادگا ئاینیەکان و تـــەوای کاروبارەکانی هۆزەکان، بۆیە دەبێ وەزیری داد فەرمان بۆ ســـەرۆک دەربکات ســـەبارەت بـــەو کارانەی کە پەیوەندییان بە دەســـتوور هەیە پەیرەو بکرێ و دەبێت سەرۆکیش بە بێ هیچ کاریگەرییەک ئەو فەرمانانە جێبەجێ بکات.

٢- بە پێـــێ ئەو ماددەیە فەرمانەکانی وەزیـــری داد دەریدەکات جێ بەجـــێ دەکرێ، بەڵام لەگەڵ نەبوونی ســـەرۆک یـــان جێگرەکەی یاخود کەمتـــەر خەمی لە بەجێگەیاندنی فەرمانە دیاریکراوەکان ئەوکاتە وەزیری داد دەبێ بە شێوەیەکی کاتی جێگرێکی سەرۆک دابنێت.

٣- بە گوێرەی ئەو ماددەیە وەزیری داد بەر لەوەی دەســـەڵاتی خۆی بەکاربهێنێت پێویســـتە هەر ڕێو شوێنێک کە بە شیاوی دەزانێت بگرێتە بەر تا بتوانێ ئاواتی هۆزەکە بهێنێتە دی.

**ماددەی هەژدەهەم:**

بەپێێ ئەو یاسایە هەموو سیستەمێکی عوسمانی کە دەرهەق بە هۆزی ئیسرائیلی کراوە لەگەڵ هەندێ ڕاستکردنەوە هەڵدەوەشێنرێتەوە.

**ماددەی نۆزدەهەم:**

١- ئەو یاسـایە لەدوای سێ مانگ لە مێژووی بڵاوکردنەوەی لەرۆژنامە رەسمییەکان بەسەر دەچێت.

٢- لەگەڵ جێبەجی کردنی ئەو یاسایە دەست بەجێ هەڵبژاردنی نوێ ئەنجـام دەدرێ و دامـەزراوە هەمەجۆرەکان لە مێـژووی جیبەجێکردنی ئەو یاسـایە لە کارەکانی بـەردەوام دەبێت تا ئەنجامـی هەڵبژاردنەکە دەردەچێ.

٣- لەگەڵ بڵاوکردنەوەی ئەو یاسـایە فەرمانی هۆزەکانی ژمارە (٢٤) ساڵی ١٩٣٠ هەڵدەوەشێتەوە.

**ماددەی بیستەم:**

لەسەر وەزیری دادە ئەو بریارە جێبەجێ بکات.

لە رۆژی ١٩٣١/٥/٢٦ لە بەغدا نوسراوەتەوە.

## بەیاننامەی وەزارەتی ناوخۆ

بەگوێـــرەی دەرچوونی یاســـای چاودێری و بەرێوەبردنی ســـامانی جوولەکە ئەوانەی بە پێی ژمارە (٥) ساڵی ١٩٥١ رەگەزنامەی عیراقییان لێســـتاندراوەتەوە کە لە رۆژنامـــەی (وەقائیعی) عێراقی ژمارە ٢٩٢٨ بە مێژووی ١٩٥١/٣/١٠ بڵاوکراوەتەوە کەباس لە هەڵپەســـاردنی ســـامانی ئـــەو جوولەکانەی کە رەگەزنامەی عێراقییان لێ ســـەندراوەتەوە دەکات و رێگەیان پێنادرێت هەڵســـوکەوتی پێبکەن، بە پێی دەرچوونی یاســـای ژمارە (٣) ســـالێ ١٩٥١ کە لـــە وەقائیعی عێراقی بـــە ژمارە ٢٩٣٩ بە مێـــژووی ١٩٥١/٣/١٠ بڵاوکراوەتەوە کە بەهەر شـــێوەیەک بێت رێگە بە پەیرەو یاســـاش نادرێت کە هەڵســـوکەوت بە ســـامانی ئەو جوولەکانەی رەگەزنامەیان لێ ســـەندراوەتەوە بکەن بۆیە ئاگاداری هەموو بانکەکان و دراو گـــۆرەکان و فەرمانگەی تاپۆی داد و فەرمانبەر و کەســـایەتییەکان دەکەمەوە کە پابەندی هەردوو فەرمانەکانی یاســـاو سیستەم بن، جگە لە هەردوو ماددەی دووەم و شەشـــەم لە یاساو ماددەی پێنجەم لە پەیرەوی دیاریکراو کە فەرمان دەدا بە هەڵپەساردنی سامانی ئەوانەی رەگەزنامەی عێراقیان نەماوە و رێگایان لێ دەگیرێت هیچ سەودا گەریەکی پێوە بکەن جا چ بە شێوەیەکی راستەوخۆ یا ناراستەوخۆ بێت لە مێژووی بڵاوبوونەی یاســـاو پەیرەو کە لە وەقائیعی عێراقیدا بڵاوکراوەتەوە، هەروەها ئاورێک لە برگەی (١) کەلە ماددەی پێنجەم لە یاسای جێ بەجێ کراو دەدەمەوە باس لە ســـزای زیندانی کردن کەلە دووســـاڵ زیاتر نابێت یان بە بژاردنی چوار هەزار دینار یاخود هەردوکیان لەســـەر هەرسەر پێچیەک کە لەلایەن دراو گۆرو ژمێریار و خاوەن پەیوەندارەکان و فەرمانبەران و ئەو کەسانەی سەرپێچی ئەو یاسایە دەکەن دەسەپێنرێت.

**وەزیری ناوەخۆ**

**١٩٥١/٣/١٠**

**بەغدا**

## دەقی ڕاپۆرتی لیژنەی لێکۆڵینەوە
## (حکومەتی عێراقی)

(لێژنەی لێکۆڵینەوە لەسـەر ڕووداوەکانـی ڕۆژانی (١-٢)حوزەیرانی ١٩٤١) بە پێێ بڕیـاری ئەنجوومەنی وەزیران کە لە (١٩٤١/٦/٧) ژمارە (٣٢٨٨) دەرچـووە، لێژنەیەک بە سـەرۆکایەتی (مەحەمەد توفیق) و ئەندامانی هەریەک لە نوێنەرانی وەزارەتی ناوخۆ (عەبدوڵڵا قەسـاب) و نوێنەری وەزارەتی دارایی (سەعدی ساڵح) دوانزە کۆبوونەوەیان بەست بۆ لێکۆڵینەوە لەسـەر ئەو ڕووداوانەی کە لە ڕۆژی (١-٢) حوزەیرانی ساڵی ١٩٤١ ڕوویدا لەبەر دەرکەوتنی ئـەو ئەنجامە بڕیاری ئەوانەی خوارەوەی درا:

### پوختەی کەیسکە:

لە ڕۆژی ١٩٤١/٦/١ هەواڵی هاتنی خاوەن شکۆ بڵاوکرایەوە خەڵکیش بۆ پێشـوازی کردنی بەپەلەبوون، هەندێ لە جوولەکەکان بە خۆشـحاڵی و دڵخۆشـیەوە بە بۆنـەی هاتنی جەژنی پێغەمبەر (یشـوع) و نەمانی کێشـەی پێکدادانـی چەکداران هاتنـە دەرەوە، کاتێ گەیشـتنە پردی (ئەلخەر) بەرێکەوت چاویان بە هەندێ سوپا کەوت بەو شێوەیە ئەوانیان بینی ڕقیان لێ هەسـتاو پارێزگاریان لێ نەکردن و دەسـتیان بە لێدان و مسـتەکۆڵە کـردو بە چەقۆ لێیان دان، هەندێکیـان توانیان ڕابکەن و ئەوانـەی نەیانتوانی برینداربوون، ئەوەی لەو ڕووداوە بەشـداری تێداکرد هەندێ خەڵک بوون، ئەو دەسـتدرێژی کردنە بۆ سـەر پۆلیس و پیاوانی ڕێککاری (ئینزبات) سەربازی بوو، پاشان پۆلیس بریندارەکانی کۆکردەوە و بۆ بنکەی (کەرخ)ی بردن، ژمارەی بریندارەکان ١٦ کەس و یەک کوژراو بوو نێردرانە نەخۆشـخانە، خەڵکی لەبەردەم نەخۆشـخانە کۆبوونەوە و بـۆ ئەوەی هێرش بکەنە سـەر نەخۆشـخانەکەو کارمەندو پەرسـتیارە جوولەکەکان بکـوژن، بەڕێوەبەری نەخۆشـخانە (جەمیل دەلالی) هاتە دەرەوە و تکای لێکردن کە بڵاوەی پێبکەن و داوایان لێکرد کە ئافرەت و پیاوە جوولەکەکان بدرێنە دەستیان ئەویش، وەڵامی دانەوە کە ئافرەتەکان

خزمەتێکـــی مرۆڤایەتی دەکەن، داوایان کرد بـــا بەتەنها پیاوەکان بن بە تایبەتی جوولەکە (حسقیل)ی برین پێچ بەلێنی پێدان کە باشە وادەکات و رۆیشـــتە ژوورەوە و پۆلیســـی ئاگادارکردەوە و دەســـتەیەک هێز هاتن و بـــڵاوەی بە خەڵکەکە کرد چەند کەســـێکیش دەســـتگیرکران ئەو کاتە لێکۆلینەوە دژی سەربازەکان و خەڵکەکە نەدەکرا، هەروەها دەستدرێژیی یەکـــی دیکە لە (رەســـافە) روویدا هەر لەوێ تەرمی کوژراوێک لەســـەر شۆســـتەی شەقامی غازی لە نزیک ســـینەما دانرابوو پۆلیسی لێ ئاگادار کرایەوە و جێگیرەکەی هات و بینی کە تەرمی جوولەکەیەکە و بکوژەکەش نەناســـراو بوو هەر لەوکاتەشـــدا بریندارێکی جوولەکەی دیکە هات پێش ئەوەی هیچ زانیاریەک دەربارەی ئەو بکوژە بە پۆلیس بڵێت کەوتە ســـەر زەوی و گیانی لەدەستدا، پۆلیس زانیاریان بە دەست گەیشت کەلەگەرەکی (ئەبی ســـەیفەین) چەنـــد کوژراوێک هەیە و رۆیشـــتن و کوژراوەکان کە ژمارەیان هەشـــت بوو کۆیانکردنەوە ئەنجامـــدەری ئەو کردارە دەرکەوت کە هەندێ ســـەرباز بە هاوکاری خەڵکی روویداوە هەر بۆیە کۆبوونەوەی جەماوەری لە شەقامی مەلیک غازی پەیدا بوو هەرچەند پۆلیس دەیویست بڵاوەیان پێبکات بەڵام نەیتوانی، پاشـــان ئۆتومبیلـــی چەکداری هات و دەســـتیان کرد بـــە تەقەی هەوایی خەڵکەکەش ناچـــار بوون بڵاوەی پێ بکەن لەوە دەترســـان تەقەیان بەربکەوێ، بەڵام کە زانیان بۆ ئەوان نییە گەرانەوە بەرەو ماڵە جوولەکەکان چوون و شاڵاویان بۆ بردن و کوشتن و لەناوبردن دەستی پێکرد، پۆلیس کە دەهاتە ئەو گەرەکانەی کە رووداویان لێ هەبوو خەڵکی بە چەپڵە رێزان و بە قوربان پێشـــوازیان لێ دەکردن گوایە لە کوشتن و دزین یارمەتیان دەدەن ئەویش لەبەر ئەوەی راستەوخۆ تەقەیان لە خەڵکەکە نەدەکرد ئەو شـــەوە بە تەواوی کوشـــتن و تالانی لەبەر چاوی پۆلیس بەرێوە دەچوو، لەگەڵ ئەوەشـــدا بەشێک لە پۆلیس و مفەوەزەکان لە کوشـــتن و برین و تالانی بەشـــداربیوون، دەسەڵاتداری بەغدا لەگەڵ بەرێوەبەری پۆلیســـی بەغدا بەیەکەوە لە شەقامی (الامین) دەگەران بەرێکەوت هەندێ سەربازیان بینی کەبەرەشاش تەقەیان لەماڵە

جوولەکـــەکان دەکرد ئەویـــش فەرمانی بە پۆلیســـەکاندا کە تەقە بکەن ئەوانیـــش بۆ هـــەوا تەقەیان کرد، بەڵام هەندێ لەســـەربازەکان تەقەیان لەدەســـەڵاتدارو بەڕێوەبەری پۆلیس کرد لە پشت دیوارێکەوە بوون ئەگەر ئەو دیوارە نەبوایە گولەیان بەر دەکەوت، کاتژمێر شەشـــی بەیانی ڕۆژی (٢)ی حوزەیرانی ســـاڵی ١٩٤١ هەندێ لە ســـەرباز دەستیان بە دزین و تاڵان و کوشـــتن کرد لە شەقامی (الامین) ئوتومبیلێکی سوپایی دەبینرا کە کەلوپەلی ناوماڵی هەندێ ماڵە جوولەکەی دەگواســـتەوە (عەلی خالد الحجازی) پرســـیاری لێکردن کە ئـــەو کەلوپەلانە بۆ کۆی دەبەن گوتیان پێشتر لێرە بارەگایەکی فرۆکەوانی هەبوو ئێستا گواستراوەتەوە ئەوانەش کەلوپەلی ئـــەو بارەگایە یە دەگوازینەوە کە چی لە ڕاســـتیدا کەلوپەلی ماڵەکان بوون، بـــۆ لای ئوتومبیلێکی دیکەش چوو ئەهلی بوو بەڵام زۆر بەخێرایـــی بۆی دەرچوو ئەویش کەلوپەلی هەمان خانووی هەڵگرتبوو، لە هەمان کاتدا بینی کە پۆلیس تەقە بەرەو هەوا دەکات و لەهەر کەســـێکی دەپرسی دەیان گوت دەسەڵاتدارو بەڕێوەبەری پۆلیس فەرمانیان داوە کە تەقە لە خەڵکی نەکرێت ئەویش بەجێی هێشـــتن و بەرەو بارەگای گشتی پۆلیس گەڕایەوە، لە هەمان کاتدا ئوتومبیلێکی لۆری کە تایبەت بە سوپا بوو هاتە گەرەکی (الســـنک) کە هیچ ژمارەیەکی پێـــوە نەبوو لە ناویدا ئەفســـەرێک بە پلەی مولازمی یەکەم و لەگەڵ چوار سەربازی چەکدار کە ئامێرێکی ئاســـنی گەورەیان پێ بوو کە بۆ برین و پارچەکردن بەکاردێت (الهیمات)یـــان پێ دەگوت، لەبەر دەم بارەگای قوتابخانەی پیشەســـازی ڕاوەســـتان و قوتابیانی قوتابخانەی ناوبراویش لێیان کۆبوونەوە پاشـــان هێرشیان بۆسەر گەرەکە جوولەکەکان برد و دەرگای تۆ خانوویان شکاند و هەرچی کەلوپەل و شـــتومەکی تێدابوو بە تاڵیان کردو جێیان هێشـــت کە تاڵانی بکرێت و توانیان خۆیان لە دەستی پۆلیس ڕزگار بکەن و ڕایان کرد، دوای ئەوەی پۆلیس قوتابخانەی پیشەســـازی یەکەی کۆنترۆل کردو ژوورەکانـــی گەڕا پارەیەکـــی زۆری دزراوی دۆزیەوە کە پارەکە هی کچی (ئیبراهیـــم حەییم)ی جێگیری بەغدا بوو کە هەر لە گەرەکی (الســـنک)

نیشتەجێ بوو، هەندێ لە پۆلیسەکان داوایان لەماڵە جوولەکەکان دەکرد پارەیان بدەنێ بۆ ئەوەی پارێزگاریـــان بکەن ئەوانیش هەرچیان هەبووە دەیاندا بە پۆلیســـەکان بەوەش رانەوەســـتان بەڵکو هەندێکیان یارمەتی خەڵکەکەیان دەدا بۆ دزین و تاڵانی و هاوکاریان دەکردن هەروەها هەندێ لە قوتابیانـــی قوتابخانەی دواناوەندی ســـەربازیش لـــە گەڵیان هاوکار بوون..

دوای ئـــەوەی (عەلـــی خالد ئەلحەجازی) هەندێ ســـەربازی بینی کە ئوتومبێلەکانیـــان بە کەلوپەلی تاڵانی پردەکـــەن و توانای نەبوو رێگریان لێبـــکات ناچار بەرەو بارەگای گشـــتی پۆلیس رۆیشـــت و نارەزایی خۆی دەربـــڕی و بارودۆخەکەی بۆ بەڕێوەبـــەری پۆلیس و ئەمینداری پایتەخت و دەســـەڵاتداری بەغدا روونکردەوە کە هەندێ لە ســـەربازەکان دەستیان بە دزین و کوشـــتن و تاڵانی کردووە، هەر لەوێ عەقید (حەمید رەئفەت) فەرماندەی تیپی یەکەم ئامادەبوو باوەڕی بە قســـەکانی (عەلی) نەکرد و گوتی یەک ســـەرباز لە بەغدا نییە گوتی تەنها پۆلیسە ئەو کارانە دەکات (عەلی) یـــش داوای لێکرد کە بەیەکەوە بچن بۆ گەڕەکەکە لە شـــەقامی (الامیـــن) بینیان کە ئوتومبێلـــەکان کەلوپەلەکانـــی باردەکەن و هەندێ لەســـەربازەکانیش لە ماڵە جوولەکەکان دەهاتنەدەر تاڵانیان لەسەر شان بوو. (حەمید رەئفەت)یش ئۆتومبێلەکەی راگرت و فەرمانی بەسەربازەکان دا شـــتومەکەکان فڕێ بدەن و لـــە یەکێکیانیش دا کاتێ دەســـەڵاتداری بەغدا ئـــەو بارودۆخەی بینی داوای لێکرد بۆ هێور بوونەوەی بارودۆخەکە ســـەربازەکان بۆ بـــارەگای تیپ بباتەوە، (عەلی) یان لەوێ بەجێهێشـــت دوای ئـــەوەی جەماوەرەکە لە تاڵانی کردن تەواو بوون دیســـان روویان لە شـــەقامەکان کردو دەستیان بە شـــکانی دوکانەکان کرد هەرچی تێدابوو بردیـــان، (عەلی) یـــش گەڕایەوە بۆ بارەگای گشـــتی پۆلیس و داوای لە بەڕێوەبەری پۆلیس کرد کە فەرمانی پێبدات راســـتەوخۆ تەقە لە خەڵکە کـــە بکرێت ئەگەر نـــا ئاژاوەگێڕی هەموو وڵات دەگرێتـــەوە، ئەویش پێی گوت لەبەر ئەوەی تەقەیەکی زۆرمان بۆ هەوا کرد ئێســـتا هیچ تفاقێکمان

پێ نەماوە ـجێگیری بەڕێوەبەری گشتی ناوخۆ (مستەفا قەرەداغی) لەوێ ئامادە بوو داوای لە بەڕێوەبەری گشـــتی پۆلیس کرد کە ڕاستەوخۆ تەقە لە خەڵکی بکرێت، وەڵامی دایەوە کە فەرمانی پێنەدراوە ڕاســـتەوخۆ تەقە لە هاوڵاتیان بکرێت، (مســـتەفا قەرەداغـــی) وەڵامی دایەوە و گوتی ئەمە هیچ پێویســـت بە دەرکردنی فەرمان ناکات بەڕێوەبەری گشـــتی گوتی کە (حەمیـــد ڕەئفەت) ڕێگا نادات تەقە بکرێـــت، داوای لە فەرمانڕەواش کرد فەرمانی تەقەکردن بدات ئەوانیش ڕەتیان کردەوە، گوتی فەرمانی کوشتنی هیچ کەســـێک نادەین، لەو کاتە ئەمینداری پایتەخت بە تەلەفۆن داوای لە خاوەن ڕاســـپێردراوی گەورە کرد (الوصی المعظم) کە فەرمانی تەقەکردن بدات (عەلی خالید) دوو ئوتومبیلی چەکداری بە ڕەشـــاش بردو ڕۆیشـــت دەستی بە تەقەکردن بۆسەر خەڵکەکە کردو هەرچیەکی تاڵانیان کردبوو بە دوای خۆیاندا لەسەر شەقام جێیان هێشت و ڕایان کرد، فەرمانڕەوای بەغدا لە بنکەی پۆلیس ئامادەبوو بە نووســـراوێک فەرمانی تەقەکردنی لەلایەن ڕاســـپێردراوی گەورە هێنابوو دایە دەســـتیان ئەوانیش بە دوو ئوتومبیلی پڕچەک بۆ هەمان مەبەســـت ڕۆیشـــتن لە ماوەی کاتژمێرێکدا شەقامەکان چۆڵ کران و دەســـتەیەک لە ســـوپای ئەســـپ ســـواری و هێزێکی پیادە هاتنە ناو شەقامەکان بۆ هێورکردنەوەی دۆخەکە دەستیان بە کۆکردنەوەی کەلوپەلـــە دزراوەکان کردو هەندێ کەسیشـــیان دەســـتگیرکرد کە پارەی دزراویـــان هەڵگرتبوو بەرەو بنکەی پۆلیســـیان بردن لە ڕۆژی ســـێیەم و چوارەم لە ژێر کۆنترۆڵی سوپادا مایەوە، لەگەڵ ئەوەش هەندێ لە سوپاو ئەفسەرەکان تاڵانیان کرد، لە ١٩٤١/٦/٢ لە (کەرخ) ئەو ڕۆژەش لەلایەن هەندێ ســـوپاو خەڵکانی نەفس نزم چوار ماڵ و سێزدە دوکان یان تاڵان کرد، لە (الاعظمیە)ش هەندێ ســـەرباز هێرشیان کردە سەر چەند ماڵێک و دەرگاکانیان شـــکاند و هەر چییەکی تێدابوو تاڵانیان کرد دوای ئەوەی هەواڵی دزین و تاڵانی بەغدایان پێ گەیشـــت هەندێ لە خەڵکی هەرچی و پەرچیش هاوکاریـــان دەکردن زیاتر لە دە ماڵیان تاڵان کرد بەڵام پۆلیس هیچی بۆ نەکرا و لە وێش کوشتن و بریندار بوون ڕوویندا.

هەروەهــا لە ١٩٤١/٦/١ لە گەرەكی كــەڕادەی ڕۆژهەڵات لەو ڕۆژەدا هیچ شــتێک ڕوونەدا، بــەڵام لە ڕۆژی ١٩٤١/٦/٢ لــە كاتژمێر (٩/٥) بەیانی هێزی ســوپا دەستیان بە كوشتن و بریندارکردن و تاڵانی و دزین کرد و شــەش کەســی جوولەکەیان بریندارکرد لەگەڵ کوشتنی کەسێکی موسڵمان کە پاسەوانی ماڵە جوولەکەیەکی دەکرد، دوو لە دەست درێژان کوژران و چوار کەسیشــیان ئاشکرابوون ئەوانیش — (حسون بن مجيد) ژمارە (١٦٧ لە لەشکری (٣) پۆلی (الاسناد) و (ڕەئیس عورەفا) (عبد محمد الضاحي) لە هەمان یەکەی ســەربازی پێشوو تر بوو، پاسەوانێکی شــەمەندەفەریش بەناوی (مصطاف) و سەربازێکی دیکەش لە فرۆکەوانی کە ناســنامەکەی دیار نەبوو، (عبد محمد)یش دەســتگیرکرا نێردرایەوە بۆ یەکەکەی خۆی لە ســەربازگەی جەلەولا هەندێ لە ئەفسەر و سەرباز ماڵەکانیان تاڵان کرد و ئوتومبیلێکی بارهەڵگریان هێنابوو هەرچی کەلوپەل و شتومەکی نێو ئەو شەست و یەک ماڵەو سێ دوکانە هەبوو باریان کرد و جگە لەوانیش خەڵکێکی زۆریش بەشداری لەو تاڵانیە کردبوو، بەڵام دواتر ئەو بەشــە زۆرەی لەلای خەڵکەکەوە بوو گەڕاندرایەوە بەڵام ئەوەی لای سەرباز و ئەفسەرەکان بوو هیچ نەگێردرایەوە چەندان لەوانەی بەشداریان لــە تاڵانی و دزین کردبوو دەســتگیرکران و بردرانە ئەنجوومەنی دادگای ســەربازی هەر یەکەو بە فەرمانێک دادگایی کــران، بەڵام لە ناوچەکانی (العلويه و البتاوين) هیچ شتێک ڕوونەدا.

لــە ڕاپۆرتی دادوەری لێکۆڵەر هاتووە کــە هەموو کوژراوەکان (١١٠) کەســن لە نێوانیاندا (٢٨) یان ئافرەتی موســڵمان و جوولەکە بوون کە ناسنامەی بەشێکی زۆریان نەناسراو بوو، بریندارەکانیش (٢٠٤)کەس بووە ئەوانیش هەر جوولەکە و موســڵمان بوونە، بەڵام سەرۆک هۆز دەڵێ کە کوژراو بریندارەکان لــەوە زیاترن و ڕێژەی ماڵە تاڵانکراوەکانیش لەلایەن پۆلیســەوە ئامار نەکراوە لیژنەیەکە داوای لە بنکە پۆلیسییەکان کردووە کە ڕوونکردنەوەیەک لەســەر ژمارەی ئــەو خانووە و دوکانانەی کە تاڵان کراون ئامار بکات بەڵام وەڵامیان نەدرابۆوە پاشــان دەرکەوت کە پۆلیس

**خشتەی ژمارە (٢٧)**

**لاستیک (هاوردە)**

١- داود حسقيل مراد

٢- منشى حكيم

٣- مير حسقيل مراد

ژمارە/ ٤ جوولەکە/ ٣

**خشتەی ژمارە (٢٨)**

**(هاوردە) کڵاو و شەپقە**

| ناو | ناونیشان |
|---|---|
| ١- مارسيل خضوري | شەقامی (الكيلانی) |
| ٢- فكتور يهودا منشى | شەقامی (التجار) |

ژمارە/ ٢ جوولەکە/ ٢

**خشتەی ژمارە (٢٩)**

**تەباخ و سۆبە (هاوردە)**

١- عزرا مير حكاك

٢- منشى حكيم

٣- مير حسقيل مراد

ژمارە/ ١١ جوولەکە/ ٣

## خشتەی ژمارە (٣٠)

## (بورغی) پێچە کانزایەکان (هاوردە)

١- صالح اليشاع ساسون

٢- بامين موشى شاشا

٣- يوسف موشى ومير طويق

ژمارە/ ٩  جوولەکە/ ٣

## خشتەی ژمارە (٣١)

| ناو | ناونیشان |
| --- | --- |
| ١- اسحق صالح | باب المعظم |
| ٢- سودائى | شەقامی (الامام الاعظم) |
| ٣- صيون شعشوع | الباب المعظم |

ژمارە/ ٧  جوولەکە/ ٣

## خشتەی ژمارە (٣٢)

## سندوقە ئاسنەکان (قاسە)

١- عزرا مير حكاك و اولادە

٢- مير نسيم حكاك

ژمارە/ ٤  جوولەکە/ ٢

## خشتەی ژمارە (٣٣)

## مەکینەی دوورمان (هاوردە)

١- عزرا مير حكاك واولادە

٢- موشى حايک

٣- نسيم مير حكاك

ژمارە/ ٧  جوولەکە/ ٣

## خشتەی ژمارە (٣٤)
## ئوتوی جلوبەرگ

١- مراد يعقوب
٢- موشى اسحق

ژمارە/ ١٨ جوولەکە/ ٢

## خشتەی ژمارە (٣٥)
## کارپێکردن بەکەلوپەلی بۆیەکردنی ماڵەکان

١- اسرائيل حسقيل
٢- حسقيل شوع
٣- سليم داود معلم
٤- نسيم وشلومو يحين
٥- موشى حسقيل

ژمارە/ ٦ جوولەکە/ ٦

## خشتەی ژمارە (٣٦)
## خوری (هاوردەو بازرگانی)

١- عبودی و سلمان عزرا يوسف
٢- ابراهيم يوسف زلخه
٣- سليم شماس
٤- شاؤول مير منشى شعشوع
٥- بامين منشى شاشا
٦- يهودا يعقوب تونو

ژمارە/ ١٨ جوولەکە/ ٦

## خشتەی ژمارە (٣٧)
## كێک و ئەستەلە- (هاوردە)

| ناو | ناونیشان |
| --- | --- |
| ١- ابراهیم حییم | بەغدا شەقامی (الصفافیر) |
| ٢- مخزن دنكور | بەغدا شەقامی (المستنصر) |
| ٣- شلومو منشی | بەغدا شەقامی (السمؤال) |
| ٤- منشی الیاس سوفیر | بەغدا شەقامی (المستنصر) |
| ٥- یوسف رابینو | بەغدا شەقامی (السموّال) |

ژمارە/ ١٠ جوولەكە/ ٦

## خشتەی ژمارە (٣٨)
## هاوردەكردنی پێڵاو بەهەموو جۆرێكییەوە

| ناو | ناونیشان |
| --- | --- |
| ١- ابراهیم منشی حلاوی | شەقامی (السرای) |
| ٢- افرابح شمعون موشی | شەقامی (الرشید) |
| ٣- دانیال شمعون موشی | شەقامی (الرشید) |
| ٤- صیون شمعون | شەقامی (الرشید) |
| ٥- فكتور شاؤول | شەقامی (المستنصریە) |
| ٦- میر حسقیل مراد | شەقامی (الكرک) |

ژمارە/ ١٥ جوولەكە/ ٦

## خشتەی ژمارە (٣٩)
## پەڕاوگە (هاوردە)

١- الیاهو عزرا دنکور
٢- عبودی عزرا منشی
٣- لینتال وعبودی سوفیر
٤- یوسف شاؤول جوری
ژمارە/ ٧ جوولەکە/ ٤

## خشتەی ژمارە (٤٠)
## خێزان

| ناو | ناونیشان |
|---|---|
| ١- ابراهیم حبیم | شەقامی (الصفافیر) بەغدا |
| ٢- عزرا میر حکاک | شەقامی (الرشید) بەغدا |
| ٣- منشی حکیم | شەقامی (السموال) بەغدا |
| ٤- میر حسقیل مراد | شەقامی (الشورجە) بەغدا |
| ٥- میر نسیم حکاک | شەقامی (الرشید) بەغدا |
| ٦- عزرا یعقوب سلامە | شەقامی (المصبغە) بەغدا |

ژمارە/ ١٥ جوولەکە/ ٦

## خشتەی ژمارە
## (٤١)
## هاوردەی پایسکل

| ناو | ناونیشان |
|---|---|
| ١- اسحق بنانی اخوان | بەغدا |
| ٢- عزیز میر حکاک | بەغدا |
| ٣- موشی حایک | بەغدا |
| ٤- میر حسقیل مراد | بەغدا |
| ٥- یوسف رابینو | بەغدا |

ژمارە/ ٨   جوولەکە/ ٦

## خشتەی ژمارە (٤٢)
## شوشە (هاوردە)

١- ساسون مراد
٢- صالح شینە مصری وشرکاءە
٣- میر حسقیل مراد
٤- میر نسیم حکاک
٥- نسیم عقیرت

ژمارە/ ٧   جوولەکە/ ٥

## خشتەی ژمارە (٤٣)
## پیشەسازی پێڵاو

| ناو | ناونیشان |
|---|---|
| ١- باروخ الياهو | شەقامی (الرشید) بەغدا |
| ٢- یعقوب حسقیل جوبله | شەقامی (الرشید) بەغدا |
| ٣- اسحق شاؤول | شەقامی (النجفی) موسڵ |

جوولەکە/ ٣٦ ژمارە/ ٣

**تێبینی:** تەنانەت لە پیشەســازی پێڵاویشــدا رێژەیان کەمە ئەوەش بەڵگەیە کە مەیلیان بۆ لایەنی پیشەسازی نییە.

## خشتەی ژمارە (٤٤)
## پیشەسازی (پێڵاو)

| ناو | ناونیشان |
|---|---|
| ١- منشی حکیم | شەقامی (السمؤال) بەغدا |
| ٢- میر حسقیل مراد | شەقامی (الشورجە) بەغدا |

ژمارە / ٢ جوولەکە/ ٢

**تێبینیــی:** لێرەدا زۆر بەروونی جیاوازییەکــە لە بازرگانیدا دیارە تەنها بە هاوردەکردنی بۆیاغی پێــڵاوەوە خۆیان خەریک کردووە بەپێچەوانەی پیشەسازی پێکردنی.

## خشتەی ژمارە (٤٥)
## شخارتە (هاوردە)

١- ابراهيم حسقيل اسحق
٢- خضوري ابراهيم شكرجى
٣- مير حسقيل مراد
٤- منشى نصرالله
ژمارە/ ٧ جوولەکە/ ٤

## خشتەی ژمارە (٤٦)
## مۆری کانزا (کاوچوک)

| ناو | ناونیشان |
| --- | --- |
| ١- بيرس اخوان | شەقامی (الرشيد) بەغدا |
| ٢- خضوري شينا | شەقامی (الرشيد) بەغدا |
| ٣- داود بيرص | شەقامی (السمؤال) بەغدا |
| ٤- يوسف عبدالله كباى | شەقامی (الرشيد) بەغدا |

ژمارە/ ٤ جوولەکە/ ٤

## خشتەی ژمارە -٤٧-
## خشتی سوورەکراوە (هاوردە)

١- عزرا صيوت يعقوب و شركاءه
٢- ناجى مير ابراهيم
ژمارە/٤ جولەکە/ ٤

**تێبینی:** لـــە خانەی هاوردەکردنـــی کەلوپەلی بیناســـازی چالاکیان دەرکەوتووە

**خشتەی ژمارە (٤٨)**

١- ابراهیم ساطون
٢- الیاهو خزام
٣- شلامو منش
٤- کرجی صالح دلال
٥- مخزن دنکور
٦- یعقوب یوسف عانی
ژمارە/ ١٦ جوولەکە/ ٦

**خشتەی ژمارە (٤٩)**
**خۆراکی مندالآن (هاوردە)**

١- دانیال شمعون موشی
٢- کرجی صیدلیە
٣- لاوی مذخر ادویە
ژمارە/ ٦ جوولەکە/ ٦

**خشتەی ژمارە (٥٠)**

١- حییم توفیق
٢- شوع حسقیل زبیدە
٣- لینتال وعبودی سوفیر
٤- میر ابراهیم
ژمارە/ ٤ جوولەکە/ ٦

## خشتەی ژمارە (٥١)
## چاوپلکە (هاوردە)

١- افرایم طویق
٢- ابراهیم صالح
٣- میرداود سوفیر
ژمارە/ ٦ جوولەکە/ ٣

## خشتەی ژمارە (٥٢)
## کەوڵفرۆش (هاوردە)

١- سلیم شمالی
٢- صالح ساسون محلب
٣- صیون شمعون
٤- یوسف موشی و میر طویق
ژمارە / ٧ جوولەکە/ ٤

## خشتەی ژمارە (٥٣)
## گلێنەی چینی (فەخفوری)

١- داود سلمان معلم
٢- روبین حسقیل هلالی
٣- ساسون عزرا موشی
٤- سلیم عزرا موشی
٥- کرجی عزرا موشی
ژمارە/ ٥ جوولەکە/ ٥

## خشتەی ژمارە (٥٤)
## کارگەکانی دارتاشی

| ناو | ناونیشان |
| --- | --- |
| ١- عزرا یعقوب سلامە وشرکاءە | دوکانی (الکاعد) بەغدا |
| ٢- منشی الیاهو حایک | شەقامی (الرشید) بەغدا |
| ٣- سلمان درویش | تحت تەکیە- بەغدا |
| ٤- منیر بفریخە | شەقامی (المستنصر) بەغدا |
| ٥- الیاهو یعقوب منتال | عشار- بەسرە |

ژمارە/ ٥١ جوولەکە/ ٥

## خشتەی ژمارە (٥٦)
## بەتانی (پێخەف) هاوردە

| ناو | ناونیشان |
| --- | --- |
| ١- الیاهو معلم حسقیل | دوکانی (کرجی) بەغدا |
| ٢- ساسون عزرا خزام | شەقامی (الرواق) بەغدا |
| ٣- عزرا میر سودائی | شەقامی (الرشید) بەغدا |
| ٤- منشی حکیم | شەقامی (الرشید) بەغدا |

ژمارە/ ٧ جوولەکە/ ٤

## خشتەی ژمارە (٥٧)
## برنج (بازرگانی و دەرکردە)

١- سلمان ناتان

ژمارە/٦ جوولەکە/٦

تێبینی: لەو خشتەیە دیارە چالاکی بازرگانی جوولەکە لەبواری دەرکردنی کەلوپەلی بازرگانی کە بەرهەم هێنانی ناوخۆییە ناردنیان بۆ دەرەوەی عێراق زۆر سنووردارە، نهێنی ئەوەش نەبوونی ئارەزووی جوولەکەیە لە ناسینی کەلوپەل و بەرهەمهێنانی عێراقی بوو بەجیهانەوە لەبەر کەمی و لە ترسی پاڵپشت بوونی ئابووری عێراقە.

## خشتەی ژمارە (٥٨)
## پێستەی خۆشکراو (هاوردە)

| ناو | ناونیشان |
| --- | --- |
| ١- اسحق بنانی واخوه | شەقامی (الرشید) بەغدا |
| ٢- الیاهو مراد | دوکانی (الجبن) بەغدا |
| ٣- خضوري و عزرا میرلاوی | شەقامی (الرشید) بەغدا |
| ٤- شمعون یعقوب شکری | دوکانی (الباشا الکبیر) بەغدا |
| ٥- عزرا میر حکاک واولادە | شەقامی (الرشید) بەغدا |
| ٦- کرجی عقیدی | دوکانی (الجبن) بەغدا |
| ٧- منشی حکیم | شەقامی (السمؤال) بەغدا |
| ٨- هارون حسقیل زکای | شەقامی (السرای) بەغدا |
| ٩- لینتال وعبودی سوفیر | شەقامی (الرواق) بەغدا |
| ١٠- موشی داود مزالە | دوکانی (الجبن) بەغدا |

ژمارە/ ١٢ جوولەکە/ ١١

## خشتەی ژمارە (٥٩)
## کارگەکانی (سەهۆڵ)

| ناو | ناونیشان |
| --- | --- |
| ١- سالم شمعون وشرکاءه | (السنک) بەغدا |

ژمارە/ ١٥ جوولەکە/ ١

**تێبینی/** لە میانەی ئامادەکردنـــی ئەو لێکۆڵینەوەیە دەرکەوتووە کە جوولەکەکان مەیلی چالاکییەکانی پیشەســازییان نییە لەوانەیە لە ترسی ئەوەی لەگەڵ کرێکارەکان تووشی گرفت ببن. لە بنەڕەتدا (سالم شمعون) بازرگانی کەرەســتەی تەندروستییە بەشــداری بوونیشی لە دامەزراندنی کارگــەی پیشەســازی بەفر هەر خــۆی بەتەنیا نەبــووە، بەڵکو لەگەڵ هاوبەشەکانی بووە لەوانەیە جوولەکە نەبوون.

## خشتەی ژمارە (٦٠)

| ناو | ناونیشان |
| --- | --- |
| ١- موشی شاؤول | هەولێر |
| ٢- الیاهو یعقوب فنال | بەسرە |
| ٣- حسقیل سوفیر | بەسرە |
| ٤- خضوري الیاهو عابی | بەسرە |
| ٥- داود حسقیل جوری | بەسرە |
| ٦- سلمان الیاهو زلخە | بەسرە |
| ٧- دانیال شمعون موشی | بەغدا |
| ٨- داود یعقوب سوفیر | بەغدا |
| ٩- صیون عزرا زلخە | بەغدا |
| ١٠- صالح نسیم مصری | بەغدا |

ژمارە/ ٩٤ جوولەکە/ ٧٦

## خشتەی ژمارە (٦١)
## هاوردەی بۆیاغ کردنی قوماش

| ناو | ناونیشان |
| --- | --- |
| ١- ابراهيم مصليح | شەقامی شوريجە |
| ٢- افرايم سلمان طويق | شەقامی (الرواق) |
| ٣- سلمان حيم رجوان | شەقامی (الرواق) |
| ٤- شاول بادور | شەقامی (الصفافير) |
| ٥- منشي يعقوب | شەقامی (شوريجە) |
| ٦- مير نسيم حكاك | شەقامی (الرشيد) |

ژمارە/ ١٠ جوولەکە/ ٦

## خشتەی ژمارە (٦٢)
## کوتاڵفرۆشەکانی ناو بازاڕی بەسرە

| ناو | ناونیشان |
| --- | --- |
| ١- ابراهيم حسقيل | بازاڕی کوتاڵفرۆشان / بەسرە |
| ٢- ابراهيم خليل | بازاڕی کوتاڵفرۆشان / بەسرە |
| ٣- ابراهيم كرجي | بازاڕی کوتاڵفرۆشان / بەسرە |
| ٤- الياهو روفائيل | بازاڕی کوتاڵفرۆشان / بەسرە |
| ٥- خضوري الياهو شماس | بازاڕی کوتاڵفرۆشان / بەسرە |
| ٦- نسيم عزرا نسيم | بازاڕی کوتاڵفرۆشان / بەسرە |
| ٧- نعيم صيون يافه | بازاڕی کوتاڵفرۆشان / بەسرە |
| ٨- سلان عزرا | بازاڕی کوتاڵفرۆشان / بەسرە |
| ٩- عبود ساسون | بازاڕی کوتاڵفرۆشان / بەسرە |
| ١٠- ساسون رحمين | بازاڕی کوتاڵفرۆشان / بەسرە |

| ژمارە | جوولەکە |
| --- | --- |
| ٧٧ | ٣٢ |

## خشتەی ژمارە (٦٣)
## سەوزە فرۆشی شاری بەغدا

| ناو | ناونیشان |
|---|---|
| ١- روحام عزرا | شەقامی (الرشید) بەغدا |
| ٢- عزرا یعقوب | شەقامی (الرشید) بەغدا |

**تێبینی:** چۆن دەتوانرێ ئەو رێژەیە شیبکرێتەوەو جوولەکەکان بۆ کێ کەلوپەلیان دەنارد؟

## خشتەی ژمارە (٦٤)
## بەرگدوورەکان

| ناو | ناونیشان |
|---|---|
| ١- ابراهیم شوعە | شەقامی (الرشید) |
| ٢- اسحق حسقیل کوهین | شەقامی رەشید |
| ٣- حسقیل مراد شنطوب | شەقامی رەشید |
| ٤- خضوري سلمان | شەقامی رەشید |
| ٥- خضوري یعقوب | شەقامی رەشید |
| ٦- موشی حسقیل | شەقامی رەشید |
| ٧- الیاهو بامین | شەقامی رەشید |
| ٨- حسقیل شالوم | شەقامی ابن غزوان- بەسرە |
| ٩- خضوري مراد طویق | شەقامی البزازین- بەسرە |
| ١٠- کرجی حسقیل | شەقامی (الصیادلە) بەسرە |

ژمارە/ ٤٨ جوولەکە/ ٣٢

**تێبینی:** ڕێژەیەکـــی ئاوا زۆر لە بەرگدووْرەکانـــی جوولەکە لە عێراق ئـــەوە دەگەیەنێت کە زۆربەی ئەوانـــەی قوماش دەهێنن لە جوولەکەکانن و تێبینـــی ئەوەیش کراوە کە جوولەکەی بەرگـــدروو قوماش لە بازرگانە جوولەکەکان بەمەرج و بەنرخێکی مام ناوەندی دەکڕن پاشان بەکەمترین نرخ جلوبەرگ دەدورن ئەویش وەکو کێبرکێیەک لەگەڵ ئەوانی دیکە بۆیە دەبینین زێتر ڕەزامەندی لەسەرە..

**خشتەی ژمارە (٦٥)**

**خورما (دەرکردە)**

| ناو | ناونیشان |
|---|---|
| ١- افرايم حسقيل افرايم | شەقامی ڕەشید |
| ٢- الياهو كوهين | شەقامی ڕەشید |
| ٣- حسقيل عزرا الياهو | شەقامی ڕەشید |
| ٤- خضوري الياهو العاني | شەقامی ڕەشید |
| ٥- كرجى صيوم سوفير | شەقامی ڕەشید |
| ٦- نسيم روبين شوعه | شەقامی ڕەشید |
| ٧- شاؤل مير شعشوع | شەقامی (ابن غزوان) بەسرە |
| ٨- بامين موشى شاشا | شەقاسی (الخچيری) بەسرە |
| ٩- عزرا باری | شەقامی (البزازين) بەسرە |
| ١٠- هارون منشى صدفه | شەقامی (الصيادله) بەسرە |

ژمارە/ ١١٨ جوولەکە/ ٢٥

**تێبینی:** بەوردی سەیری ئەو ڕێژە کەمەی لە بواری دەرکردەی خورمای عێراقی بکە.

## خشتەی ژمارە (٦٦)
## قوماش فرۆش

١- ابراهیم عبادە
٢- ابراهیم بامین مصری
٣- اصلان سوفیر
٤- اسحق شعشوع
٥- اسحق عاصی
٦- الیاهو زبلی
٧- الیاهو معلم حسقیل
٨- حسقیل صوم بلبول
٩- حسقیل عزرا حداد
١٠- حسقیل میر الیاهو

ژمارە/ ٦٧ جوولەکە/ ٥٧

**تێبینی:** بە شێوەیەکی بەرز بازرگانی کردنی جۆرەها قوماش بەدەستی بازرگانە جوولەکەکانەوە بوو لە عێراق.

## خشتەی ژمارە (٦٧)
## شیرنەمەنی (هاوردە)

١- ابراهیم حییم
٢- ابراهیم منشی داود
٣- افرایم شمعون موشی
٤- خضوري ابراهیم شکرجی
٥- خضوري صالح بصری
٦- داود حسقیل مراد
٧- منشی حکیم
٨- یعقوب مراد
٩- دتکور (مخزن)

ژمارە/ ٣٢ جوولەکە/ ٩

## خشتەی ژمارە (٦٨)
## پەستێنەری خورما- خاوەنەکان- شوێنەکانی

| ناو | ناونیشان |
| --- | --- |
| ١- منشی عزرا خضوری | بەسرە |
| ٢- افرایم حسقیل افرایم | بەسرە |
| ٣- الیاهو ابراهیم الیاهو کویتی | بەسرە |
| ٤- حسقیل ساسون سوفیر | بەسرە |
| ٥- روبین نسیم سلمان | بەسرە |
| ٦- سلمان الیاهو زلخه | بەسرە |
| ٧- سلیم موشی کوهین | بەسرە |
| ٨- یعقوب عزرا شموئیل اطرقچی | بەسرە |
| ٩- هارون صیون فرموش | بەسرە |
| ١٠- یوسف رفی | بەسرە |

ژمارە/ ٣٢ جوولەکە/ ٩

## خشتەی ژمارە (٦٩)
## ئاسن و تۆتیا (هاوردە)

١- منشی سلمان کحیله
٢- حسقیل الیاس اخوان
٣- حبیم توفیق
٤- داود حسقیل مراد
٥- سالم شمعون
٦- کرجی حسقیل زبیده

٧- منشى حكيم
٨- مير ابراهيم
٩- يعقوب و خضورى لاوى
١٠- يعقوب صورانى
ژماره/ ٢٦   جوولەکە/ ١٢

## خشتەی ژمارە (٧٠)
## دانەوێڵە- سەرکردەو بازرگانی

| ناو | ناونیشان |
|---|---|
| ١- حسقيل عزرا الياهو | بەسره |
| ٢- خضورى ساسون | بەسره |
| ٣- سلمان سوفير | بەسره |
| ٤- الياهو حسقيل عانى | بەغدا |
| ٥- الياهو مزين | بەغدا |
| ٦- شاؤل اسحق | بەغدا |
| ٧- مراد الياهو جورى | بەغدا |
| ٨- نسيم كوهين | بەغدا |
| ٩- بامين موشى شاشا | بەغدا |
| ١٠- يوسف موشى و مير طريق | بەغدا |

ژماره/ ٧٧   جوولەکە/ ١٤

## خشتەی ژمارە (٧١)

### دراوگۆڕ

لیســتێک بەناوی هەندێ خاوەن جۆرەها پیشــە لــە جوولەکەکانی عێراق

| ناو | پیشە | ناونیشان |
|---|---|---|
| ١- حسقیل الیاهو | دراوگۆڕ | شەقامی (الخلیل) بەسرە |
| ٢- سلمان هارون زلخە | دراوگۆڕ | شەقامی (العشار) بەسرە |
| ٣- ابراهیم خضوری ناوی | دراوگۆڕ | شەقامی (السموٴال)بەسرە |
| ٤- ادورد عبودی وشرکاءە | دراوگۆڕ | شەقامی (السموٴال) بەسرە |
| ٥- باروخ داود شماس | دراوگۆڕ | شەقامی (السموٴال) بەسرە |
| ٦- باروخ عویدیا | دراوگۆڕ | شەقامی (السموٴال) بەسرە |
| ٧- حرکی موشی | دراوگۆڕ | شەقامی (السموٴال) بەسرە |
| ٨- روبین وعزرا موشی | دراوگۆڕ | شەقامی (دلە الکبیر) بەغدا |
| ٩- سلیم شعشوع | دراوگۆڕ | شەقامی (السموٴال) بەغدا |
| ١٠- خضوری شمعون | دراوگۆڕ | شەقامی (السموٴال) بەغدا |

ژمارە/ ٤٧ جوولەکە/ ٤١

تێبینی/ خۆسەپاندن لەسەر ژمێریارەکانە

## خشتەی ژمارە (٧٢)
## هاوردەی شەکر

١- ابراهيم روبين شمعون
٢- الياهو فنال
٣- خضوری مراد شکر
٤- حسقيل عزرا رحمن بهرص
٥- ساسون هارون
٦- صالح مير
٧- منشی مير شاؤل شعشوع
٨- مير نسيم حکاك
٩- يهودا يعقوب نونو
١٠- يوسف موشی و مير طوبقی.

ژمارە/ ٥٨ جوولەکە/ ٤٢

## خشتەی ژمارە (٧٣)
## سابون (هاوردەو بازرگانی)

١- عبودی و سلمان عزرا يوسف
٢- ابراهيم حييم
٣- حييم توفيق
٤- داود حسقيل مراد
٥- منشی حکيم
٦- موشی واسحق نسيم
٧- مير حسقيل مراد
٨- يعقوب کوهين اخوان
٩- يوسف رابيشو ساسون
١٠- عزرا اسحق صالح

| ژمارە | جوولەکە |
|---|---|
| ٢٥ | ١٠ |

## خشتەی ژمارە (٧٤)
## هاوردەی داوو دەرمانی پزیشکی

| ناو | ناونیشان |
|---|---|
| ١- اسرائيل ربيع | شەقامی (الرشيد) |
| ٢- افرايم سلمان طويقی | شەقامی (الرواق) |
| ٣- ساسون شاؤل | شەقامی (الشورجه) |
| ٤- شاؤل بادو | شەقامی (الصفافير) |
| ٥- كرجی اسحق | شەقامی (الرشيد) |
| ٦- بنتال وعبودی سوفير | شەقامی (الرشيد) |
| ٧- مذخر ادويه لاوی | شەقامی (الرشيد) |
| ٨- منشی حكيم | شەقامی (السمؤال) |
| ٩- منشی و ابراهيم كوهين | شەقامی (الرواق) |
| ١٠- مير نسيم حكاك | شەقامی (الرشيد) |

ژمارە/ ٢٥ جوولەکە/ ٢٥

## خشتەی ژمارە (٧٥)

## كونجی هاوچەرخ

١- الياهو العانی

٢- الياهو جنكنە

٣- روبين سبتی

٤- سلمان جنكنە

٥- سليم شينە

٦- صالح عبيە

٧- صيون صبحە وشركاءە

٨- مير حزالە

ژمارە/ ٩ جوولەكە/ ٨

تێبینی/ لەبەر ئەوەی مادەی كونجی و دەرهێنراوەكانی كەرەستەیەكی هەرزانە بۆیە دەسـەلات لەسـەر كونجی هاوچەرخ بەدەست جوولەكەكان بوو. بۆ ئەنجامدانی مەبەستی خۆیان.

## خشتەی ژمارە (٧٦)

## هاوردەی چیمەنتۆ

| ناو | ناونیشان |
| --- | --- |
| ١- ابراهیم وشفیق عدس | بەغدا |
| ٢- حسقیل الیاهو عبدالعزیز | بەغدا |
| ٣- داود ساسون وشرکاءە | بەغدا |
| ٤- سالم شمعون | بەغدا |
| ٥- عزرا صیون یعقوب | بەغدا |
| ٦- مایرطویقی و یوسف موشی | بەغدا |
| ٧- منشی صالح شینە | بەغدا |
| ٨- میر حسقیل مراد | بەغدا |
| ٩- نونو میر قارح | بەغدا |
| ١٠- عبد نبی جی جی | بەغدا |

ژمارە/ ٢٢ جوولەکە/ ١

**تێبینی:** هاوردەی چیمەنتۆش هەروەکو هاوردەی شێلمانە.

## خشتەی ژمارە (٧٧)
## بۆیاغ (هاوردە)

| ناو | ناونیشان |
|---|---|
| ١- الیاهو یعقوب فتال | شەقامی (الشیخ) بەسرە |
| ٢- ابراهیم وشفیق عدس | شەقامی (الرشید) بەغدا |
| ٣- خضوری خزام | شەقامی (المستنصر) بەغدا |
| ٤- خصوری وعزرا میرلاوی | شەقامی (الرشید)بەغدا |
| ٥- دانیال شمعون موشی | شەقامی (الرشید) بەغدا |
| ٦- داود حسقیل مراد | شەقامی (الرواق) بەغدا |
| ٧- داود ساسون | شەقامی (الرشید) بەغدا |
| ٨- ساسون خزام | شەقامی (الرشید) بەغدا |
| ٩- سلمان حییم رجوان | شەقامی (الصفافیر) بەغدا |
| ١٠- شاول بادو | |

ژمارە/ ٢٦ جوولەکە/ ١٥

**خشتەی ژمارە (٧٨)**

**شێلمان و ئاسن (هاوردە)**

١- حییم توفیق
٢- داود حسقیل بابای
٣- داود ساسون
٤- شوع حسقیل زبیدە
٥- ساسون مراد
٦- عزرا صیون یعقوب
٧- منشی حکیم
٨- منشی صالح شینە
٩- میر ابراهیم
١٠- میر حسقیل مراد

ژمارە/ ٢٨ جوولەکە/ ٦

تێبینی: چالاکی بازرگانی جوولەکە دەسەڵاتیان بەسەر کەرستە سەرەکییەکان دیارو روونە لە ژیانی میللەتی عێراقی لەوانە خانەی (ئاوەدانکردنەوە)

## خشتەی ژمارە (٧٩)
## (چا) هاوردەو بازرگانی

١- ابراهیم ساسون مکمل
٢- داود یعقوب سوفیر
٣- عزرا سوفیر
٤- عزرا الیاهو العانی
٥- عزرا صیون یعقوب وشرکاءە
٦- منشی اسحق
٧- منشی میر حداد
٨- یهودا زلوف
٩- یهودا یعقوب نونو
١٠- یوسف بیرص

ژمارە/ ٢٨   جوولەکە/ ٦

تێبینـــی: لە خانەی کەلوپەلی خۆراکدا ســـەیری ئەو رێژە بەرزە بکە کە بازرگانە جوولەکەکان دەسەڵاتیانبەسەر بازاڕی چادا هەبووەو یارییان بەنرخەکان کردووە.

## خشتەی ژمارە (٨٠)
## رایەخی ئێرانی (بازرگانی)

| ناو | ناونیشان |
| --- | --- |
| ١- ابراهیم یوسف زلخه | شەقامی (الصفافیر) بەغدا |
| ٢- صالح ساسون محلب | شەقامی (الرواق) بەغدا |
| ٣- صالح سلمان مزرامی | شەقامی (الرواق) بەغدا |
| ٤- ادوارد جواهری | شەقامی (الرشید) بەغدا |
| ٥- اسحق بناتی اخوان | شەقامی (الرواق) بەغدا |
| ٦- اسحق عبودی حسقیل حییم | شەقامی (الصفافیر) بەغدا |
| ٧- روبین موشی مزرامی | شەقامی (المستنصر) بەغدا |
| ٨- بامین موشی شاشا | شەقامی (المستنصر) بەغدا |
| ٩- یعقوب ابراهیم کاشی | شەقامی (الرشید) بەغدا |
| ١٠- یهودا یعقوب نونو | شەقامی (الرشید) بەغدا |

ژمارە/ ٢٩ جوولەکە/ ٢٠

## خشتەی ژمارە (٨١)
## زێرنگەری

| ناو | ناونیشان |
| --- | --- |
| ١- خضوری نسیم شهربانی | بەسرە —عشار |
| ٢- کرجی ابراهیم | بەسرە- شەقامی (النجار) |
| ٣- الیاهو | بەغدا |
| ٤- باروخ الصائغ | بەغدا |
| ٥- خصوری نسیم | بەغدا- بازاڕی (الغزل) |
| ٦- شاؤل منشی | بەغدا |
| ٧- موشی ابراهیم | بەغدا |
| ٨- نسیم عودە | عەممارە |
| ٩- شوع اسحق واخوانە | بەغدا |
| ١٠- صیون الیاس | بەغدا |

ژمارە/ ١٥٠ جوولەکە/ ١٧

(امین الممین) لە کتێبەکەی بەناوی (بغداد کما عرفتها) لەلاپەرە ١٦٢ باس لەبازاڕی زێڕنگـــەری دەکات و دەڵێت: لەلای من بازاڕی زێرینگەری یەکێک بوە لەشوێنە خۆشەویستەکان لەسەردەمی لاوێتیمدا هەمو رۆژانی هەینی چەند کاتژمێرێک لەدوکانی (موشـــی) کە سەرۆکی زێڕینگەران بو لەوێ بەســـەرم دەبرد و ئەوەی دەهات و دەچوو لەپیاو و ئافرەت سەیرم دەکردن و لە (موشـــی) هەواڵیانم دەزانی چونکە موشـــی زیاتر لە پەنجا ساڵ شارەزایی لەوپیشەیە هەبوە و باسی ئەوجۆرە خشڵ و زێڕ و زیوانەی بۆ دەکردین کە بەغدادیەکان بەکاریان دەهێنا.

## چیرۆک لەسەر جوولەکەکانی عێراق

- نەخوێندەوار و خێزانەکەی:

نــەزان : بازرگانێکــی کتێب فرۆشــە و خێزانەکەشــی : خاوەنی هۆڵی کۆبوونەوەکانی ئەدەبی بوو..........

(محمد قاســم رجب) خاوەنی کتێبخانەی موســەنا لە بەغدا دەســتی بە بڵاوکردنەوەی زنجیــرە وتارێک لە گۆڤارەکەی بە ناونیشــانی (مذکراتی فی صوت الســرای) وەکو زانراوە کە خوالێخۆشبوو (رجب) وەکو یەکەم کەس لە بازرگانی کتێب و گۆڤار لەســەر بنەمای بازرگانیەکی ورد کاری کردووە، لەو بوارەدا شارەزاییەکی بەرفرەوانی هەبووە و بەناوبانگترین بازرگانی کتێب بووە لە عێراق، لە ئەلقەی شەشــەم لەو یادەوەرییــە جوانەی باس لە بازرگانێکی کتێب فرۆشــی جوولەکەی عێراق دەکات کە ناوی (اسحق معلم نسیم)بوو کە خوالێخۆشــبوو (رەجەب) زۆر بە زیرەکی و چالاکی ئەو کەسایەتیە سەرسام بوو، لە یاداشــتەکەی دا دەڵێ (اسحق معلم نسیم) هاوکاری (محمود حلمی) بوو کە پارێــزگاری لە پلەو پایەی بازرگانی خۆی دەکرد، لە هێنانی کتێب و گۆڤــار دەرفەتی بە کەس نەدەدا هاوردەیــان بکات بۆ نموونە ئەو گۆڤارانەی کەمتر بڵاو دەکرانەوە لەبەر بێ کەڵکی و کەم دابەشــکردنی نەیدەهێنا ئیدی گۆڤارەکان بۆ دابەشــکارێکی دیکە دەچوو کاتێ دەگەیشتە لای دابەشکارەکە (اسحق) بە خێرایی دەگەیشتە لای خاوەنی گۆڤارەکە پێی دەگوت کە ئامادەیە بۆ دابەشکردن و داوای دەکرد بە فرۆکە بۆی بێت، دابەشکاری پێشتریش ناچار دەبوو بۆ گۆڤارەکە بنوســێ کە چیتر دابەش نــاکات لەبەر ئەوەی بە فرۆکە گەیشتۆتە دەست (محمود حلمی) پێش ئەوەی بە ئۆتومبیل بگاتە ئەو ئیدی (اسحق نسیم) بەو جۆرە مانگێک یان دوو مانگ بەردەوام دەبوو پاشان داوای لــە بەڕێوەبەری گۆڤارەکە دەکرد کە چیدی بۆی رەوانە نەکات بەو شــێوەیە بەسەر بازاردا تەواو زاڵ دەبوو نەیدەهێشت کەس لە بازرگانانی کتێب و گۆڤار سەریان بەرز بکەنەوە، خۆی و هاوکارەکەی (محمود حلمی) سامانێکی زۆریان کۆکردەوە، ئەویان لەبەر بیرکردنەوەی باش و دووربینی پارێزگاری لێکرد، بەڵام دووەمیان لەبەر بێ لێوردبوونەوە و سەرقاڵ بوون بە کاری دیکە پەیوەندی بە

بازرگانی کتێبەوە نەبوو ئەگەر (اسحق معلم نسیم) لێرە بووایە (ابی العباس) ئەوهای بەســـەر نەدەهات، چونکە (اسحق) ئیشکەرێکی زیرەک و دڵسۆز بوو لەگەڵ ئەوەشـــدا (محمود حلمی) وای بڵاودەکـــردەوە کە ئەو هۆی دواکەوتن و تێکچوونی بووە، پەیوەندی بە هەموو هاوتەمەنەکانی کە دەیانیناســـی کرد گوتی: کە ئێستا (محمود حلمی) وردە وردە دوا دەکەوێ دوای ئەوە (اسحق) دەســـتی لە کارەکەی هەڵگرت و عێراقی جێهێشـــت ئەو ڕۆژەم لە بیر ناچێ کە (اســـحق) ســـەفەری بۆ دەرەوەی عێراق کرد و ســـەردانی هەموو خاوەن کتێبخانـــەکان بە تایبەتی و خەڵکی بازار بە گشـــتی کرد (محمود حلمی) بۆ چاکە پێی رادەســـپاردن زۆر کاری لێکرد چونکە (اســـحق) وەکو هاورێکانی دیکـــەی نەبوو نەخوێندەوار بوو هیچ شـــتێکی دەربارەی کتێب نەدەزانی و بە هیچ جۆرێک لە خوێندنەوە رانەهاتبوو ســـەرەرای ئەوانەش ماڵەکەیان هەردەم بۆ پێشـــوازی کردن لە نووســـەرو ئەدیبی جوولەکە و موسڵمان و فەلە کراوە بوو، ســـەرکەوتنی ئەو کـــۆرو کۆبوونەوە و دیدارانە هەمـــووی بۆ (مەلیحە) ی خێزانـــی دەگەرێتـــەوە کە بە ئافرەتێکی زیرەک و لێهاتوو ناســـرابوو، هەر لـــەو کۆبوونەوەیە ئەدەبیە دا نوســـەر و ئەدیبی بە ناوبانگ خوالێخۆشـــبوو (مصطفـــی علی) ئامادە دەبوو کەلەســـەردەمی (عبدالکریم قاســـم) لە دوای شۆرشی (١٤تەموز١٩٥٨) پلەی وەزیری دادی وەرگرتبوو.

هێشـــتا بەدوای کاروباری کتێب و کتێبخانەکان دەگەرێین پێویستە باسی یەکێـــک لە بەناوبانگترین بەرگ تێگیـــراوی (مجلد) کتێب لە بەغدا بکەین کە لە هۆزەکانی ئیســـرائیلی بوو ئەویش (حیاوی)بوو ناوی لە کتێبی (شخصیات عراقیـــە)ی (خیری الدین العمری)دا هاتووە، لـــە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت بە خوالێخۆشبوو (عبدالرحمن الکیلانی) نە قیبی سەرپەرشتیاری بەغدا و یەکەم سەرۆک وەزیران لە عێراق بەو شێوەیە هاتووە (لە نوسینگە فراوانەکەی خۆی لەگەڵ نەقیب کۆبوومەوە و لە نێو رەفەکانیدا جوانترین نوســـراو دەگمەنترین کتێبـــی تێدابوو کە بـــە چاودێرییەکی تایبەت پارێـــزگاری دەکرد و بەردەوام کتێبەکانی بە بەرگی ســـۆر لەلای (حیاوی) کە بەرگ تێگیراوێکی جوولەکەی بەغدا بوو کتێبەکانی بەرگ دەکرد.

## چیرۆک لەسەر جوولەکەکانی عێراق

هەزاران ساڵ پێش ئێستاو لەو ماوەیەی کە جوولەکە لە عێراق هەبوو پێویستە هەڵوەستەیەک و سەرنجدانێک بەوردی بۆ ئەو رووداوانەی لەو ماوە درێژەدا بە بڕوای من بڵاوکردنەوەی پوختەی هەندێ لەو رووداوانە جۆرە پەروەردە کردنێکی سیاسی دەنوێنێ کە تیشک دەخاتە سەر زۆر بابەت کە رۆڵەی ئێستاو نەوەی داهاتوو سەربەستانە پێی ئاشنا بن، بۆ ئەوەی بتوانن بە شێوەیەکی ورد مەبەستەکانیان بزانن سەرەرای بەسەر چوونی کاتێکی زۆر لە رووداوەکە.

لە کاتێکدا باری دارایی و ئابووری هۆی سەرەکی ئەو رووداوانە بووە بۆیە ئاسانە کە خوێنەر بۆ چوونی جوولەکەکان سەبارەت بە دەسەڵات و هەیمەنەتی پارە لێکبداتەوە و چۆن جوولەکەی عێراق توانیویەتی لەو کێشانەی کە بوونەتە کۆسپ لەبەر دەمیان رزگاریان بێت سەرەرای ئەوەی لە هەموو خۆشییەکانی ژیانیاندا رێگەیان لێ گیراوە و بارگرانیشیان بۆ نەوەکانی دیکە جێهێشتووە.

## هەوڵی خۆدزینەوە لە خزمەتی سەربازی دا

دیــارە هۆزەکانی جوولەکە بە پێی توانا هەمــوو هەوڵێکیان دەدا کەلە ریزی ســـەربازی دوور بکەونەوە چەندین جار ئــەو کارەیان کردووە ئەویش بەواســـیتەو بەرتیل پێدان دەدرا بە بەرپرســـەکان بۆ یارمەتی دانیان (لیوا روکن- ابراهیم الراوی) کە لە ســـاڵی ١٩٢٧ بە پلەی بەرێوەبەری تەجنیدی گشتی کاری دەکرد ئەو باسەی لە یادەوەرییەکەی دووپات کردۆتەوە.

(الـــراوی) دەڵێ رۆژێکیان لە مانگی رەمەزان چووم بۆ موتەســـەرفیەی لیـــوای بەغدا بۆ چاودێری کردنی کارەکانی تەجنیدی لەو کاتەی لەوێ بووم پیاوێک هاتە ژوورەوە و بەیانی باشـــی ئەم ئەوی کرد یەک لە برادەرەکانی بە ناوی (حسن عبدالهادی) کە ئەندامێکی لێژنەکە بوو بانگی کردم و داوای لێکردم کە یارمەتی ئەو کەسە بدەم و لە کاری سەربازی لێبووردنی بۆ بکەم و هەروەها جێگیری دەســـەلاتدار و ئەفسەری سەربازگرتن ئەوانیش یارمەتی دانـــی ئەو پیاوەیان دەویســـت، هیچـــم بۆ نەکرا تەنها توانیم دانیشـــتنەکە جێبهێڵم بۆ لای دەســـەلاتدار برۆم و لەگەڵ خوالێخۆشـــبوو (امین خالص) کـــە پەیوەندییەکی بەتینم لە گەڵی هەبوو پێم گووت من وەکو بە رێوەبەری گشـــتی قسەت لەگەڵ ناکەم بەڵکو وەکو هاورێیەک لێرەم من لە لێژنەکەدام رووبەرووی ئەو بەســـەر هاتە هاتم دەمەوێ تۆ بۆم چارەســـەر بکەی، گوتی بەخـــوا (ابراهیم) هەروەها منیش بۆ یارمەتیدانی ئەو پیاوە لەلایەن (ناجی الخضیری) هاورێم راســـپێردراوم، سەیرە بەخوا ئەو هەموو بایەخە چییە بەو کەســـە دەدرێت؟ تێکرایی لێژنەکە بە دەسەلاتدار و جێگیرەکەی و ئەندامی نیشـــتمانی و ئەفســـەری ســـەربازگرتن و موختار دەیانەوێت یارمەتی بدەن گوتیـــان بە دوای بنێرە بۆ ئەوەی ببینین کەهاتە ژوررەوە کەمێک وەســـتا پاشـــان برپاریان پێدا کە بچێتە دەرەوە، دەسەلاتداریش رووی خوێ بەلامدا ســـووراند و گوتی (ئیبراهیم ئەوەیە ...... ســـالانێک کاری پێدەکەین) بۆیە (امین) ئەو قســـەی گوت چونکە ئەو کورە لە هەرەتی لاوێتی بوو هەروەکو ئەڵماس دەدرەوشایەوە، بۆیە داوا لە لێژنەکە کرابوو بە هەر شێوەیەک بێت لە خزمەتی ســـەربازی رزگاری بکەن ئەو هەموو هەرایە یان کرد بۆ ئەوەی خزمەتی سەربازی نەکات چونکە جوولەکەیەکی ناسراو بوو.

## چیرۆکی بەرخ و مەڕ

لــە دوا ســالآنی تەمەنـــی ئیمپراتۆریەتی عوســمانی زۆربەی پیاوە گەورەکانی بەغدا پێش ئەوەی بەغدا جێبهێڵن و بەرەو ئەســتەنبوڵ بچن گیرفانیــان بە پــارەی حەرام پر دەکرد کە بەچەندین رێگەی نایاســایی دەســتیان کەوتبوو، ئەوەش بێگومان ئیبتزازکردنە، باس لەو بارودۆخەی خەڵکی دەوڵەمەندی بەغدا و چۆنیەتی تاڵان بردنی پارەو پولیان دەکرێ و دەڵێن یەک لە پاشــایەکان فەرمانیدا بە هێنانی سێ بازرگانی گەورەی دانیشتووی بەغدا بە مەرجێ هەریەکە و سەر بە هەر سێ ئایینی ئاسمان بن، ســێ بازرگانیان بۆ کۆشــکی پاشــا هێنا کە لە مسوڵمان و فەلە و جوولەکە پێکهاتبوو پاش کەمێک پادشا داوای کرد یەکێکیان بێتە ژوورێ هــەردوو بازرگانی فەلەو جوولەکە داوایان لە بازرگانە مســوڵمانەکە کرد ئــەو یەکەم جــار بچێتە ژوورێ بەو جۆرە موســڵمانەکە چووە ژوورێ و دوای بەجێهێنانی رێزو ســڵاوکردن لە ناوەراستی هۆڵێک راوەستا بوو کە چەندین کەســایەتی و دارو دەســتەی پاشــا ئامادەبوون و لە نزیک ئەو بەرخێک هەبوو، لێرەوە پاشا کێشەی دروستکرد، پرسیاری لە بازرگانەکە کرد.....

توخوا ئەی بازرگان پێم بڵێ ئەوەی لەبەر چاوتە ئایا مەڕە یان بەرخە؟ لەبەر ئەوەی پرســیاری پادشا زۆر قورس نەبوو کە کاتێکی زۆری بووێ وەڵامی دایەوە گوتی ئەوە (بەرخە) گەورەم ..... پاشا تورە بوو هاواری کرد ئامادەبووان ئەوەی لەبەر چاومانە چییە؟ بەیەکەوە وەڵامیان دایەوە گوتیــان گەورەم ئەوە (مەڕە) ئیتر بازرگانی بێ گوناە دەبێ (١٠٠لیرەی زێر) بە بژارکردن بدات. لەبەر ئەوەی نەیتوانی وەڵامی راست بداتەوە، لە هۆڵەکە دەچێتە دەرەوە هاورێکانی (فەلە و جوولەکە) کە لێییان پرســی چی رویداوە ئەویش چیرۆکەکەی بۆ گێرانەوە و خوا حافیزی کرد ئەمجارە نۆرەی (گاور)ە کە هات لە دڵی خۆیدا دەیگوتەوە ئەگەر پاشا لێ پرسی ئەوەیان چییە مەڕە یان بەرخە، دەڵێت مەڕە بەو شێوەیە وەڵامەکە راست

دەبێـــت و لە تەڵەی پاشـــا رزگاری دەبێت، لەکاتی ئامادەبوونی لە پێش پاشـــا پرسیارێکی لێکرد و گوتی ئەوەی لە پێشـــتە مەڕە یان بەرخە ؟ ئەویش بە دڵخۆشی وبێ بیرلێکردنەوە وەڵامی دایەوە و گوتی : ئەوە مەڕە گەورەم یەکسەر دەســـتکرا بە پێکەنین و گاڵتە پێکردن لە لایەن ئامادە بووان، پاشـــاش هاواری کرد و گوتی هەی گێلە ئەوە مەڕە یان بەرخە ؟ فەرمانی دا (١٠٠) لیرەی زێری لێبســـتێنن و بە چاوی فرمێسکاوی یەوە هۆڵەکەی جێهێشـــت و دەچێتەوە دەرەوە، بازرگانە جولەکەکەش وەڵامی ئەویشی گوێ لێ بوو کە چی بە پاشا گوتووە، ئەویش بۆ وەڵام دانەوەی خۆی ئامادەکردبوو کە نۆرەی هات چووە ژووریٚ پاشـــا هەمان پرسیاری لێکـــرد و گوتی ئەو ئاژەڵەی لـــە پێش چاوتە مەڕە یان بەرخە ؟ ئەویش پاش خولەکێک لە بێدەنگی دەســـتی بۆ گیرفانی بردو وەڵامی پادشـــای دایەوە گوتی گەورەم ئـــەوە تورەبوونی خودایە نە بەرخە نە مەرە...... (١٠٠) لیرەی زێری خۆی وەرگرت و رۆیشت.

## سەرگوزەشتەی جوولەکەی عێراق لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (والی داود پاشا)

لە کتێبەکەی دکتۆر (عبدالعزیز نوار) کە بە (داود پاشـــا فەرمانرەوای بەغـــدا) ناونراوە، باس لە نەهامەتی ئەو رۆژانە دەکات کە جوولەکەکان بە دەست دەسەلآتداریەتی تورکی یەوە دەیانناڵاند، تیایدا دەڵێ لە سەردەمی داود پاشـــا ئەو کەمـــە نەتەوایەتییەی کە لە عێراق هەبـــوو جوولەکەکان بوون، کە زەمانێک بوو لە عێراق نیشـــتەجێ بوون لەوانەیە بارودۆخی یان لەسەردەمی عەباسی زۆرلەبارودۆخی مەسیحیەکان باشتربووە.

لەو ســـەردەمە دا ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکە پلەو پایەی ترســـناکیان وەرگرت و لە بە غداش شـــوێنێکی نیشتەجێ بوونیان هەبوو تا ئەو کاتەی بەغدا لە ســـاڵی ١٢٥٨ بە دەستی مەغۆلەکان رووخێنرا، کاتێک داود پاشا دەســـەلآتی لە عێراق وەرگرت دەبوایە هەندێ پـــارەو پولی بۆ ئەوانەی لە خۆی گەورەترن بنێرێت و بۆ پرکردنەوەی پێداویستیەکانی دەبێت پارەیەکی زۆر لە ژێر دەســـتی هەبێت بۆیە پێویســـت بوو کـــە زۆر خێرابێت، تەنها جوولەکەی شـــک دەبرد کە داوای پارەیان لێبکات بە شێوەی (کۆمپیالات) پارەکـــەی وەردەگرت و لە کاتـــی خۆی دەیدانەوە، هەنـــدێ لە جوولەکە دەوڵەمەندەکان رێگر بوون ژمارەیەکی زۆریان دەستگیرکران و داوایان لێکرا بە زووترین کات پارەکە پێشـــکەش بکەن، بۆ پرکردنەوەی داواکارییەکانی گەورە فەرمانبەرانی جوولەکەکان ژمێریارەکەیان ئیســـتغلال کردبوو، لەبەر بەرزبوونـــەوەی قـــەرزی جوولەکەی بەغـــدا حیســـاباتی جوولەکەی بەغدا لەگەڵ جوولەکەی ئوســـتانە راگیرا بەڵام هەر بەردەوام بوون لە داواکردنی لەوباوەڕەدا بوون کە هەرچەندە بارودۆخی گشـــتی خراپ بێ جوولەکەکان هەردەبـــێ پارەی زۆریان هەبێت . بێگومان بە هەرەشـــە لێکردن ناچاریان کردن کە پارە پێشکەش بکەن بەرامبەر بە (کۆمپیالات) کە ئەو کاغەزانەی لای ئـــەوان هیچ بایەخێکی نەبوو داود پاشـــا هەروەکو بابو باپیرانی هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو لە رەفتارکردنی لەگەڵ جوولەکەکان، لەســـەر ئەو هەڵوێستەشـــی گلەیی لێ دەکرا، بەڵام مێژووی جوولەکەو عەقڵییەتی

داود پاشا کە بە عەقڵییەتی عەلی بەگی گەورە دەچوو کە لە ڕێگەی دەست بەســەر داگرتن پارەی بۆ چاکســازی کۆدەکردەوە، بێگومان (داود) وەکو تۆڵە سەندنەوە ئەو کارەی دەکرد و دەستی بەسەر پارەیەکی زۆری خەڵکی دادەگــرت تا زۆربەیــان ناچار بوون بەغدا جێبهێڵن و بەرەو (مەســقەت) بڕۆن کە لەوێ (ســعید داود) کە هاوپەیمانی ئینگلیــز بوو فەرمانڕەوایی دەکــرد گوایە کەمە نەتەوەییەکان دەپارێزن ئەوەش ئەوە ناگەیەنێ کە بەو شێوەیە فرەوانە لە ژێر فشاری داود کۆچکردنی جوولەکە ڕێکبخرێ، ئێمە لە سەندیکای ژمێریاراندا جوولەکەیەک دەبینین ئەویش (اسحاق) جوولەکەیە کــە نزیکتریــن ڕاوێژکاری داود بووە و لە کوشــتنی (صــادق افندی) بە شدارییەکی کارای هەبووە بەو شێوەیە لەسەردەمی فەرمانڕەوایی داود پاشا لە کێشە و گرفتە گەورەکانی عێراق ڕۆڵێکی ترسناکیان هەبووە.

بــاس لــەو بەڵگەنامانە بکەین کە جوولەکەکان لــە جیاتی ئەو پارەی کە دەیاندایە پاشــا وەریاندەگرت، بەســەر هاتێک دەگێڕینەوە کە زۆربەی دانیشــتوانی بەغدا نەوە دوای نەوە دەیگێڕنــەوە تیایدا دەڵێت: جارێکیان یەک لەو بازرگانانەی کە پارەی بە پاشــا دابوو بەرامبەریشــی ئەو پارچە کاغەزەی وەرگرتبــوو چوو داوای مافەکەی خۆی بکاتــەوە (کۆمپیالەی) دایە پاشــا و لێی پارایەوە کە پارەکەی بداتەوە، پاشــاش فەرمانی دا کە پەرداخێــک ئاوی بۆ بهێنن و فەرمانی بە بازرگانە جوولەکەکەدا ئەو پارچە کاغەزە بخاتە ژێر ئاوەکەو پاشــان بیخواتەوە ئەویش جێبەجێی کرد پێش بڕوات، دیســان پاشــا (١٠٠ لیرەی زێڕی) دیکەی لێســتاند و کاغەزێکی دیکەی بۆ نووسی، لە کاتی دیاریکراودا چوو بۆ کۆشک بۆ ئەوەی پارەکەی وەرگرێتەوە ئەمجارەش لە جاری پێشــوو باشتر نەبوو دیسان داوای قەرزی ســێیەمی لێکرد بازرگانەکەش دەستی خستە گیرفانی خۆی پارچەیەک لە (نانە قەیســی) دەرهێنا داوای لێکرد کە ئەمجارە کۆمپیالەکەی لەسەر ئەو پارچەیە بۆ بنووســێ کە لە هۆیەکەی پرســی ئەویش گوتی پێش وەختە چارەنووســی کاغەزەکە دەزانم لە جیاتی ئاوی کاغەز بخۆم هەرنا لە ئاوی نانە قەیسیەکە دەخۆم.

## مردنی (حاخام)

بیانیـــەکان گەورەترین رەخنە لە کاروباری وڵات دەگرن و گلەیی لێدەکەن، سەرەتا کێشەکان گرنگ نەبوون و پێویستیان بە بایەخ و چاودێری نەبووە، لە نێو کۆمەڵەکەی (محمد امین العمری)دا کەسێکم بینی و گوتی یەک شەو پێش رۆیشـــتنی (مصطفی عاصم باشا) واتە لە (١٧ربیع الاخر) ساڵی ١٣٠٧ لاشەی (حاخام) دەرهاتووە.

(حاخام باشی) کە سەرۆکی حاخامیەکان بوو بە نەخۆشی (کولێرا) کۆچی دوایی کرد، جوولەکەکانیش بەشـــەو لاشەکەیان هێناوە تە دەرەوە لە کەنیسی پێغەمبەر (یوشـــع س.خ) ناشتویانە ئەوەش بە پێچەوانەی فەرمانی (مصطفی عاصم باشا)بووە. هەر لەوشەوە ناکۆکی کەوتۆتە نێوان جوولەکەو فەرمانبەری شـــارەوانی و لە (عبدالله الزبیق)ی سەرۆکی شـــارەوانیاندا و قسەیان پێگوت ئەویش بە یارمەتی (سعید اغا ایمر) فەرمانڕەوای (الای بکی) دەرگای کەنیسەی پێغەمبەر (یوشـــع) یان شـــکاند و (حاخام) یان ناشت، بەڵام فەرمانڕەوا بەم دۆخـــە رازی نەبوو جوولەکەکانی تەمبێ کرد و ئـــەوەی ئەو کارانەی کرد بوو بەندی کردن و فەرمانی لە ســـوڵتان (عبدالحمید) ی وەرگرت کە لاشـــەی ئەو جوولەکەیـــە دەربهێنن، بەشـــەو دەریانهێناو لە گۆرســـتانی جوولەکەکان نێژرا دوو رۆژ پێش نوســـینی ئەو فەرمانـــە (فەرمانـــرەوا) لادرا و بەرەو ویلایەتی (اطنة- ئەدەنە) گواســـترایەوە پێش بگاتە ئەوێ بووە بە فەرمانرەوای شـــام (المشـــیر توفیق باشـــا)ی وەک جێگرێک بۆ خۆی دانا سەرەرای کۆمەڵێک کە لایەنگیـــری برازاکـــەی (محمد کامل کوری محمد طاهر کوری یوســـف العمری) بوون، لە سەرچاوەیەکەوە زانراوە کە (الحاخام عبدالله ابراهام سومیخ) لەرۆژی ئێوارەی شـــەممە/ هەینی مانگی ئەیلولی ســـاڵی ١٨٨٩ کۆچی دوایی کردووە، شـــاردنەوەکەی بۆ رۆژی یەک شەممە دواخراو لەو وەرزەش نەخۆشی (کولێرا) بڵاوببۆوە بە هۆی ئەوەوە کۆچی دوایی کردووە. و لە نێو هۆزەکەیدا زۆر رێزی لێدەگیرا و لە (مدارش- بیت زلخە) مامۆســـتا بووە، نووسینەکانی لە کاروباری ئاینیەوە لاینەدەدا، بنەماڵەکەی (ال ســـومیخ) کۆنن، جوولەکەکان داوایان لە فەرمانرەوا کرد کە لەنێو کەنیسەی پێغەمبەر (یوشع- س.خ) بینێژن، بەڵام خۆی لەراستیدا دەبوایە لە دەرەوەی کەنیسەکە بنێژرێت، کەچی زۆر لە جوولەکە بێ

هۆشـــەکان دەیانویست بیبەنە نێو کەنیسەکە، بەڵام (الکلدیار) رێگەی پێنەدان و جوولەکەکانیش لە سنووری خۆیان لایاندا تەنانەت (الیاهو سموحە الصائغ) و (حاخامیەکان) پێیان داگرتبوو کە دەبێ هەر لەناو خەوگەکە بنێژرێ، لە نێوان خزمانی (الکلدیار) و جوولەکەکان وردەشەر پەیدابوو پۆلیس گەیشتە ناویان و کێشەکە قوڵتر بوو، بۆ رۆژی دووەم خێزانی (عاشیر سالم) کۆچی دوایی کرد، لەناو خەوگەکە نێژرا، دیســـان شـــەر دووبارە بۆووە، بووە هۆی سکاڵا لەیەک کردن و باسەکە گەیشـــتە ئەستەنبوڵ، جوولەکەکان داوایان لە دایکی سوڵتان کرد بێتە ناو کێشەکە، داواکاری جوولەکەکان زۆر بوو دوای سێ مانگ لە ترسی خەڵک و ئاڵۆزی بارودۆخەکە شەوێکیان (حاخام) یان لە گۆرەکەی دەرهێناو بۆ گۆرســـتانی جوولەکەکان کە لە رۆژهەڵاتی بەغدا بوو گواستیانەوە، لەسەرەتادا (یهودا زلوف)ی جوولەکە نوســـەری (حاخام) بوو (شاوول داود) یش پارێزەر بوو هەردوکیشـــیان تورکیان دەزانی و سەرۆکیش یارمەتی دەدان و (تەحسین بەگ)ی رادەســـپێرا کە یارمەتی جوولەکەکان بدات، حاخامییەکان کێشەکەیان گـــەورە و ئاڵۆز کرد و هەواڵەکەیان گەیاندە خۆرئاوا کە چاوەرێی ئەو هەواڵانە یان دەکرد، لە فەرەنســـا هەنـــدێ جوولەکە خۆیـــان تێهەڵقورتاند گوایە ئەوە گەورەترین کێشـــەیە وەک لەوێ ئاشکرایە کە پێغەمبەرەکان لەلای موسڵمانان و خاوەن ئایینەکانی دیکە بەرێزن، نابێت وەکو خەڵکی ئاسایی لە گۆرەکانیان بنێژرێن فەرمانرەوایش رێگەی پێدان لە گۆرستانی جوولەکە بنێژرێت هەر لەوێ توندو تیژی پەیدابوو، فەرمانرەوا فەرمانی لادانی سەرۆکی حاخامین (الیشاع) و هاورێکانی لە لێژنەی ئەنجوومەنی جیسمانی دەرکرد، لە نێوانیشاندا (یوسف شنطوب و یوسف کاشـــی) بوون، بەڵام هۆزەکە نەیانتوانی پاکانە بۆ ئەو سەر پێچیانە بکەن بۆیە بانگەشـــەی ئەوەیان کـــرد کە هۆیەکەی کۆمەڵێک هەرچی و پەرچییـــە بێ باکەکان بوونە، کێشـــەکە بەلابردنی فەرمانرەوا کۆتایی هات و بۆ (ئەدەنە) گواسترایەوە، پاشـــان (توفیق پاشا)ی سەرکردە گواسترایەوە و ئەوانەی هۆی کێشەکەش بوون دەستگیرکران. حکوومەتیش رێگایدا کە شوێنی بەندیخانە کە بکرێتە کەنیسەی ئیسرائیلی چونکە ئەوان (روحانین) تەنها سێ مانگیش بەســـە بۆ بەندکردن ئەو زانیارییەشـــم لە چەنـــد جوولەکەیەک زانی، دەوڵەتیش بە کێشـــە شاراوەکانی زانی کە لە پشـــت پەردەوە چ جۆرە توندو تیژییەک لە نێوان فەرمانرەوا و سەرکردەدا دەکرا.

# چیرۆکی پزیشک و جوولەکە نەخۆشەکان

دکتـــۆر (کەمال الســـامرائی) یادەوەرییەکی لەســـەر ژیانی خۆی بە درێژایی نیو ســـەدەو لەسەر شـــێوەی یادگاری بڵاوکردەوە و ناونیشانی (حدیث الثمانین)ی بۆ دانا، لە ســـاڵی ١٩٩٤ بەشـــی یەکەمی دەرچوو لە ســـاڵی ١٩٩٥ بەشی دووەم و لە ســـاڵی ١٩٩٦ بەشی سێیەم و چاوەڕێی بەشی چوارەم و کۆتایی ئەو یادەوەرییەن، جێی سەرنجە کە (سامەرائی) هەڵوێستێکی زۆری لەگەڵ جوولەکەی عێراقی هەبوو ئەوکاتەی ئەو هۆزە لە بەغدا شان بە شانی تەواوی هاوڵاتیانی عێراقی بە دڵنیایەوە بەیەکەوە دەژیان، .

لە یادەوەرییەکانیدا زیاتر لە بیســـت چیرۆک و بەسەر هاتی نوسیوە، بە هۆی کارەکەیەوە کە پزیشکی پسپۆر لە نەخۆشیەکانی ئافرەتان بووە، لە نێو چیرۆکەکانیدا دوو چیرۆکمان هەڵبژاردووە و هەردووکیشـــیان باس لەیـــەک بابەت دەکەن ئەویش ماددەیە، لە چیرۆکـــی یەکەمیدا باس لەو دەســـتکەوتە مادییە دەکات کە لە پاش دەرچوونی لە خوێندن لە ساڵی ١٩٣٩ بەدەســـتی هێنا بە هاوکاری مامۆســـتاکەی (جورج حیقاری) کە نەشتەرگەرییەکیان بۆ ئافرەتێکی جوولەکە ئەنجامدا ... بەڵام لە چیرۆکی دووەمـــدا باس لە ژیانی پزیشـــکی خۆی دەکات تـــا کۆتایی ١٩٤٨ لەو ماوەیەدا کە بەرزترین کرێی وەرگرتووە بەرامبەر بە خزمەتکردنی خانمێکی جوولەکە، دکتۆر (الســـامرائی) خۆی پوختەی هەردوو چیرۆکەکان باس دەکات .

## (یەکەم کرێ کە لە کارکردنی پزیشکی وەرم گرتبێ لەساڵی ١٩٣٩) بووە

لـــە رۆژی ١٩٣٩/٨/٦ پێـــش کۆتایـــی هاتنی دەوامـــی حکومەت لە نەخۆشـــخانەی مەلەکی دکتۆر (حیقاری) مامۆســـتام بـــووە، پێی گوتم (کەمال) نەخۆشـــێکم هەیە بەیانی رۆژی هەینی نەشتەگەری (دوومەڵ-قۆنێـــر)ی بـــۆ دەکەم دەمەوێت تۆش کاری ســـرکردنی بـــۆ بکەی ئەوە یەکـــەم جارم بوو کە دکتۆر (حیقـــاری) یاخود یەکێک لە دکتۆرەکان بۆ نەشـــتەگەریی لە دەرەوەی نەخۆشخانە داوای یارمەتیم لێ بکەن، پێدانی ســـرکردن لە ماڵان کارێکی ترســـناکە لەبەر نەبوونی ئۆکسجین سەرەتا دوودڵ بووم و رازی نەبووم، بەڵام رێگەم بەخۆم نەدا بێ هێز بم بەرامبەر بـــەو کارەی کە دەیکەم بە تایبەتی ئەگەر دکتـــۆر (حیقاری) خۆی ئەو داوایەی لێکـــردم، ئەوکاتە زۆربەی خەڵکی بڕوایـــان بە خزمەت گوزاری نەخۆشـــخانەکان نەبوو بە بۆ چوونی ئەوان کە نەخۆشـــخانە ژیانیان لە مردن رزگار ناکات و کۆتایی بە ژیانیان دێنێت بۆیە پشـــتیان بە پزیشکە تایبەتییەکان بەستووە تاکو لە ماڵەوە چارەسەریان بکەن لەگەڵ ئەوەشدا هەرهەمان پزیشـــکن کە لە نەخۆشـــخانە چارەســـەری نەخۆش دەکەن، دکتۆر (حیقاری) شارەزای لە نەخۆشـــییەکانی ئافرەتان هەبوو چەندین نەشتەگەری لە دایکبوونی بێ سرکردن کردبوو بە بیانووی ئەوەی هەر بە ژانی سروشتی لەدایک دەبن نەک ژانی دەستکرد، کاتژمێر١٠ی بەیانی بوو لەگەڵ دکتۆر (حیقاری) لە نێو ئوتومبیلەکەی دانیشتبووم و بەرەو ماڵی ئافرەتە نەخۆشـــەکە دەچووین ماڵیان لە گەرەکـــی (خضر الیاس) نزیک کەرخ بوو کاتێ ئۆتومبیلەکە لەبەر دەرگای ماڵی نەخۆشـــەکە راوەســـتا، دەرکەوت کە شـــوفێری دکتۆر (حیقاری) ئەو ماڵە دەناسێ و دانیشتووی ئەو ماڵە ئاشنای دکتۆرن.

دکتۆر (حیقاری) زۆر چالاکانـــە لە ئۆتومبیلەکە دابەزی بەرەو دواوە رۆیشت و سندوقەکەی کردەوە لە ناویدا جانتایەکی لە ئاسن دروستکراوی دەرهێنا کە بۆ هەڵگرتن بۆ ماڵە نەخۆشەکان ئاسان بوو، هەرخۆی جانتاکەی

هەڵگرت و بەرەو ژێر زەمینەکەی بردین، ئەو کات دەرهێنانی (قونێر) لەو جۆرە نەخۆشانە زۆر ئاسایی نەبوو، نەشتەگەریەکە پێویستی بە ئامێرێک هەبوو کە بە (کرســتوفر-مارتن) ناسراو بوو، دکتۆر دەستی بەکارەکانی خۆی کرد و تێکەڵەی (کلۆر و فۆرم بە ئەپیر) کە مادەیەکی سڕکەر بوو کاتی خۆی بۆ سرکردنی نەشتەگەری بەکار دەهات، نەخۆشەکەی سرکردو کەوتە خەوێکی قوڵ، نەشــتەگەریەکە زۆری نەخایاند، دکتۆر جانتاکەی کۆکردەوە و هەڵیگرت، لەبەر دەرگای ژێرزەمینەکە خاوەن ماڵ وەستا بوو گوتی (ئافەرین بۆ ئێوە و نموونەتان زۆر بێ) بینیم کە شتێکی خستە نێو گیرفانی دکتۆر، کاتێ سواری ئۆتومبیلەکە بووین و چەند مەترێک ڕۆیشتن دەســتی کرد بە گیرفانی و پارەکەی دەرهێنا .. سەفتەیەک پارە بوو کە بریتی بوو لە هەشــت دانە، دکتۆریش گوتی: ژماردنێکی تەواوە واتە ئەو پارەیە (١٠٠روپیە)یە هەروەها گوتی ئەو خەڵکانە لە نەخۆشــە کۆنەکانن و زۆر باش و چاکن، پاشــان دوو دیناری دەرهێناو خســتیە گیرفانی من منیش ڕازی نەبووم پێی گوتم: ئەوە بە حەڵاڵی ماڵی خۆتەو مافی خۆتە، ڕەتکردنەوەی حەڵاڵیش گوناحــە پارەکە لە گیرفانمدا مایەوە، ئەوە بوو یەکــەم کرێ لەکاتی ئیش کردنم لەدەرەوەی نەخۆشــخانەی میری وەرم گرتبێ، بــەڵام چیرۆکی دووەمی دکتۆر (حیقــاری) لەگەڵ جوولەکەکان ئەوەیە کە لە یادەوەرییەکەی نوسیویەتی.

## بەرزترین کرێی نەشتەرگەری لە ژیانمدا ١٩٤٨

بریکاری ئۆتومبیلی (فۆرد) کە (ابراهیم عدس) بوو داوای لێکردم بۆ پشـــکنینی ئافرەتێک کە لە ماڵەکەیان بوو ناوی (کرز) بوو هەروەکو ئەو جوولەکە بوو هەردووکیشـــیان لوبنانی بوون، بەڵام نەمدەزانی پەیوەندی نێوانیان چییە تەنها ئەوان دڕواســـێ یەکدی بـــوون، ئافرەتەکە تەمەنی ٣٠ســـاڵان دەبوو مێردی کردبوو کچێکیشـــی هەبووە بەڵام (عدس) بێوە پیاو بوو تەمەنی لە ناوەراســـتی ٤٠ساڵی دەبوو، بینیم نەخۆشەکە توشی هەوکردنی حەوز بووە، بۆ نەخۆشـــخانەی (العلمین)م گواستەوە کە خۆم وەکو پزیشـــک لەوێ کارم دەکرد ئەو نەشتەرگەرییەی بۆ خاتوو (کرز)م کرد زۆر ئاســـان بوو ئەوەندەی نەخایاند و ژووری نەشتەرگەریم جێهێشت پاش ئەوەی رێنمایی خۆم دایە (رینە اســـحاق) کە سەرۆکی پەرستیاران بوو، ئەویش نەخۆشەکەی بردە ژوورێکی تایبەت تا (رینە) لەوێ چاودێری بـــکات و بایەخی پێبدات، ویســـتم برۆم ئۆتومبیلەکـــەم ئیش پێبکەم و بگەڕێمـــەوە عیادەکەی خۆم گوێم لە (ابراهیم) بوو گوتی: بۆ کوێ دکتۆر (ســـامەرائی) بە ســـووکی وەڵامم دایەوە و گوتم، بێگومان بۆ عیادەکەی خۆم، زۆر بە باوەڕەوە پێ گوتم. نا دکتۆر دەبێ ئەمشەو لە نەخۆشخانە بمێنیتەوە پێم گوت پێویســـت بەوە ناکات بەرێز (عدس) گوتی : من وام دەوێـــت هەر نا دڵم ئارام دەبێـــت، پێم گوت پاش عیادەکەم دەگەڕێمەوە بۆ لای گوتی دکتۆر من دوو ئەوەندەی ئیمرۆ دەســـتت دەکەوێ دەتدەمێ (رینـــە) ئێمەی دەبینی کە لەگەڵ یەکدی قســـەمان دەکرد هات بۆ لامان (رینە) زۆر جادووکەر بوو دەیویســـت بە (عـــدس) بڵێ با بڕوات، بەڵام (عـــدس) رازی نەبوو هەر بەردەوام داوای لێدەکـــردم و زۆر پاڕایەوە لە کۆتایی لەســـەر داوای ئەو ئەو شـــەوە لە یەکێک لە ژوورە بە تاڵەکانی نەخۆشـــخانە مامەوە، بەڵام (عدس) وای پێ باش بوو کە خۆی لەســـەر کورســـیەک دابنیشێ و لەلای نەخۆشـــەکە بمێنیتەوە، پاش نیو کاتژمێر (ابراهیـــم عدس) هاتـــە ژوورەکەی من گوتی دکتـــۆر وا خەریکە (کرز)

دەجوولێتەوە و دەرشـێتەوە، پێم گوت بـۆ (رینە) لەلای نییە؟ گوتی: بەڵێ لەلایەتی، گوتم باشە مەترسێ لەگەڵی چووم بۆ ژووری نەخۆشەکە هەموو شتێک ئاسایی بوو پێم گوت هەر کاتێک پێویست بێ (رینە) خۆی داوام دەکات.

ئەو شـەوە خەوتم و (رینە) بانگی نەکردم بۆ بەیانی زوو سـەردانی نەخۆشـەکەم کرد بینیم لە خەوێکی قـوڵ دایە (عدس)یش لەلایەوە بوو مانـدوو بوونی پێوە دیار بوو بەڵام هەرگیز رێگەی نەدا کە من هەسـت بە نیگەرانی و ماندوێتی بکەم زۆر دەسـت خۆشـی لێدەکردم دوای چوار رۆژ بە نەخۆشـەکەم راگەیاند کە نەخۆشخانەکە جێبهێڵێ (عدس) بەرەو رووم هات و زەرفێکی خسـتە نێو گیرفانم پێی گوتم شایانی زیاتری من ئامادەم بۆ هەر خزمەتێک، زانیم ئەو زەرفە پاداشـتی منە کاتێک لە نێو ئۆتومبیلەکەم زەرفەکەم کـردەوە بینیم برێکی زۆر لە دیناری تێدایە کە (٥٠٠)دینـار دەبوو من کاتی خۆی بۆ ئەو جۆرە نەشـتەرگەریانە تەنها (٧٠)دینارم وەردەگرت.

### سەرچاوەکانی ئەو بەشە


١- ابراهيم الراوى / من ذكرياتى
٢- د. عبدالعزيز نوار / داود باشا والى بغداد
٣- عباس العزاوى / تاريخ العراق بين احتلالين
٤- د. كمال السامرائى / حديث العثمانيين
٥- مجله قرندل البغداديه / اعداد من سنوات ١٩٥٦-١٩٥٧-١٩٥٨
٦- خيوى العمرى / شخصيات عراقيه صفحه ١٩


١- ابراهيم الراوى، يەکێک بووە لە ئەفسەرە پێشکەوتووەکانی سەربازی عیراقی بە شداری لە شۆرشـــی گەورەی عەرەبی کردووە، لە دوای دامەزراندنی میرنیشینی عێراق چەندین پلەی بەرزی وەرگرتووە لەوانە سەرۆکی تیپی سەربازی دوای خانەنشین کردنی لە سەربازی بوو بە بالۆێزی عێراق لە (کابول) لە ساڵی ١٩٦٩ یادەوەرییەکانی نوسیوە.


لە کۆتایی دا: رێز و سوپاســم بۆ هەموو ئەوانەی هاندەر و هاوکارم بوون لە چاپکردنی ئەو کتێبە بە تایبەتی ێهاوسەرەکەم.....

شەرمین

## پێرست

# زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی ٢٠١٣ی وەزارەتی
# رۆشنبیری و لاوان
# بەڕێوەبەرایەتی گشتیی راگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە
# بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی هەولێر

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | بابەت | نرخ | لاپەڕە |
|---|---|---|---|---|---|
| ٧٤٠ | تاوانە سێکسییەکان بەپێی یاسای سویدی | و. کاوە حەمەد ئەمین | کۆمەڵایەتی | ٤٠٠٠ | ٢١٦ |
| ٧٤١ | سەبەست لە مافەکانی مرۆڤ چییە | و. ئیبراهیم سالحی | یاسایی | ٣٠٠٠ | ٢٤٠ |
| ٧٤٢ | تیۆر و سروشتی مرۆڤ لە زانیاری ناسینەوە | د. شوان نافع خورشید | تەندروستی | ١٠٠٠ | ٤٨ |
| ٧٤٣ | مۆدێرنیزم | و. شۆڕش غەفوری | کۆمەڵایەتی | ٢٠٠٠ | ١٣٦ |
| ٧٤٤ | قوتابخانەی فرانکفۆرت | دانا شوانی | زانستی | ٣٠٠٠ | ٢٨٠ |
| ٧٤٥ | لۆژیکی فۆرماڵ و لۆژیکی هێمایی | حەسەن حوسێن سدیق | فەلسەفی | ٣٠٠٠ | ١٣٦ |
| ٧٤٦ | فەلسەفەی ئەخلاق | و. سەعید کاکی | فەلسەفی | ٣٠٠٠ | ٢٨٠ |
| ٧٤٧ | ئابووری کوردستان لە رێکخراوی بازرگانی کوردستان | و. جەنگیز شکاک | ئابووری | ٣٠٠٠ | ١٥٢ |
| ٧٤٨ | ریزبەندی گوتار | و. هاوار محەمەد | ووتار | ٣٠٠٠ | ٩٦ |
| ٧٤٩ | کاریکاتۆر و هێز لە کەلەپووری کوردەواریدا | و. سەید مەحمودی موکری | هونەری | ٥٠٠٠ | ١٦٠ |
| ٧٥٠ | جريمة الاحتيال | دريد نورالدين عزيز | یاسایی | ١٠٠٠ | ٥٦ |
| ٧٥١ | سیفیەکان | شێرزاد قادر هەینی | زانیاری گشتی | ٣٠٠٠ | ٢٩٦ |
| ٧٥٢ | المعابد الميترائية ومقارنتها | عبدالرقيب يوسف | تاريخي | ٣٠٠٠ | ١٩٢ |
| ٧٥٣ | نهێنییەکانی بێژەری سەرکەوتوو | هەژار حەکیم عەزیز | هونەری | ٢٠٠٠ | ٦٨ |
| ٧٥٤ | الامير باد الكوردي | د. احمد عبد العزيز محمود | ادبي | ٢٠٠٠ | ٦٨ |
| ٧٥٥ | پەیکەرسازی لای چیانشینانی زاگرۆس | ماجید نووری قادر | هونەری | ٣٠٠٠ | ١٣٦ |
| ٧٥٦ | ریالیزم لە شانۆی کوردیدا | کەیفی ئەحمەد عەبدولقادر | هونەری | ٣٠٠٠ | ٣٠٤ |
| ٧٥٧ | پەیرەوکارانی یارسان لەکرماشان [illegible] | تامیق هەورامی | ئایین | ٢٠٠٠ | ١٢٠ |
| ٧٥٨ | انسان چگونه غول شد | جلیل گادانی | فیکری | ٣٠٠٠ | ٣٤٤ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٧٥٩ | جولەکەکانی عێراق مێژوویان و گوزەرانیان و کۆچکردنیان | شەرمین عەبدوڵلا | مێژوو | ٣٠٠٠ | ٢٨٠ |

جوولەکەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە مێژوویەکەیان بۆ سەردەمی ئیبراهیم خەلیل (س.خ) بۆ ٤٠٠سالّ پ.ز. دەگەڕێتەوە، کاتێ ئەوان لە ولاّتی رافیدەین بۆ فەلەستین کۆچیان کرد ژمارەیان لەم کۆچە کۆمەڵییە

لە ٤٠٠کەس تێنەدەپەڕی، زۆربەی لێکۆڵەران دەرکەوتنی یەکەم کۆمەڵەی جوولەکە لە عێراق بۆ کۆتایی سەدەی شەشەم، یان سەرەتای سەدەی حەوتەمی پ.ز دیاری دەکەن ئەم مێژووە هاوچەشنە لەگەڵ مێژووی کۆچی، سوببی ئاشووری بۆ باکووری عێراق لە دەورووبەری پ626.ز لە چوارچێوەی سیاسەتی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری لە پەرتەوازەکردنی ئەو دیلانەی، کە لەژێر دەستی ئەواندا بوون بۆ چەندین ناوچەی دوور لە ئاوایی تاکو توانایان نەبێ هاوسۆزیی و کرووپ کاری لەگەڵ کۆمەڵگایەکی دیکەدا بکەن بۆ ئەوەی نەتوانن جارێکی دیکە بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێی لادرابوون .

چاپخانەی ڕۆشنبیری

٣٠٠٠دینار